


# مەم و زینی خانی چییە؟

ئەو کـیـژە کـوردە پاکـانـە، ئەو لەوەندە لاوچاکـانەی خـوێندەوارن و دەزانن کـوردی وەخـوێنن و حـەز لە باری وێژە و بێژەی هەرە جسن و هـەرە بایەخدار و هێژا و هـەرە چێژە و بەرامـە دەکەن و دڵبژۆکی چیرۆکی ئەڤینداریشن... ئەگەر مـەم و زین ببینن، ئەو مـەم و زینەی سێ سـەدە بەر لـە ئێسـتـە خـانـی شـانی کوردی داوە و بـە بەند بۆ کـوردی دانـاوە، من لێم ڕوونە زۆر بە هـەڵپــە و بە پەلەپەل ڕووپـەلان هـەڵدەدەنەوە و بەلـەز و بەز کـاڵەشـومـێکی دەبڕن و خـوا خـوایانـە هـەرچی زووە چارەنووسی دوو دڵداری چارەڕەش دەبنـاوان بکەن. ئەوسا هەرگا لەسـەر تەرمی جـوان و نەرمی ئەو دوو نەمامە ناکامە چەمەر و گەرمـە شوێنیان گرت و لە ڤەشارتنیان بوونەوە... بەچاوی ئەسـرین تێزاو، بەدوو هەناسـەی سـاردەوە، بێژن بەخـوا فریە خۆش و دڵتـەزێن بوو، ڕەحمـەت بووی خانی بکەن و بە ئەستۆیی بیخەنەوە سـەر دەلاقەی جێ کتێبان، ئیتر چیتر لـەسەرڕا پێدا ناچنەوە، بەوردی لێی ورد نـابنەوە و شیوەکە وەرد نادەنەوە. تا ئەو هەموو کاکڵە خۆشانەش وەدۆزن کە بوونەتە ناوئاخن و چیرۆک گرتوونیە ناوەخۆ و بەهێوری و بە کاوەخۆ دەگش لە گشتی ڕامێنن، زانیارانە بەشـەی کەن و بە دانستە شـی کـەنەوە و بەنـد بە بەند و گـەو پێکـەوی تێک کـەنەوە و لێک دەنەوە... مـاڵم هـەقـە هەقـیـشـیـانە لە خـوێندنەوەی بە پەلەبن و بەپەلیـەکی بەس بکەن و قـووڵتـر نەڕۆن. بۆچی؟ چونکە:

ئەم سـەربهوردی ئەڤینە کـە زۆر خۆشـتـر و شـیـرینتر لە تۆلاگەزۆ و هەنگوینە، هەرکێ یەکەمـجار بیدینێ و لە وزەیدابێ وەیخـوێنێ، وەها نوقمی گۆمـەشینەی ئەوین دەبێ کە هۆش و گۆشی نامێنێ و تا بلەز قوتاری نەکات نەگوێ لە هیچ شتێ دەگرێ و نەبۆی دەکـرێ کەس بدوێنێ. کـوا دەیپـەڕژێ واز لەو سـەرگـوروشـتـەیە بێنێ و لەو گەنجینە پڕ لە گش جۆرە گەوهەرە وەکۆڵێ و بتۆژێتەوە. تا بزانێ شێخی خـانی لەم چیـرۆکـەی بەڕواڵەت ئەڤیننامـەدا چەی کـردووە؟ پایەی زانست و هونەری تا کـوێ

چووە، خانی چەند هونەرمەند بووە! هەر مەگین خوا بیزانێ... کورد گوتەنی ئەم کارە هەر بەدەم خۆشە... دەنا کێی هێندە زانا هەس لەم هەموو شیرین باریانە و لەو هەموو وردەکاریانەی لەم ناو خەزێنە خزاون سەری دەرچێ و بەتاقی تەنێ بتانێ ئەو چەند هەزار تان و پۆیە ئاوریشمینە و تاڵە زێڕین و زیوینە و ئەو گش گشتە کە نەخشینەی خاسەڕەنگە و هەمەڕەنگە، ئەو کرە جوان و ڕەنگینە واخودان ڕێز و بەسەنگە بناسێت و نەتاسێت و لە تاریف و پەسندان و ناساندنیان سەرپەنجە و دەمی گۆنەکا و قەڵەمی نسکۆیە نەبا و زوانی ڕەوان و پاراوی نەکەوێتە تورەتور و لاڵ و باڵی و خۆی تەواو لێی حاڵی ببێ و بشتوانێ حاڵیمان بکا! هەیهاتە کەسی وا هەبێ کە بەتەنیا ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرێ و گرێ نەکا.

بەڵێ مەم و زین بۆ ئەڤین و ئەڤینداری چوویتە سەر ترۆپکی داری هەرە بەرز و هەرە تەرزی وێژە و ئەدەبی جیهانی. ئەگەر نیزامی گەنجەوی بەچکە کوردی فارسی نووسی چەرخی شەشەمینی کۆچی بە پێنجینە مەنشورەکەی بەناوبانگە، ئەگەر ناوی فەرهادی کوردی کەلهوڕی زەرد و ماهی بێستوندڕی شیرینکار، کە لە سوێی شیرین مردووە. تا هەتا نەمر کردووە! ئەگەر لەیل و مەجروومەکەی ناوی دوو بەچکە عارەبی بە عارەبی و بێ مرادی دەناخێ ئاخێ ڕاکردوون و لە سایەی ئەو ئێستا و ئێستاش وە لەوەش پاش هەر زیندون و قەت نامرن و قەت نەمردوون، ئەگەر رۆمیۆ و ژۆلیێتی ئیتالیایی کە لە رای دڵداریدا مردوون، بەدەست و پەنجەی شکسپیر وەک مۆمیاییکراوی بەدانستە و بەناو، داو هەڵگیراون. نەڕزاون، نەپوواون، نەشسواون و لە رۆژگاری ژیانی سەرزەمینیاندا چۆن بوگن، ئێستا بەقەدر و بەرێزتر، جوانتر و بەهێز و پێزتر لەسەر دنیا خۆدەنوێنن و هەرگیز نوشوستی ناهێنن.

شکست نەبێ ئەگەر خانی کورد نەبوویا، یان بەکوردی مەم و زینی نەنووسیبا، تۆژەرەوانی لاوەکی وەکی زمانە زیندووەکان بیانزانیبا و بیانناسیبا، دەبوو ئەو سێ ئەڤیننامەی ناومان بردن وێڕای زۆر دڵدارینامەی بەرهەمی وێژەوانان و چیرۆکنووسانی بل ژوان ئێستا لە شاباشی بدرێن.

بەڵام رووی زەمانە ڕەش بێ، ئێمەی کوردی دەسکورتی نەگبەت و کلۆڵ، لە ئەگەر ئەگەر بەو لاوە چیمان هەیە! ئارێ ئەگەر ئەوەندە و ئەوەندە کەند و کۆسپ و لەند و لەمپەر و بەرگرە زۆرە کە خراونەتە سەر ڕێگەی ئازادیمان، نەبوونایە! ئەگەر

کوردیش وەکو گەلانی ئازادی خواپێداو دەوڵەتێکی خۆی ببایە و گەشەی بە زمان و کولتوور و دیرۆک و چیرۆک بدایە و ئەم زمانە زۆر شیرین و بەستەزمانەی لەو هەموو بەند و زیندانەی بەشــوورەی لە پۆڵا و ئاسن دەربچوایە! ئەگەر داگیرکەرەکانی کوردستانی نیشتمانمان کە نەویژدان شک دەبەن و نەبەزەیی. وەک دۆڵ پا سواری شانمان بوون! بەدڵبەردی و بەنامەردی خێروبێری وڵاتەکەمان دەخۆن و دەمانەکەنە دەستەچیلەی ئاگری شەڕی دوژمنیان و بەگژ یەکترماندا دەکەن و هەر بێژین لەل بە گولله دامان دەبێژن و پەتی دارمان دەمل دەکەن و بەرەو نەمانمان کل دەکەن، لە ئارادا نەبوونایە. کە زۆر کاری ئەو زۆردارە بێ بارانە، دژی هەمــوو ئاکاری چاک بەرانبەر بەگەلی کوردی، هەموو دەرەتان لێگیراو، گەیشتووەتە ئەو رادەیە زمانی زمان ئاسایی کە بەشێکە خودێ دایی لە بەشی زۆربەی کوردستان قەدەغەیە، کە ئەگەر هەر پێی باخێوین، زوانمان دەبڕن.

هێندێکی تر هێند بە دەستندە دەندەنێ: جووچکە کەوێکیش تێر ناکا. خۆ ئەگەر بە پاڕانەوە بێژین ئەی برای موسوڵمان! تۆ هیچ نەبێ لێمان گەڕێ با بەزمانی خۆ بنووسین، دەبێ سەروبن هەر پەسنی بەژن و باڵای خوار و خێچ و ملی چرچ و دەم و فلچی بۆگەنیو و کۆڵکەی پڕ لە ئەسپێ و کێچی ئەوان بدەین، هەرگیز باسی ژین و ژانی خۆمان نەکەین. ئەگەر کوردیش تەمی بەدبەختیی رەویبا و بەختی سڵی بۆ کەوی با و بووکی ئازادی و سەربەستی لە هەمبێزی خۆیدا دی با! ئێستا کار لە جێیەتر بوو. ئەگەر ئەو هەموو ئەگەرە و هەزاران ئەگەری تریش نەبوونایە بەتەگەرە لە پێش بەری ژینەوە و گەشەکردنمان. ئەدەبنووس و چیرۆکناسانی جیهانی شارستانی لەناو ئەو گش چیرۆکانەی لەناو دێرۆکاندا زیندوون، داستانی مەم و زینیان کە شێخی خانی نوساویە بە موجیزاتێک دەزانی، کە وێنەی لە دنیا نەبووە و ناشبێتەوە. مەم و زین هەر ئەوە نییە کە چیرۆکی دڵداری بێ و ببڕیتەوە. ڕانگەی چەندین زانستنامەی زۆر هێژایە، کە دەبوایە بەهیچ ئاوا لەو مەودایە بەر تەنگەدا نەگونجایە. کەچی تێشیدا گونجاوە، کە ئەمەش یەک لە موجیزاتی خانییە، جیا لە باسی دڵداریی زین و مەمان، کە لە پەسندی و ڕندیدا، چەپکەگوڵی هەرە هێژای سەر سەبەتەی ئەدەبیاتی جیهانە و ناوی گیرۆدە و گراوی تا هەتایە لە نەمان دوور خستووەتەوە. چەند چینامەی تری تێدا کە گش وەک ئەڤینامەکەی دڵڕفێن و جوان و

خۆشەویست و خۆشن. پاکیان لەمەڕ خوێنشیرینی و ڕەزاسووکی و بەنرخی و بایی گرانی وەکو کۆڕپەی هەرە جوانی خڕوخۆڵی نەرمونۆڵی پڕ بەکۆشن.

## چیرۆکنووس

ئێمەمانان ئەوەندەی بۆمان لواوە، بە پێی توانا زۆر چیرۆکمان لە زۆر بارە و بابەتاندا خوێندووەتەوە. لە هەر کامدا، چەند قارەمانێکی باش و مەرد و ڕەند و بە ئاکارمان، زۆر خۆشویستوون. زۆریش ڕکمان لە بێ فەڕانی شەڕانی و بە گەڕان و گێرەشێوێن، کار تێکوپێکدەر بووەتەوە. ئیتر تا ماوەیەکی زۆر کەفوکوڵی تووڕەی نەنیشتووەتەوە. بە ئافەرین یادی چاکانمان کردووە و ناوی خراپەکانیشمان بە نەفرینەوە بردووە. بەڵام خانی ئەو سەرتاپا چاک و پاکەی کە بە مەودای هەزاران ساڵ ڕێگەپێوانی برووسکە، لە ڕک و کینە بەدوورە، چاکەکانی ناو چیرۆکی زین و مەمی، وەکو ئاڵای کوردستانی نیشتمانی کە بە ئاواتی خواستووە لەسەر چیا سەرکەشەکانی زێدەکەی خۆی نیشانی دنیا بدا، لە بەرزان شەکاندووەتەوە و کردوویەتییە نموونە بۆ ئاکارچاکان. لەبارەی نالەبارانیش کارێک دەکا. کە هەتا سەر هەر بە خراپیان نەزانین و دەیان بەخشێ و هانەی خوێنەرانیش دەدا بیانبەخشن.

خوندکارێک کە بە دووزمانی شۆفارێک بێ لێکدانەوە هەڵدەچێ، بە سوێندان ڕەش دەبێتەوە کە خوشکی هەناسە سارد و بێ دەسەڵات و تاوانی، داوێنپاکی خاوێن لە گەردی گوناهان، بەهیچ مەردێ بەشوو نەدا و بە مەرەدێکی وای دەبا، لە خۆشییان بێ بەشی دەکا و نوقمی خوێنی گەشی دەکا! ئەو گوز و گوممەت هەڵچوونە و بە گژ سوێندخواردندا چوونە، دەبێتە ئامیانی مەرگی دوو دڵداری هەڵبژاردە و بێ وێنە لە چاکی و پاکی. ئەو خونکارە دیارە پیاوێکی خراپ و نالەبارە و پیاو ناچارە خۆشی نەوێ.

دەرکەوانی پیچ و بیژووی، نەیاری پیاوەتی و ئابڕووی، دەست و زمان پیس و نەگریس، کە ئێرەیی بەگژ بەختەوەرێ دەبا و هەر حەز لە بەدفەڕی دەکا، دەبێتە سەرە سۆدرەیەک ناهێڵێ دوو یاری گیانی بەیەک بگەن، هەردووکیان بەداخ و سۆوە دەخاتە ناخی گڵکۆوە. بەکێ دەکرێ لە سووچ و هەڵەی ببووری!

میر و بەکر، حەیزەبوونی تەرح مەیموون، فالگرەوەی درۆفرۆش. لە برانەوەی چیرۆکێدا گشتی کۆترە بەحەشتیلەن، هیچ کامیانت ناخۆش ناوێ. کە ئەم کارە هەر لە پاکی وەک خانی دەوەشێتەوە و کەسی تر نا.

## ئامۆژگاری رامیارانە

ڕەنگە زۆر کەس وا بیر بەرن شێخی خانیش وەک مەلا ئاساییەکانی کوردستان هەر لە زانستی عارەبی سەرکەوتووە و لە مزگەوتێکی کوردستان فێرکار و دەرسبێژ بووە. ئیتر سەری لە کاروباری رامیاری و گرێ و گۆلی دنیاداری هەر دەرنەچووە! دەسا با میر و سەرداری کوردەواری لەسەرخۆ و بە وردەکاری بە مەم و زیندا بچنەوە و لە کەرخی پەرێزی خانی ئەوەندە گول بچننەوە کە تەسەل و تێریان بکا و فێریان بکا دەبێ چبکەن تا بەختەوەر و لەسەر بن.

بێ گومانم، سێسەت سال پێش، بەهیچ ئاوا بیر و بڕوای (ماکاول) ی رۆژاوایی کە لە جیهانی ئەمرۆدا ڕێنوێنی دنیادارانە. ئەو زەمانە بەزمانەکانی ئەم ناوە کە خانی سەری لێ دەرچوون، هیچ کەس وەری نەگێڕاوە و بەرگوێی خانی نەکەوتووە.

کەچی خانی بەکر عەوانێکی دێنێ و (لەڕای مەبەست گشت نارەوایەک ڕەوایە)ی ماکاولی، بە زمانی ئەو دەدرکێنێ. ئەوەندەشی بە خوێنتالی نیشان دەدا، کە هەر کەسی ڕاست و دروست مەم و زین دەخوێنێتەوە، دانی خێرێ بەو بەشەڕ فێرەدا نانێ. هەزار تفان لە بەکر مەرگەوەڕ دەکا و نفرە لەو کەسانەش دەکا کە دوای ئەم بڕوایە کەوتوون.

خانی فێری میران دەکا چۆن کەسانێک هەلبژێرن بە وەزیر و بریکار و کوێخا و گزیر و کلیلدار، کە نەبنە مایەی تێکدانی داوودەزگای مەزنایەتی و نەبنە مێمل لە ژیانی کۆمەلایەتی و نەبنە خۆرە لە ئاپۆرەی ژێر دەستی میردا، لە رەشایی و لە بازێڕیان و وەزرێران و بۆ دارا و نەدار دلسۆز بن. ئێژێ میری ژیر میرێکە چل جار کاورایەک دەئەزمووێ تا کارێکی پێ دەسپێرێ. خۆ ئەگەر هەر بە هەوای خۆی، بە گەللایی و بەرهەلدایی، بەبۆنەی خزمایەتییەوە، بەناوی دۆستایەتییەوە، کاری هەلسووڕانی ولات بکاتە خەلات و بەرات، گوێ نەداتە خودان کرن و دلخۆشبوونی

هەژار و بێ دەسەڵاتان. لەوانەیە دۆستە نە ئەزمووراوەکە لەبنەوە دوژمنی پۆست بێ و هیچ دوور نییە خزمە تاقی نەکراوەکە هەل پەرست و نزم و پەست و بێ ئاکار و چاوچنۆک و دڵ بزۆک بێ، هەر دەسەڵاتێکیان هەبێ و دەسیان بڕوا بڕوا و پەیمان پاشگوێ خەن و دەم بنێنە بینەقاقای زۆر لێکراوانی بێتاوان، تەنیا هەر خۆیان لە بیر بێ و دەسیان لەهەر چشتێ گیر بێ، بیرفێنن و بیبەنە ناو کولێنی خۆ و خاوەن بەشان دەم لە پووش کەن. میری بەداوودەزگاوە تووشی تووشی و نەگبەتی کەن، بناغەی شکۆ و مەزناهی تێکوپێک دەن. لە پاش چووانیش پەشیمانی بەهرە نادا.

میر ئەشێ گەلێک وریا بێ، خۆی خاوەن تەگبیر و را بێ، کانی هۆش و بیرەوەری پتر لە گوێچکەی لاسەری لەسەر هەست و لە کاردا بێ. نابێ هێندە ساویلکە بێ شالوزان و زمانلووسانی گزیگار هێندەی لێ نزیک کەونەوە، دەستی دەمیان بگاتە پەناگوێی دڵی و بە پێ هەڵدان و فوو تێدان بیماسێنن، بەهەیت و هووت و شات و شووت بەلەسەی کەن، بەمشتەی درۆ و دەلەسە بیتاسێنن و بتوانن لە خشتەی ببەن. سەردار دەبێ بەدەستی خۆی زۆر ئازا بێ، هەرکەس لەوانەی چەکداری پەیرەوی وین، بەبێ گومان لایان وابێ هەرچەند ئازایی بنوێنن، هەر چەند دوژمن بترسێنن هیچ کامێکیان بە قامکە تووتەی ئەو نابن. جا وەک دەشێ لە جەنگەی مەیداناریدا و لە ڕووبەڕووی نەیاریدا، دانەچڵەکێ و دڵی وەک چیای بۆتان بێ و قەت نەلەرزێ و رانەتڵەکێ، گەرەکە لەناو دیوانیش، لە کۆڕی هاودەمانیشدا دێوی شەرم و لە ڕوودامان سواری نەبێ. بێ ئاوەز و بەدڵ ناحەز بواری نەبێ کاری تێ بکا و لە ڕێگەی راست لاری بکا و بێرەتێنێ.

میر دەبێ لەگەڵ نەترسی لە مەیدان و بەزاکونی لە دیواندا، دڵاواش بێ. دڵاوایی ئەستووندەکی هەرە خۆگر و پتەوە بۆ کۆنی فەرمانڕەوایی، هەرگیز هیچ خونکارێکی دەس رژد و چروک و چکوس، هەتا سەر سەر نەکەوتووە. بەخشندەییش دەبێ لە جێگەی خۆیدا بێ. نابێ لە حاند لۆتی و پۆتی و زمانلووس و بێناموس و بێ هونەر و کلکەسوتەکەری پیس و ئاکار گڵاودا دەسبڵاو بێ و پیاوی هێژا و پاک و چاک و بەجەوهەر کار لە دەس هاتوو، وەلانێ و هیچ لایان لێ نەکاتەوە و ئاوریان وێ نەداتەوە و دڵی گەرمیان سارد کاتەوە.

بە بیـــروباوەڕی خـــانی داهات و دراو لە دنیـــا تـەنیـــا هـەر بۆ دوو شت باشـن، خـودانکردنی هەژاران لـە ڕێی خـوادا و بەخـتکردن بۆ یارانی گـیـانی گـیـانی، ئەو کەسەی کۆی دەکاتەوە و دەقوژبنانی داخنێ و ئیتر سەری ناداتەوە، لە پاش مەرگی کەلەپوورگر پوڕی دەکەن. وەک تاژیەکە، کەرویشک بۆ خێوی دەگرێ و بۆ خۆی وا لە نێزان دەمرێ.

میر دەبێ خاوەن بەڵێن بێ. هەر بەڵێنێکی کە دەیدا وەک کەلێنی پۆڵا وابێ، سەری بچێ نابێ لە گفت و پەیمانی پاشگەز وەبێ. پایەبەرزی بەڵێنشکێن خۆی دەشکێنێ، ئیحتـوباری لە کن ژێردەسـتان نامێنێ، خەڵک بێزیان لە تەرح و بیچم و دیداری و قێزیان لە شێوە و ئاکاری دەبێتەوە.

میر دەبێ پشوودرێژ بێ، بە لێکدانی ئەستێ و بەردێک گەرم دانەیە و هەڵنەچێ. لە کاروباری گرینگدا پەلە نەکا و بە کەچکێک ئاو نەکەوێتە پێمەلەوە. بڕیاردان بەهەڵپە و پەلە خومچونی زۆر خوندکارانی بەستوون.

ســەرداری گــەل دەبێ رک و تـووڕەییی خـۆی زوو دەرنـەبڕێ، کـێـشـــە و گـێـرە و دەردەسـەری بە ئاشـکرا بۆ خـۆی نەکـرێ، بۆ بەگـژداچوونـی دوژمن بەدەردی کـوردە گـۆتەنی سـەد جـار بگرێ جـارێک ببـڕێ. تا نـەزانێ لەبەر بـەرەکـانیـیـەکـەیدا سـەر دەکەوێ، با لە گاشـەی وا نـەنەوێ کە ناتوانێ تووڕی بدا. با دەگەڵ دوژمـنی ملهوڕ، کـــە لێی روونـە پێـی نـاوەســــتێ، وچـانێک بدا راوەســـتێ، زۆر بـە نـەرم و نیـــانـی بجـووڵێـتـەوە، تا هـەلێکی باش دەرەخـسێ و کـێس و دەرفـەت وەدەس دێنێ، ئەوسـا حـەیفا خـۆ هەڵێنێ. کۆڵەی بکوتێ و کوڵ و کۆی خـۆی بەزۆروێژ و دەس درێژکەران بڕێژێ.

سـەروەر نـابێ دەرهەق لەخـۆی گـچکەتران و کـونی و کـینە لە زگ بێ، نابێ گرژ و مـرومـۆچ بێ . نابێ هـێندە تفـتـوتاڵ بێ تفی وەکـەن. ناشـبێ هێندە بە شـیـرینی و تووکنەرمی بـە هەرکەس و ناکەسێکی ناس و نەناس نیشـان بدا، کە بتوانن قووتی بدەن و رۆی هێڵن.

سەروەر دەبێ وەک برینگەری دڵسۆز بێ. لە دەستێکیدا نەشتەر بێ، کوانە پیسە، کیسـەی زنچکاو و زووخـاوان بەرلەوەی بتـەنێتـەوە و ئازای ئازاش بگرێتـەوە، بدرێ و

ببڕێ و فڕێ بدا. دەستی دیشی تژی لە تۆزی دەرمان و هەتوانی سەر برینان بێ، تا شوێنی زام زوو سارێژ و خۆش بێتەوە.

سەروەر ئەگەر بە ئارەزوو بێ لەسەر بێ و بەدوور لە دەرد و کەسەر بێ، گەرەکە هونەرپەروەر بێ. دەنا خۆی و کۆمەڵ و کۆمەڵگاکەشی زیانبار دەبن و گەوهەریان لێ خەسار دەبێ. نابێ وەک میرەکەی من بن. کە بۆ خۆڕی و هیچوپیچان داری بەرە و بۆ بە جەوهەر و هونەری وەکی منیش بێ سێبەرە. ئەگەر هەر بە سیلەی چاوێ لە ئێمەشی بنۆڕیبا، دنیا لە گەوهەر پڕ دەبوو.

خـــانی دەیان پەندی رندی جگە لە مـــانەی هێنامـــان لە توێی دڵدارینامـــەدا شاردووەتەوە. بەدەسەڵات بەدەستانی کوردستان بە دیاری دەدا و دیاری دەدا، کە لە زانستی رامیاریش بەقەد مەبەستی دڵداری هۆزان و شارەزا بووە.

## وەفا و ئەمەگ

ئەوی ئێـژن ناوی وەفـا وەک سیـمـورخ دەنگی هەیە و رەنگی نیـیـە و هـەر ناوی بێ ناوەڕۆکە. نابێ سەرکۆنەیان بکرێ، چونکە لێت ڕوون بێ ئەوانە نەیاندیوە و لەبەریان تێ نەپەڕیوە. بەڵام خـانی کـە سـەرتاپای لەش و گـیـانـی و رەگ بەڕەگی ئەمـەگ بۆ کوردستان بووە و لە نزیک وەفـای ناسیـوە. دەڵێ مەڵێن نەبووە و نابێ، جگە لە خۆی نموونێکی هەرە بەرزی وەفا و ئەمەگمان شان دەدا.

لاوێکە بەناوی تاژدین، ئەو لاوە چتۆ پیاوێکە! وەزیرە زاوای ئەمیرە بە خزمایەتیش دەگاتێ، لە بوێریدا و دوژمن بە ساغ نەبوێریدا، یەکەم پیاوی خاوەن ناوە. بۆ زێڕ و زەنبەری دنیاش چەندی بێژی سەد چەندانە و لە بۆتان و هەموو ئالی کوردستـاندا سـەرتۆپی دەوڵەمـەندانە. دۆسـتی لاوێکی سـاکـارە بەناوی مـەم. باوکی پیـاگێ دەفتـەرداره لە دیوان و خۆی پێشمـەرگێکی بەکارە و لە ریزی چەکدارانداپە. بێ لە عەگیدی و مێرخاسی چی وای نییە کە بە دابی ئەو زەمـانەی تیا ژیاوە خۆی لای خەڵک پێوە ڕانێ. بەنەجیـمـزادەی نـاژمـێرن، زێڕ و زیوی زۆری نیـیـە کـە کـەس چاولەدەسی بێت و لێی بترسێت. یان لالاییی لەبەر بکا.

مەمی هەژار دڵدارێکی پڕ جغارە و جەرگ و هەناو بریندارە، گراوییەکەی خوشکی

میره و له ناهومێدیدا گیره. له ساڵ و مانگ بەڕێکەوت ژوانێکی بۆ هەڵدەکەوێ و تەمی خەمانی دەڕەوێ. بەڵام لەوێش بەکاو ناگا، لەناکاو میر و یارانی بەسەردا دێن، چۆن دەرچن؟ بەرەو کوێ هەڵێن؟ هەموو لایان لێ تەناوە و هیچ دەرەتانێک نەماوە. نەعاسمان هەڵیان دەکێشێ، نەزەمین هەڵیان دەلووشێ، لەو ناوەدا قەتیس ماون. چاوەچاون کەی ئابڕوویان دەڕێژن و کەنگێ لاشەیان دەنێژن.

وەفا و ئەمەگی برادەر کەوتووەتە بەر ئەزموونەوە. تاژدین لە رای چارەسەری برادەری، بەرەو ماڵەخۆی پەل دەبێ، ماڵی گەورە بەهەموو ئەسپاباتەوە ئاگر دەدا و هاوار بۆ زبارە دەکا، فریای کەون. میر و مەزن و گرەگرەی دەدیوانێ، بەنی و نۆکەری پاشخانێ ورد و درشت و گشت لە گشت بەغار دەبەزنە هەوارێ، جێژوانی لاوان چۆڵ دەکەن. دوو دڵداری دڵ پەشێوی دووره هێڤی کە هەر وەکی دوو باڵداری هەرە جوانی بەخۆنەزانی بەستەزمان، دەداوی راوکەر ئالاون لە شەققەی باڵ دەدەن و ڕزگار دەبن. ماڵێک لە رای وەفا سوزیا و بوو بە پارووە خۆشەی ئاگر. کە ئێستاش لە کوردەواری نموونەی ماڵی زۆر قەوغا و بە دەوڵەتە، دەڵێن ماڵی فلانە پیاو، وەک ماڵی قەرەتاژدینە. وەفاش بووەتە ئاواڵ دوانەی تا هەتایە بۆ تاژدین و هەرگیز بە موو لێی لانادا و ناوی تاژدین دەگەڵ وەفادا هەر ماوە و هەر دەشمێنێ.

ڕەنگە زۆر کەس کە کەوتوونە ئەم زەمانە، بێژن وا گریمان ئەوسا وەفا بووبێ و هێشتان لە بەین نەچووبێ، ئەی ئێستا چی و کوانێ وەفا؟ نەمازە لەم چەرخی بیستە هەر پارە و خۆپەرستییە. ئەمەگ بوویتە ئەفسانەیەک هەر بە تیتوش دانەیەکی دەس ناکەوێ. نەدیمان و نەدەیبینین، بەڵێ ئەمانیش هەقیانە بەڵام ئەمن منی هەژار، مەلا مستەفا بارزانیم کە ناسیوە و وەفای ئەوم بۆ دۆست و یارانی دیوە، ئەگەر تاژدین بەر لە بارزانی نەژیابا، دەمگوت ئەو دەرسی ئەمەگ و وەفاداری لەلای بارزانی خوێندووە و هێندێک وەک بارزانی چووە.

## شێخی خانی و مرۆڤایەتی

بە درێژایی و بە پانایی مێژووی کەونارا و زۆر دێرینە، لەو دەمەوە ئەو جانەوەرە کە ناوی بنیادەمە، بەزوان و هزر و وریایی گەلێک زۆرە و بەئاکاری باش و پەسەند و

خوایی، یەکجار کەمە. هاتووەتە سەر ئەم زەمینە و بەخۆی دەڵێ "گیانداری بە ودم و پیرۆز"، ڕێک و جوان و لەبار و قۆز و هەرە دڵسۆزی خاوەندۆز، لە پەستا و بێ پسانەوە هەر خەریکی پێک هەڵپرژان و تێک چرژان و یەکتر کوشتن و خوێن رشتن و سەربرین و زگدرینە. هەمیشەش چینی ڕێبەران لە فێڵباز و جادووگەران کە دوولینگەیان خستووەتە سەر بۆق ملی دڵ ساویلکە و بێ خەبەران و بووگنە پێغەمبەری کەران، چاوگەپێکەری هەرا بوون، بەباوەشان و هامێزان دەستەواری چیلکە و چاڵ و پر و پووشکە و ئیزنگی وشکیان هێناوە، لە کوانووی برووبیانوودا گڕی شەڕیان خۆش کردووە. فلانە هۆز، فیسارە گەل لەسەر ئاینی ئێمە نین، دینیان پووچ و بێ فەساڵە، جا کەوایە کوشتنیان بۆمە ڕەوایە و سەرلەبەر سەر و سامان و ماڵ و حاڵیان وردە و یەخسیر و منداڵیان بۆ ئێمە کە لەسەر هەقین و لە حاند گومڕایان دڵرەقین، وەک گەزۆ و مازوو حەلاڵە. دوژمنانمان کە بەر نەفرینی خوا کەوتوون، پاش مردن و چاڵکردنیان کڵی دۆژەی خوایان بۆ نێڵ دراوە، تا هەتایە دەبرژێن و دەسووتێن و هەڵدەقرچێن، دڵبریان و چاوبەگریان هەر لەوێدا دەمێننەوە، بەهەشتیش خانی خۆمانە و کەسیش پارەی داکردنمان لێ ناستێنێ.

خۆ نەمازە لە رۆژ و رۆژگارانی کە خانی تیانا ژیاوە، هەرەمە و هەرەت و جەنگەی زەبروزەنگی تورکانی عوسمانی بووە، گەڕیان لە هەموو گەلانی بێکەس و بێدەس هالاوە و شەڕ و شۆڕیان ناوەتەوە و دنیایان بەزۆر خواردووە. بە تۆزکاڵیش لە نامەردی و لە دڵبەردی هەرگیز خۆیان نەبواردووە. مەلا و کاڵیش، شێخی ریش پانی نەزانی سەر بەرماڵیش، دەستیان بۆ لە لامل داون، سەد ئۆباڵیان بۆ کێشاون کە ئێوە جەنگ بۆ خوا دەکەن، داوای مافی رەوا دەکەن.

نەک هەر ئەوان لەو زەمانە، بگرە ئێستاش ئەو کاسە و ئاشە هەر هەیە و ئاورەکە نەکوژاوەتەوە. ڕیشەی کێشەی بەناوی دین، لە ڕووی زەمین وشک نەبووە و ئەو پەتایە هەر تا سەرێک نەدیو بووە و لە پڕ هەڵی داوەتەوە.

بەلام خواناسی لە زەبر، خانی کە سەرتاپای گیانی بەزەیی و دلۆڤانییە، قەت دڵی بەرایی نادا، لە ڕێ لادا و خوای بەرز وەک سوڵتانی تۆری تورک، یان پاشا و کوێخای ئێرانی، وا نزم کا کە هەر وازی لە تووتی ئاگر نێڵدان و لاشەی مرۆ

سووتاندن بێ. له پاڕانه‌وه‌دا ده‌ڵێ: خوای مه‌زن تۆ ده‌توانی گوناهبار و کافر و خۆت نه‌ناسانیش بخه‌یه به‌ر به‌زه‌ی خۆت و، سزایان لێ دوور خه‌یه‌وه. ده‌سا هه‌موو لا ببه‌خشه با هه‌ر شه‌یتان له به‌زه‌ییت ناهومێد بێ و که‌سی تر نا.

## خوا ناسین

ئه‌و که‌سانه‌ی به ئاره‌زوون بگه‌نه دیداری خوا و به‌دیتنی خه‌نی ببن. با ببنه په‌یڕه‌وی خانی و له عیرفانی ناوئاخنی مه‌م و زینی ورد ببنه‌وه، له یه‌ک به‌یه‌ک رسته‌کانی خورد بنه‌وه، هۆش و گۆشیان له‌سه‌ر هه‌ست بێ، تێ بکۆشن به‌روکۆشی گیان و دڵان له‌به‌ر و به‌رامه‌ی گوڵان که خانی په‌روه‌رده‌ی کردوون، ته‌ژی بکه‌ن تا پێ بگه‌ن و تێ بگه‌ن. خانی ده‌بێ له‌سه‌ر ده‌سته‌ی مشایخانی بژارده‌ی، وه‌ک بایه‌زیدی به‌ستامی، شێخ شه‌هابه‌دینی جامی، مه‌لای جزیری بۆتانی، شای نه‌خشبه‌ند، عه‌بدولقادری گه‌یلانی بێته هه‌ژمار.

دڵدارانی له‌م باره‌وه تازه‌کار و تازه‌کوره‌ن، ده‌بێ ئه‌وه‌نده بزانن هه‌روا بێ سه‌ر به‌ڕێ بوون و به‌ره‌و بینایی چاوان چوون و کامڕه‌وا بوون، کارێ سووک و هاسان نییه، به‌ڕدێنی پڕ و پان نییه، هیچ ڕیشێک پله‌کان نییه، بۆ سه‌رکه‌وتن به‌ره‌و خۆشی بێ برانه‌وه و تا هه‌تایی، ڕێبواری ئه‌زموون نه‌دیتوو، ڕێ نه‌دیون نه‌شاره‌زان به‌له‌ئر. خاون بێ پێڵاون بێ تۆشه‌و زاد و بژێون، ئه‌م سه‌فه‌ره‌ش زۆر خه‌ته‌ره، پڕ له به‌رگر و له‌مپه‌ره. ده‌شتن ئه‌گه‌ر حه‌وت و هه‌شتن، دێنه به‌ریان، چۆمن پڕ شه‌پۆل و گۆمن وه‌کی زه‌ریان کێون پڕ له جند و دێون ده‌چنه سه‌ریان. له‌و چه‌ند سارا پڕ له تۆزو غومارانه، خڕ جێ دڕنده و مارانه که له‌وه‌ڕگای ناله‌بار و به‌دکارانه، چۆن ده‌رده‌چن! هه‌ر له تینووه‌تی و له‌گه‌رمان پیشیان هه‌ڵتێ. له‌و گش چه‌م و رووبارانه‌ی خوڕێن و دووره بوارانه‌ی په‌یبڕ و چه‌وپیوارانه‌ی ناو بوهل و به‌ر بنارانه، په‌ڕینه‌وه. ته‌نانه‌ت مه‌له‌وانانی پاڵه‌وانیش ده‌خاته هه‌ناسه‌بڕکێ و کۆڵی هه‌ر له‌جێ ده‌خنکێ.

له‌م حه‌مکه هه‌وراز و لێژه، کووڕ و رژد و شاخ و داخ و زه‌ردوماه و که‌پک و ره‌وه‌ز و هه‌ڵه‌ت و پێچ و گه‌وه و خڕ و ده‌ره دڕ و چڕه به ئێشانه و ئه‌و ته‌پکه سینه‌کێشانه تا ده‌بوورن زۆری ده‌وێ. له‌و شوێنانه رازه‌وانی زۆر به‌جه‌رگیش تووشی دڵه‌ته‌پێ ده‌بن و

دەبێ هێدی و بەچنگەکرکێ سەرکەون. هەرجێ لەجێپێدا نەنێن و بەهەڵە هەنگاو وەگوازن، رەت دەبن و لەو بەندەنە هەزار بەهەزارە بەرزە و هەڵەمووتەوە دەترازن، سەرەونخوون هەڵدێران و هەپروون بە هەپروون بوون یەکە.

دەیسا چاوان ئەو بێچارە بێ چاوانە کە هەر دەستەکوتێ دەکەن، بەبێ چاوساغی شارەزا، دەیانکرێ راستەوخۆ بێ لەڕێ لادان بگەنە بستووی مرادان!

دەبێ رێونگی ئەم رێیە بێ رێبەری زۆر شارەزا، هەر سەربەخۆ مل لێ نەنێ و لە شوێنی خۆی هەڵ نەقەنێ. دەشێ بۆ پەندی پەسەندی پیری چازان گوێ رادێر بێ، هەر ئامۆژگارییەکی دەیکا، بیکاتە نوشتەی سەر دڵی و فێر بێ لەگەڵ دەرد و ئێش و ژان سازاندا خۆ رابێنێ.

شێخی خانی ئەو پیرە دەستگیرەیە، ئەو مامۆستا هەرە بە بیر و ژیرەیە، کە توانیویە لە عیرفاندا ببێتە خدری زیندەیەک، لە هانای ئەو کەسانە بێت کە بەنیازی گەیشتنە سەر رێبازی خواخوازین، بەدڵسۆزی و دلۆڤانی لەسەر دوندی کۆی بڵندی خۆش دیمەنی بەندەنی خوا دێنەوە، کە خۆی لەوێ بەوپەڕی ئارخەیانییەوە، دامەزراوە و ساوەتەوە، ئاوری وە خەڵکی سەرزەمین داوەتەوە، بەزەییی بەماک پاکانی گیرۆدەی خاکدا دێتەوە، بەشێنەیی دادەبەزێتە پێدەشتی و گەشتێ دەکا لە ساوای سێویی بێ پەسیو دەبێتە باوکی خەمخۆر و لە ژێر سایەی پیرۆزی پیرۆزەواشی پەنای دەدا. بەشیری پاک دەیمێژێنێ، زوانی بەچاکە رادێنێ، فێری داڕەدارەی دەکا، دەستی دەگرێ هەتا لە ڕاست ڕۆیشتن و لە ڕاستەقینە گەیشتن، زۆرباش فێر و خێرا دەبێ. لە یەکەم پلەی فێرگەدا دەرسی ئەڤینی پێ دەدا و سەرمەشقی عیشق و دڵداریی بۆ دادەدا. دەرسێکی وا کە وا ناکا منالی هێشتا شلک و کاڵ رەوەک و قوشقی و سڵ بکا. دەبێ جارێ گیان و دڵ بدا بە یاری سەرزەمینی، تا خوێنی سەردی گەرم بێ و رەقاییی دڵی نەرم بێ و خۆی ساز و ئامادە بکا بۆ قبووڵی ئەڤینداریی راستەقانی بەرامبەر بە داهێنەری جوان و جوانی. ئەو حانە زۆر بە ئارامی و بە سانایی لە دڵداری سەر دنیای پووچ و هەوایی رای دەگوێزێ و بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ دەیرەسێنێ بەو بەهەشتەی هەرگیز کەمی ناهێنێ. بەهەشتی شاد و شوکور بوون بە دیداری خوای بێ چوون.

ئەحمەدی خانی هاوبیری جزیرییە کە فەرموویە: ئەو خوایەی لەسەر چرۆ و پەلکی کەسکی داری زەیتوون، لە شیوی پیرۆز و تەسکی بەر بناری چیای تۆرێ وەک نورێ بەڕەنگی ئاور خۆ نیشانی مووسا بدا و بیدوێنێ. هەر ئەو لەسەر چینی سووریێ و لە رووپەڕی پەلکی گوڵی سەر ڕوومەتی کوڵمە سووریێک خۆی شانی دڵتەڕان دەدا و بەرەو خۆیان رادەکێشێ. لەلای خانیش وەک نیشانی ئەو سەر هێلانە لەگ لەگەی بەخەیاڵی خۆی مەلایە و بڕوای وایە روانین لە کردەی جوانی خوا ناڕەوایە، گایەکی مێزەر بەسەر، مۆز بە لمبۆزیەوە داوە، پەت پساوە و بەبێ ئامانج لە سارایە هەڵوادایە.

بل ژ خانی لە دەست کێ تێ، دوو ئەڤینداری ساکاری دیاری دنیا، بکاتە پیر و مریدی راست و بەرهەق. دەستیان بنێتە ناو دەستی خوای داهێنەری هەستی خۆشەویستی و زەماوەندیان بەرێتە باغاتی بەهەشت، لە هەشت نهۆم پەردوویان دەستنیشان بکا و، بیانگەیێنێ بە ژیانی پڕ خۆش و هات و هەیەتی لەبن نەهاتوو؟

## خانی و هونەرەجوانەکان

پازدە شازدە ساڵ لەمەوبەر، هێشتا ماڵم لە بەغدا بوو، رۆژێ پیاوێ بە سەر و سیمام میوان بوو، نەمدەناسی، ناوەکەی خۆشی پێ گوتم ئێستا لە بیرم چووەتەوە، گوتی من لە ئەمریکا بووم، لە زانکۆی هونەرانی جوان، خوێندکار و بۆ فێربوونی وێنەکێشان هەوڵم دەدا، لە ئەزموونی دوامین پلەی خوێندنمدا یەکەم دەرچووم، دەزانی بۆ؟ لەسایەی مەم و زینەوە. چەند تابلۆیەکی وام کێشا کە خانی ناوەڕۆکەکەی داڕشتبوون. بۆ نموونە:

جەژنی سەری ساڵ و کارنەڤاڵ لە سەدەی حەڤدەهەمیندا لە کوردستان، دابەزینی زین و ئەستێ بۆ سەر بەداو گیراوەکان، پیرێژن و فاڵگرەوە، خوازبێنی و زیافەت و بەزم لە ماڵی میر، بووک گوێزانەوە لە بۆتان، ژوانی زین و مەم لە باغی، زین و گازندە لە کن مۆم، گلی و گازن لە پەپوولە، پەیڤینی مەم دەگەڵ دجلە، بناشتی مەم دەگەڵ دڵی، دیمەنی شین بۆ مەم و زین.

هاوکاران و ئەزموونگەران لەو هەموو جوانی و مانایە، بەڕاستی سەریان سوڕمابوو، برای هەژار حەیف خۆت وێنەکێش نەبووی تا بزانی ئەحمەدی خانی

چەند هەزار گەوهەری وای لەناو مەم و زینەکەیدا گونجاندووە، کە هەریەکەی بۆ هونەرمەندی وێنەکێش هەموو گەنجی دنیا دەژی.

من هەموو ڕۆژ جارێکی لێ ورد دەبمەوە، هەر جارێ پیا دەچمەوە شتی تازە و بەنازترم دێنە بەرچاو، هاتووم لە پاداشتی وەیدا بەزاراوەی موکوریانیت وەرگێڕاوە و هێندەی بەهرە بەمن داوە، سەرت دەم و سوپاست کەم.

گوتم کاکە من تێ ناگەم تۆ دەڵێی چی؟ بەو خوایەی من و تۆی دروست کردووە، تا تۆ ئەم قسانەت نەکرد، منی هەژار وەکو کەڕ لە دەوری شایی هەر هەستیشم بەو شتانە نەکردووە. تۆ سوپاسی خانی بکە و بە نەزانیی من پێ بکەنە. دۆستێکی زۆر نزیکیشم کە ناوبردنی لێرەدا دەترسێم بۆ ئەو بڤە بێ، زۆر موتالای لە مێژووی موزیکدا هەیە، دەیگوت: هەر دەرفەتم هەبێ ئەو سازانە و ئامرازانە و هەوایانەی کە لە مەم و زیندا هاتوون، سەربەخۆ لە دەفتەرێکدا دەیاننووسم و بە پێی توانا شەرحیان دەکەم. تا هەموو دنیا بزانێ کورد هەر لە دێرزەمانەوە چەند عاشقە مۆسیقا بووە، بەتایبەتی ئەحمەدی خانیی هونەرمەند، چەندێ لێ شارەزا بووە، بە هومێدم ئەو ئاواتەش پێک هاتبێ.

## خانی و شیعر

ئەگەر داود پێغەمبەری جوولەکەکان، ئاسنی سارد لەناو لەپ و مشتی گەرمی نەرم بووە و زرێی لێ دروست کردووە! شکت نەبێ کەوا خانی وەزن و قافیەی لە بەرد و ئاسن رەقتری لەبەر دەستا وەک مۆم نەرم و نیان بووە. هەر مەبەستێ ئەو بە دڵیدا هاتووە و ویستوویە بیکاتە هەڵبەست، هەر دەمودەست بێ گرێوگۆڵ، بێ ورتەورت و بۆڵەبۆڵ پەڕیوەتە سەر زمانی. هەرگیز دەمی قەڵەمەکەی نەجڕاندووە و، هیچ وەرەقەی نەدڕاندووە و لاسەری هەڵنەکڕاندووە وەک ئێمەمانان دیومانە. ئەو ڕەوانی و پاراوەیە و مانای زۆر لە وشەی کەمدا، کە لە مەم و زیندا هەیە، سەرسوڕێن و موجیزەیە. توژەرەوە لەمەڕ وێژەی زمانپاراو و ڕەوانان لێکدەرەوەی ڕەوتی شیعری هەستیار و هۆنە و هەڵبەستەی گۆرانی، خۆوێژن و خۆشخوانان، ئەگەر کۆڕێکی بگرن و دانەدانەی شیعری خانی بە لێزانی و بە دانستە بخەنە ناو تای تەرازووی

هەڵسەنگانی وشەی هاونرخی گەوهەران، لەگەڵ شیعری شاعیرانی فارسی و عارەبی و هیتریش، لە هەندەران، لەبەر یەکتری راگرن و پێکیان بگرن، هەرە باشان هەڵبژێرن، خۆ لەهەق گوتن نەبوێرن، ناچار دەبن بسەلمێنن و ئیمان بێنن کە سەیدا ئەحمەدی خانی کەلەپوورگری خوایەتیی شیعر و هۆنەری ئەلیاسی نیزامی بووە و لەویش بەرەوژوورتر چووە.

بەڵام دیسان هەزار جاری داخ و کەسەر، وشەی ئەگەر رایەڵ و پۆی لێ شێواندووم، زمانی خانی کوردییە و بەفەرمایشتەکەی نالی خۆکردییە، هیچ لاوەکی و ئاوەکییەکیش لە جیهانی ژیاری و ناژیاریشدا کوردی و کوردی ژێرچەپۆکەی نەیارانی بە پوولە سووتاوێ ناوێ. ئاخ هەر تاوێ لە ئازادیدا بژیباین، ئەوسا دەیانزانی خانی چەند پایەبەرز و بڵندە و زمانە شیرینەکەشی چەند پڕ لە مایە و پەسندە. بەداخەوە جارێ لە بریا بەولاوە هیچن نییە و هەر خۆزیا و بریای بەتەنیاش کەس بە ئاوات ناگەیەنێ.

## ئەحمەدی خانی و ئازادی

خوشک و برای کورد زمانم، لە پێشەکیی وەرگێڕاوە سۆرانییەکە، خوالێخۆش بوو، نووسەری هەرە هێژای کورد لەم چەرخەدا، سەیدا حەسەنی قزڵجی لەمبارەوە دادی داوە، چی وای بۆ من نەهێشتووە بیکەمە دیاریی دەست و لێرەدا پێشکەشتان بکەم. خۆیشم بە پێی ئاوەزی لاواز و کزم شتێکم بە کرچوکاڵی لە ژێر ناوی بەرکوڵێکدا خستە پاڵی. ئیتر نایەوێ لێرەدا راوێژم کاوێژ کەمەوە.

تەنیا چەند وردە و پردەیەک، کە ئەو حاندە وەک پێویستە نەمزانیوە، یان با بێژین نەمتوانیوە بیانخەمە روو، دەمەوێ یادێکیان بکەم:

١- خانی لە خووی هەستی پەستی نامۆ و بێگانەپەرستی یانی خۆمانە گوتەنی جاشبوون و جاشەتیکردن، ئەمەندە بێزی هەستاوە تەنانەت، لاگیری لە شەیتان دەکا، روو لە خوا دەکا و دەڵێ: گوناهەکەی هەر ئەوە بوو بێگانەپەرستیی نەکرد و لە تۆپەرستن بەولاوەی بەلاوە نا؟ لە باتی خەڵاتکردنی، تۆ بەڵات بەسەر هێناوە، لە کارت سەرم دەرناچێ.

٢- سـاڵی ٩٥٦ له هەرەتی درویٚناندا، کـه هاوین بـوو، له بەغـداوه بەرەو سـوریه رام کرد و پەنام به مـاڵه حـاجـۆ برد. ئەو خـانەدانـه گـەورەیه، بەورد و درشـتـیـانەوە، ئەوەندەیان قـەدر گرتم له وزەی زمـان و قـەڵەم بەدەرە. بـەڵام تا سێیـەمین وەرزی پەنابەریم هیچ گـا وا رێ نـەکـەوتـبـوو به ناوی گـەشـت و گـەڕانێک دەگـەڵیـان بچمـه سـەیرانێک. رۆژی بیـست و دووی بانـەمـەڕی ٩٥٨، کـه ئەو رۆژه پێـشنووسی وەرگێڕانەکەی مەم و زینم تـەواو کرد و لێ بـوومـەوه. بەغـار بەرەو مـاڵ چوومـەوه، مزگێنیم به ماڵەوە دا. نانی نیوەڕۆژەم دەخوارد. لاوێک بەناوی محێدین که نەوەی حـاجـۆ ئاغـا بوو، لێم پەیدا بوو، گوتی: هـەژار تکایه لەگـەڵمـان وەرە، ئـەم دچینه عێن دیوەرێ، زۆر شوێنێکی دڵگوشایە، زۆرم بەلاوه سـەیر بوو، چۆنـه ئەمجـار بۆ یەکـەمجـار ئەو رووداوە روو دەدات؟ لەگـەڵیـان چووم، شـەومـان لەو گـونده کـرده رۆژ، سـۆزی گـوتیـان: با بشـچـینه شـاری جـزیرێ بۆتانـێ. ئاخـر رێمـان دەدەن؟ ڕەنگە! چـووین و جـەندرمـه رێی نەدا. وەنـاو کـەوین، له بەسـتـێنەکـەی مـاینەوه، شـارمـان وەک هێلکه لێ دیار بـوو، بەدووربینیش دەمـان روانی. پیـرەمـێـردێکی جزیری هاته لامان، لەپاش سـەلام و کەلامان گوتی:

له مـێـژووی ئەم شـارەدا، نەمـازه لـەو شـوێنەواره کـه خـانی ناوی هـەڵداون زۆر شارەزام. ملی نا له گێڕانەوەی به دەست و دەم. فلانه جێ جێی ژوانی مەم و زینانه. فیساره شوێن بەندینخانەی مەم بووه. هۆو هەش که ئێستا عەسکەری تورکی تێدان هەر هەمان بورجی بەڵەکه، بنکەی فەرمانڕەوایی میرانی کوردی بۆتان بووه.

هۆو مزگەوتەش گۆڕخانەی مـەم و زینانه، که گۆڕێکه و دوو تەرمی تێدا نێژراوه و زیارەتگایه. لەو ماوەدا که گوێم دابووه مـامه پیره، هات به دڵما، گیانی خانی ڕەنگه له وەرگێڕانەکەم رازی بووبێ. بۆیه بـانگێشتنی کردووم شاری جـزیر و بۆتان، لانکی دڵداریی مـەم و زین لـه نزیکەوه ببینم. له پڕ و نەکاو تەمێکی خـەمی له گیان خـۆش دەوری گـرتم، دڵم کـوڵی، دام دایه قـوڵپی گـریانێ، چ گـریانێک! وەک رەژنەی تاوی بارانێ، رام کـرده ناو گـۆڕسـتـانێک، نزیکەی چارەک سـەحـاتێک به کـوڵ گـریام، فرمێسکم رانەدەوەسـتـان، دەتگوت سـەرم به هـەنیسکانەوه هـەڵکەنا، تا کـوڵ و کـۆم دانەمـرکـا، هاورێکانم کـەسـیـان نەهات به لامـەوه، ئەو کـاته کـه ژیر بوومـەوه و

حەسامەوە، هاتن دڵداریان دامەوە، لە پێچی ماڵاواییدا سوپاسم لە گیانی خانی و دوعام بۆ مەم و زینان کرد.

٣- لە سەرەتاکانی مانگی خەرمانانی ساڵی ٩٨٦ کە خەریک بووم مەم و زینێ لەبەر چەند نوسخەی لێک جیا بنووسمەوە و بیخەمە سەر شێوەی ئێستای کوردی نووسین، شەو لە خەوما بە پێشمەرگەیەکم دەگوت نازانم چۆنی چاپ بکەم! لە خەوما کاکە بارزانی مستەفا تێی راخوڕیم فەرمووی "هەژار دەبچۆ تایپی بکە، تایپ"، ڕەنگە ئێستا برا کوردە ئیسلامە کمۆنیستەکان! بڵێن تف لە بیروبڕوای کۆنەپەرستانەت هەژار. قەیدێ ناکا، گەردنیشیان خۆش و ئازا بێ. بەڵام من لام وایە نابێ ڕاستەکەی ئەم ڕووداوانە لە ترسی لۆمە و لەقەمان نەگێڕمەوە.

## من و مەم و زینی خانی

لەپاش ئەوەی وەرگێڕانی مەم و زین بە موکریانی چاپ و بڵاو کرایەوە، برا و خوشکانی وێژەوان، کە سۆرانییان دەزانی، خوێندیانەوە و تا ڕادەیەک لەگەڵ بەرهەمەکەی خانی بوونە ئاشنا کارەکەمیان لا پەسەند بوو، شانازیم بەبەختم دەکرد کە توانیبووم بەپێی توانای هەژارانەم، ئەو دەستە خوێندەوارانەم بە مەم و زین ناساندووە.

بەڵام هێندێ کەس لەوانەی کرمانجییەکەیان نەدیبوو، یان دیبوویان بەڵام پاشی تێ نەگەیبوون، لە باتی پەسندی خانی، ئافەرینیان لە من دەکرد. تەنانەت هەندێ دڵسادەی واشم دەدین، لە رووی منا دەیانگوت: تۆ خانیت زیندوو کردەوە، خوا تۆبە! گرۆت لەخانی بردەوە! ئای لەو کوفرەی بەدەم ئەمانەدا دەهات! بڕوا بکەن لەو جۆرە گفتە تفتانە و لەو فەرمایشتە مفتانە، لە شەرمانە و لە عەیبەتان دەتوامەوە. خوایە، ئەو پەڵەی بوختانە، چۆنم لێخە دەبێتەوە؟! کێ هەیە بۆم بسڕێتەوە!

ویژدانی پڕ لە پەژارەم، لەگوێی دڵە هەژارەکەمدا سرتاندی: نینۆکی پەنجەی خۆت بێنە و ئاڵۆشی پشتت بشکێنە. دەنا کەس لە فریات نایە.

بڕیارم دا مەم و زینی شێخی خانی لەگەڵ موکریانییەکەدا لێک پێڵۆزکەم، تا ویژدانم بسێتەوە و خوێندەوارانیش بزانن هەژار لە دەریای مەزن لاوێچێکی لە سەرەوە هەڵێنجاوە و بۆ نموونە شانی داوە. زەریا هەروەکو خۆی ماوە، ئەو دەریایە

مـەلەوانی زۆر بینەکـێشی بەبین و پشـوودرێژی پێ دەوێ. تا بگاتە تەختی بنی و گەوهەرە وەشارتووەکانی کە لە ڕادە و ژمارە نایەن، وەدەس کەوێ. خۆ تا کوردیش ئازاد نەوێ، مـەلەوان و تۆژەرەوەی وا زانا، کـوا هەڵدەکـەوێ. خـۆی لـە قـەرەی خـانی بدا!

## چم کرد

چوار مەم و زینم پەیدا کرد بە چوار چاپان. بەرانبەر بەیەکم کردن، زۆر ورد لێیان ورد بوومەوە، لە ئاکامدا:

١- چاپی هەولێری مام گیوم هەر زوو قت کرد. ئەو مامۆستا خوا بەخشیوەش وەک زۆر کوردی ئەم زەمانە لای وابووە: هەر وشەیەک و رستەیەک خۆی نەیزانێ دیارە بەغەڵەت نووسراوە. ئیتر رامـان و دامانێک، وچانێک بیر لێکردنەوە دەکوولەکەی تەریشدا ناوێکی نییە. ئەوا ئەو فت.

٢- مەم و زینی چاپی مۆسکۆ، کە خاتوون سێدا رۆدینکۆ ساڵی ٩٦٢ بە راسپێریی ئاکادیمیای زانستی یەکـەتیی سۆڤـیـەت (نـەشرخانا ئەدەبیاتا رۆژهەلاتێ) بە شێوەخـەتی عارەبی، لەگەڵ وەرگـێڕاوی رووسی و پێشخـەبەرێک چاپ و بڵاوی کردەوە. بەداخەوە من پێشەکییەکەیم نەدیوە. بەڵام لە پەراوێزاندا، دەردەکەوێ کە لەبەر چەند دانە نووسراوەتەوە. دوو بەیت لەوێدا هەبوون کە لەوی هەمزەدا نەبوون.

٣- چاپی هەمزە، لە پێشەکەیدا نووسراوە: "مایسی ساڵی ٣٣٥ بەرانبەر بە ١٩١٩ی زاینی، لەدواییەکەشی نووسـراوە: ئەو کیـتـابا کو مـە ژێ ئیسـتینسـاخ کری ١١٦٥دا، عەزیز کورێ شێر مام زێدی نڤیسیبوو، خودی رەحما خوە لێ بکە".

بەو حیسێبە ئەو دانەیەی تەمەنی شێست ساڵ بچووکتر لە یەکەمین مەم و زینی بە دەسخەتی خانی بووە، دوو بەیتم لەوێشدا دیتن کە لە دانەکەی مۆسکۆ نەنووسراون. سـەیدا هەمـزە لـە سـاڵانی ١٩١٨ و ١٩١٩ سـەرپەرشـتـیـاری چاپخـانەی نەجـمی ئیستیقبال لە شاری ئەستەمبوڵ بووە، ساڵی ٩٥٦ لە قامیشلی دوا کۆچی کرد.

٤- مەم و زینی بە لاتینی کـە مـامـۆسـتـا حـەمـەدەمـین بۆز ئەرسەلان سـاڵی ٩٦٨ لە تورکیا بە وەرگەڕاوی تورکییەوە لە چاپی دا. فەرمووشیەتی ساڵی ٩٥٨ لە شاری

شام بە پیتی عارەبی لە چاپ دراوە، کە مخابن نەدیتوومە نەبیستوومە!

ئاشکرایە: لەبەر دانە نووسەرەوە و لەچاپدەرانی کتێبان بنیادەمن و بنیادەم بە هەڵە دەچێ، بەپێی توانا هەڵەکانم ڕاست کردنەوە، پەڵەکانم هەڵگرتنەوە، دەربارەی پیتی لاتینی بۆ ئەم کارە، من چەند تێبینییەکم هەیە.

أ- پیتەکانی (ث، ذ، ص، ض، ط، ظ، ع، غ) لە ئەزمانی عارەبیدا زۆر مشەنە. ئەگەر (ث، ص) بە (س) (ذ، ض) بە (ز)، (ط) بە (ت) (ض)بە (د یان ز) بنووسرێن، لە زۆر شوێن مانا تێک دەچێ، بۆ نموونە ئەگەر (ضەلال) کە مانای گومڕایی دەدا، دەلال یان زەلال بنووسین، مانا گۆڕا، دەلال نازە، زەلال ئاوی روون و خۆشە.

لەو دووهەزار و پێنجسەد و پەنجاو حەو بەیتانەدا کە لە مەم و زینەکەدان، شەش هەزار و پازدە وشەی بە عارەبی تێ خزاوە، نۆسەد و بیست و هەشت وێژەی لەوازەی فارسی تێدایە، بیست و یەک وشەی تورکیشی لێ میوانە.

زۆر لە وشە عارەبییەکان لە سۆنگەی لاتینییەکەوە لە شوێن خۆیان ترازاون، هەر فارسی و تورکی و کوردییەکانی وەک خۆی ماون، تەنیا (خ، و، غ) نەبێتن کە لێک هەڵناواردراون، بە بڕوای هەژارانەی من تا بە ئاوایەکی رۆشن چارەسەری ئەم پیتە تازییانە نەکەین، کە ڕێنووسی لاتیندا نین، نووسینەوەی کەلەپووری هەرە هێژای کەونارامان وەکو: دیوانی جزیری، مەم و زینی شێخی خانی و زۆری تریش بەلاتینی نارەوایە، ئەو خەزێنەی گەوهەرانە زایە دەبن. یان نیشانە بۆ ئەو پیتانە دابنرێن، یان وەک هەبوون، بنووسرێن و بە لاتینی راڤە بکرێن.

ب- سەیدا ئەمین بۆز ئەرسەلان، وەک لە زوانی عارەبیدا زۆر مەلا و زۆر شارەزایە، لە تورکیشدا گزوفتی بولبول دەدا؟ کەمتر ئاشنایەتی زۆری دەگەڵ زوانی فارسیدا هەیە. لە چەند شوێنێک ئەویش زۆر کەم، لە فارسییەکان گرێی بۆ رەها نەکراوە. هەقیچیەسی. هیچ کاری بە فارسی نەبووە، وەک مەمانان بە ملهوڕی و زۆرەملێ بەسەریدا نەسەپاوە.

پ- سەیدا دەڵێ "نازانین کەی مەم و زین دەستی پێ کراوە، ئێژن پەنج ساڵی بۆ خانی خایاندووە" خانی لە پێشەکییەکانیدا فەرمووگیەسی: (کیشایە جەفا ژ ب بویی عامی) یانی ساڵێک. وا ئەم مەتەڵەش زاندرا.

شێخی خانی خۆی ژینامەی خۆی بە کورتی بۆ درکاندووین. لە هەزار و شێست و یەک هاتووەتە دنیا، لە تەمەنی چاردە ساڵی بووەتە نووسەر، ساڵی هەزار و سەت و پێنج لە مەم و زینێ بووەتەوە.

ت- لەبارەی ساڵی وەفاتییەوە، ئەوی راستە هەر ئەو رستە جوان و هێژا و دروستەیە کە عەلائەددین سەجادی لە مەلایەکی بیستووە فەرموویەتی: لە پشت کتێبێکدا دیومە عیبارەتی (طار خانی الی ربه) بە ئەبجەد ساڵی وەفاتی خانییە، کە ڕاست دەبێتە هەزار و سەت و نۆزدە.

دڵە هەژارەکەم دەڵێ: ڕەنگە لەو چاردە ساڵەدا هیچ نەبێ چوار لیزگەی دیکەی زۆر نادری هۆندبێتەوە. تا لە بەرانبەر پێنجینەی نیزامیدا. خۆڕانێن و بۆڕیان بدەن. بە هومێدم ئەو خەونەی دڵم وەدی بێت، بەرهەمی دیش لە خانییەوە لە گۆشەی فەرامۆشییەوە بێنە دەرێ و چاوی دڵان پتر گەش و روون کەنەوە. بەتەمای خوا.

ج- ئەوەی سەیدایێ هێژا بۆز ئەرسەلان لە چەند جێیەکا نووسیویە: زەبانی ناو مەتنەکەمان کردە زمان، لەوە دەکا قورعان نووسەرەوێک بێژێ فووم و ثووم هەردووکیان سیرن من لەبات فووم لە قورعاندا ثووم نووسی. چونکە لەسەر زار سووکترە.

کێ دەتوانێ شەرحی کا و لە بن وشەیەکی وەک زەبان بڵێین زەبان لە فارسیدا زمانی کوردی خۆمانە. نابێ فەرمایشتی خانی بەهیچ جۆر دەسکاری بکرێ، چۆن بووگە هەروا بمێنێ، چونکە مەم و زینی خانی پرتووکی پیرۆزی کوردە. دەبێ هەروا دەستنەخوردە رابگیرێ.

بە پێی توانا وشە و رستە عارەبی و فارسییەکان و زاراوەی خواپەرستانەم وشە لە بەرانبەر وشە، بەبێ هیچ زۆر لێکدانەوە و درێژەدان، بەکوردی مانا کردەوە و لەگەڵ وەرگێڕاوەکەمدا بەو کوردانەی ئەڤینداری ئازادین پێشکەش دەکەم. من خۆم لەسەر ئەو باوەڕەم هەموو کوردێکی ڕۆشنبیر لەسەریەتی بۆ موفەڕک دانەیەکی لەلا هەبێ، لە بەرگی مەخمەری بگرێ، بیکاتە نوشتەی سەر دڵی، ماچی کا و هانای پێ بەرێ، دوعایەکی بەخێریش بکا بۆ هەژار.

## پەسنێ خودێ

سەرنامەیێ نامە نا مە: ئەڵڵاھ
بێ نامێ وی ناتەمامە وەڵڵاھ
ئەی مەطلەعێ حوسنێ عیشقبازی
مەحبوویێ حەقیقی و مەجازی
نامێ تەیە لەوحێ نامەیا عیشق
ئیسمێ تەیە نەقشێ خەمەیا عیشق
بێ نەقشێ تە نەقشێ خامە خامە
بێ نامێ تە نامە نەتەمامە
نامێ تەیە شاھ بەیتێ مەقصوود
فیهرستێ موکاتەباتێ مەحموود
مەضموونێ موراسەلاتێ لارەیب
مەشهودێ موکاشەفاتێ (بالغیب)
مەحبوویێ قولوویێ (من له القلب)
قەلبان تو دکی ب بال خۆڤە جەلب
مەعشوق تویی ب فەخر و نازی
عاشق تویی لیک بێ نیازی
موطلەق تو، موفید و موستەفادی
بێ شبهە موريد و هەم مورادی
نووری تو د حوسنێ روویێ دڵدار
ناری تو د قەلبێ عاشقێ زار
شەمعی نە ژ قسمێ نوور و ناری
شەمسی ژ عەیان تو پەردەداری
گەنجی تو د نێڤ طەلسمێ عالەم
کەنزی تو عەیان ژ ئیسمێ ئادەم
ئەڤ عالەم و ئادەمی یو مەشهوود
ئەڤ مومکین و ماسوای مەوجوود

فەرموودەی پێغەمبەرە: "هەرچی بەناوی خوا دەست پێ نەکرێ بێ پیتە" • مەطلەع: جێگەی رۆژهەلاتن • حوسن: جوانی، باشی • حەقیقی: راستەقانی • مەجازی:بە دەڵ • لەوح: تەتەڵە • خامە: قەڵەم • خام: کاڵ و کرچ • شاھ بەیت: چاکترین تاک بەیت لە قەصیدەدا • موکاتەبات: نووسراوان • مەحموود: پەسندراو • مەضموون: ناوەڕۆک • موراسەلات: نامە بۆ یەکدو ناردن • لارەیب: بێگومان • مەشهوود: دیاری • موکاشەفات بالغیب: دیاریکردنی نادیاران • قولووب: دڵان • مَن لَهُ القَلْبُ: کەسێ دڵی هەیە • جەلب: راکێش • موطلەق: ئازاد • موفید: بەهرەدار • موستەفاد: بەهرە گەیێن • مورید: داواکار • موراد: داواکراو • نار: ئاگر • عەیان: ئاشکرا، چاوان • عالەم: جگە لە خوا هەموو شت • کەنز: خەزینە... حەدیثی قودسییە "خەزینەیەک بووم نادیاری، چێ کریم ئافراندن تا بێمە ناسکرن" • ئیسم: ناو... ئایەتە: خوا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد • مومکین: هەرچی، لەوانەیە ببێ و نەبوونیشی جێ باوەرە، بەرانبەرە بە واجب کە هەر دەبێ ببێ

هەمـــیـــان ب تەیە مـــەدارە و دەبر
فـەیـیـاضـێ ریاضـێ خـەلق، وەلئـەمـر
ئەمــرێ تە بلەفظێ کـــون دو عـــالـەم
مـــەوجــود کــرن غـــەرەض چ؟ ئادەم؟
ئـادەم بـخـــــــوە یەک ژ هـەردووانـە
یەک حـــەرف ژ ئەمــرێ کــون فــەکــانە
ئەڤ حـەرف حـەقـیـقـەتن مـوحـەققـەق
هەم ئەمــرە بقــودرەتا تە هـەم خـــەلق
ئەشـبـا ح مـورەسـسـەمن ژ ناسـووت
ئەرواح مـــــوەســـــسـەمن ب لاهـووت
ئەڤ روح و جـەسـەد ب جـەبر و ئیکراه
تەزویـج بـویـن بـئـــــەمـــــرێ ئـەڵڵاه
ناســووت ئەگــەر چی رەنگ سـەفـالە
لاهـوت ژ پـورتـەوا جـــــــەمـــــــالـە
حـەرفـا کـو مـە گـۆتی نـەقـشـێ هوورە
لێ مـەقـصـەد و مـەعنێ یا وی کـوورە
ظاهـیـر تـە ئـەگـــەر نومـایـە صـوغـرا
باطـن ئەوە نـەقـشـێ خـــامـــە کـــوبرا
مـــەوجـــودە د وێ شـــەهـادەت و غـــەیب
مـەشـهـوودە دوێ سـەیادەت و عـەیب
ئینسـان ب خـوە هـەم ظـەلامـە هـەم نوور
ئادەم ژ تە هـەم قـــەریبـــە هـەم دوور
هـیـندی وەکـو جـیـنسێ عـــالـەمـــینە
ئەو تـابـیـــــعـی نـەوعێ ئادەمـــــینە

* مـــــەدار: کـــــار پێکهـــــاتن * دەبر: تەدبیـرکـردن، کـارێکخسـتن * فـەییـاض: رەژنەبەخش * ریاض: باخـچـان * خـەلق: چێکرن * ئەمـر: کـار * کـون (کُن): ببـە ... خـوا فـەرمـوویە: "ببـە و هـەمـوو شت بووە" ئایەتە. ئەگەر خـوا ویستی شتێک سـاز دا دەڵێ: ببـە و دەبێ * غـەرەض: مـەبەست * کــون فــەکــانە (کُن فکان): ببـــە و بوو * ئەشـبـاح: ئەوی دێنە بەرچاو، شـەخص * مــورەســـــەم: رەسم و خـــەت لێـدراو * ناسـووت: سـرشـتی مـرۆڤـانی، ئینسـانی * مـوەسسـەم: نیشـانەکراو* لاهـووت: سـەر بەکاری خـودایی * جـەسـەد: لـەش *جـەبر: زۆری * ئیـکراه: نابـەدڵـی* تـەزویـج: لێک جـووتکردن * سەفال: سواڵەت، مـاکی دیزە و گـۆزەی گـڵێن * پورتەو: تیـرێژ، تیـشک * جـەمال: جـوانی، سـپەهیـتی * هـوور: ورد * مەقـصـەد: مـەبەس * کـوور: قـووڵ * ظـاهیـر: رواڵـەت * نومـــا: نـواندن، خـــۆشــــاندان، دیاریدان * صـوغـرا: هـەرە بچووک * کوبرا: هـەرە گــــەورە، بۆ جــــێگـیــــربوون و روونکردنەوەی بابـەتێک کـەمـتـرەکـەی شـان دەدەن و زۆرترەکەی پێ ئاشکرا دەکەن. بۆ نموونـە دەڵێن: مـــرۆڤ جـــانـەوەرە، هـەر جـانـەوەرێکیش جـیـسـمـە و لاشـی هـەیە * شــــەهـادەت: دیـاردە * غــــەیب: نـەدیـار * مـەشـهـوود: دیارکراو، بەچاو * سـەیادەت: گـــەورەیـی * عــــەیب: شـــــوورەیی، زەدە، کــــەمــــایـەتی * ظـەلام: تاریکی * نـوور: رووناکی * قـەریب: نزیک * جـیـنس: نـەوع، تەور، جۆر

ئەڤ ڕەنگە فەلەک هەمی موعەظظەم
ئەڤ چەندە مەلەک هەمی موکەڕەم
ئەڤ کارگەها عەظیم و دەووار
ئەڤ بارگەها بەدیع و سەیار
ئەڤ چەندە زەمین د گەل عەناصیر
ئەڤ ڕەنگە عەرەض د گەل جەواهیر
ئەڤ چەندەهە نیعمەت و نەفاییس
ئەڤ ڕەنگەهە مەئکەل و مەلابیس
ئەڤ چەندەهە، موددەعا و مەطلووب
ئەڤ ڕەنگەهە موشتەها و مەحبووب
حەیوان و مەعادین و نەباتات
مەطلوبێ مەقاصید و مورادات
بیلجوملە ژ بۆ مەرا ل کارن
فیلجوملە ژ بۆمە بەر دبارن
حەققا کوتە خوەش نیظام و ڕەونەق
تەرتیب کرن ژ بۆ مە ئەلحەق
ئەم غافیل و عاطل و گونەهکار
مایینە د قەیدێ نەفسێ ئەممار
نینن مە د قەلبی فکر و ذکرەک
ناکن بزەبانێ حەمد و شوکرەک
"خانی" کو نەهن بقەلبێ ذاکیر
باری بدە وی زەبانێ شاکیر

* فەلەک: عاسمان* موعەظظەم: مەزن، گەورە، گەپ * مەلەک: فریشتە * هەمی: گش * موکەڕڕەم: بەڕێز و قەدر* کارگە: جێگەی کار، کارخانە * عەظیم: گەورە * دەووار: بە چەرخ و سوڕ * بارگە: بارەگا، داوودەزگا * بەدیع: چێکراو، زۆر جوان * سەیار: گەڕۆک * عەناصیر: کۆی عونصور، ماکی هەرە سادە و تاکی هەر شتێ کە زانایانی پێشوو بەخاک و باو ئاگر و ئاویان دەژمارد و دەیانکردنە ماکی ژیان * عەرەض: شتێ کە خۆی بۆخۆی نەهاتووە و بە شتێ ترەوە پاڵی داوە و پەیدابووە * جەواهیر: کۆی جەوهەر، هەرچی ماک و ڕەگەزە و سەربەخۆیە، دژی عەرض * نەفاییس: کۆی نەفیس: بەنرخ، بوهادار، هێژا * مەئکەل: مەئکولات، خواردەمەنی "ڕەنگە ئەو نیو بەیتە: "ئەڤ ڕەنگە مەئاکیل و مەلابیس" بووبێ، خواردەمەنییان و شیاوانی دەبەرکردن" * موددەعا: داواکراو * مەطلووب: خواستەمەنی * موشتەها: تشتێ کو دل دبێژە * مەحبووب: خۆشتەڤی * حەیوان: زیندی * مەعادین: کۆی مەعدەن، کان * نەباتات: کۆی نەبات، ڕووەک * بیلجوملە: بەگشتی، پوختەی وتار * بەردبار: باربەر، ڕاستەکەی بوردبارە: یانی پشوو لەسەرخۆ و خۆڕاگر * حەققا: ب ڕاستی * نظام: تەکوزی * ڕەونەق: جوانی، ڕێکوپێکی * ئەلحەق: دڕاستیدا، دوروستوەیە * غافیل: بێئاگا * عاطیل: بێکارە * قەید: تۆق و زنجیر * نەفس: نەوس * ئەممار: زۆر فەرماندەر، لە قورئاندا فەرموویە: نەفس زۆر فەرمانی خراپکاری دەدا * فکر: بیر * ذیکر: بیرەوەری * حەمد: پەسن * شوکر: سوپاس * نەهن: نین * باری: خودێ، دەیسا

## گازی و لاثایی

ئەی شـــوکــریٚ تــە جــەوهەرا زەبانیٚ
وەی ذیکریٚ تـە صـــەیقـــەلا جـــەنانیٚ
ئەی واحـــیـدیٚ بیٚ شــەریکی یەکــتــا
وەی واجــیـدیٚ بیٚ نـەظیــر و هـەمــتــا
ئـەی باقـــــیـــــیـیٚ بیٚ زەوالیٚ دایم
وەی هـادییـیٚ بیٚ فـــــەنایـیٚ قـــــایم
ئەی فـــالقیٚ ئـەرض و عـــاســـمـــانان
وەی خـــالقیٚ جـــوملە ئینس و جـــانان
مــولک و مــەلەک و فــەلەک ب جــارەک
بیلجــــوملـە تـە چیٚ کـــــرن، تەبارەک
"ســـبـــحـــانک کل مــــا خلقت"[1]
"احـــسـنت فکیـــفـــــمـــــا فلقت"
هــەرچی کـــو تــە چێکر ئــەی نکوکـــار
هــەر یەک د حـــەدیٚ خـــوەدا ســـزاوار
ئـەڤ نـەهـ صـــــەدەفیٚ د پڕ مـــــراری
ڕۆژیٚ د ســـفـــیـــد، شـــەڤـــا د طاری
حـــەفـتیٚ د مـیـثـــالیٚ دوڕیٚ غـــەلتـــان
هەر شـــەش جیـــهەت و چەهار ئـــەرکان
هـەرسیٚ وەلـەدێد پڕ مـــــەوالیـــــد
غـــەبرا و ســـەمـــا دگـــەل مـــەقـــالیـد

* صـەیقـەل: مـشـتـومـاڵ * جـەنان: دڵ * واحـیـد: یەک * یەکـتـا: تاقـانە * واجـیـد: خـودان، نـاوی خـودێیـە * نەظیـر: وەک * هەمـتـا: هـەڤبـەر* باقی: مـای * زەوال: لناڤچوون * دایم: هەرهە * هادی: ڕێبەر * فەنا: تونەبوون * قایم: هەروەستای * فالق: قەلشێن * خالق: چێکەر * جوملە: هەمی * ئینس: مرۆڤ * جان: ئەجیننە * روح: گیان * مولک: دارایی، زەمین * مەلەک: فرشتە * فـەلەک: ئاسـمـان * تەبارەک: پیـرۆزی بۆ تۆ خـوایە * نکو: چاک، باش، قـەنج * حـەد: ئەندازە، سنوور * سزاوار: شایان، شیاو * صەدەف: قالکی مرواریيان * نەهـ صەدەف: نۆ ئاسـمـان * مـراری: مـرواری، مـەبەست ستێـرن * سـفـید: سـپی * طاری: رەش، تاریک * دوڕ: مـرواری درشت * غـەلتـان: گلۆر * شەش جیهەت: شـەش ئالی: ژوور و ژێر و راست و چەپ و پشت و روو* چەهار ئەرکـان: خـاک و با، ئاگـر و ئاو * وەلەد: رۆڵە * مەوالید: بێچوان، رۆڵان، مەبەست لە مـەوالید جانەوەرە و رووەک، کرەک: جـەماد * غەبرا: ئاخ، سـەرزەمین * سەما: ئاسمان * مـەقـالیـد: کـۆی مـیـقلەد: کلیل، لێرەدا مەبەست خەزێنە زۆرەکانی ناوەندی عەرز و ئاسمانن

(١) "پاکی و چاکی لە تۆڕایە، لە هەرچیدا سازت داوە، زۆر کارت جوانە هەرچۆنێ لەتت کردووە."
خوا فـەرمـوویە: خـوا شـەوی شـەق کـرد و بـەرەبەیانی لێ دەرخسـت دیسـان فـەرمـوویە: "ئەدی نەتدیوە کـــە عـــەرد و عـــاســـمـــانان پێکەوە نووســـابوون، لەبـەریەکـــمـــان هـەڵوەشـــاندن."

نەوح و قەلەم و ثەوابت و عەرش
حەیوان و نەبات و مەعدەن و فەرش
ظاهیر کرن ئەڤ قەدەر صەنایع
پەیدا کرن ئەڤ قەدەر بەدایع
هەریەک ژ عەدەم کرن تە پەیدا
ئیبداع کرن تەبێ هەیوولا
فیلجوملە چ ئەووەل و چ ئاخر
ئەلقیصصە چ موئمن و چ کافر
هەریەک ژ تەرا وە بوونە مەظهەر
ئەو ڕەنگە دوان تو بوِیی موضمەر
بێ حوسنێ تە نینە وان وجوودەک
بێ نووریێ تە نینە وان نموودەک
حیکمەت ئەوە: باطنی یو ظاهیر
قودرەت ئەوە غایبی یو حاضیر
نینن تە تەجززی یو، تەمەککون
ئەمما وە دوان دکی تەوەططون
گویا هەمی جیسمەکن تو جانی
گویا هەمی شەهرەکن تو خانی
حوسنا تەیە زینەتا حەبیبان
رەشکا تەیە غیرەتا رەقیبان
مەیلا تەیە عاشقان دکێشت
دەردێ تەیە دل ژبەر دئێشت
شیرین تە کرە شەکر ل پەرویز
فەرهاد ژ رەشک ئەشکی خون ریز
لەیلا تەکرە بەلا ل قەیسی
رامین ب تە رام بو ل وەیسی

* لەوح و قەلەم: ئەو ڕووپەل و قەڵەمەیە کە خوا هەموو مەبەستی ئافراندنی پێ نووسیوە * ثەوابت: چەقیوە نەگەڕەکان کە چەند ئەستێرەیەکی بەناوبانگن * عەرش: تەختی بارەگای خوا * فەرش: رایەخ، مەبەست زەمینە * صەنایع: کۆی صنعەت: پیشە * بەدایع: کۆی بەدیع: داهاتووی زۆر جوان * عەدەم: نەبوو * ئیبداع: داهێنان * هەیولی: ماکی سەرەتایی * موئمین: خاوەن باوەڕ * کافر: بێ باوەڕ، ناسوپاس * مەظهەر: جێگەی ئاشکرابوون، دیارگە * موضمەر (مُضمر): تێدا ڤەشری * نمود: شکل و بیچم * حیکمەت: زانایی زۆر * باطن: نهێنی* قودرەت: توانایی * غایب: نەدیار * حاضر: لەبەرچاو، دیار * تەجەزی: پاژبوون * تەمەککون: جێگیربوون، نیشتەجێبوون * تەوەططون: جێگیربوون لە جێگەیەکی دیاریدا * شەهر: بازێر، شار * خانی: ماڵ، خانوو * رەشک: ئیرەیی، چاوچنۆکی * غیرەت: ئابڕووپارێزی * رەقیب: چاودێر * مەیل: ئارەزوو * عاشق: ئەڤیندار * شیرین: گراوییەکەی فەرهاد کە ژنی خوسرەو پەروێز بوو * ئەشک: هێستر، رۆندک، فرمێسک، ئەسر * خون: خوێن * ریز: رێژ * لەیلا: لەیلێ، گراوییەکەی قەیسی عامری کە بە مەجنوون ناسراوە * وەیس و رامین: ناوی کوڕ و کیژێکن لە چیرۆکی زۆر کەوندا هاتوون.

یوسف تە چرا نوما زلەیخا؟
وامیق تە کوسا گیهاندە عەذرا؟
شێخی وەکو پێنجە حەج بژاری
دین کر تەژ بۆ کەچا کوفاری
نیلوفەرێ ناز پەروەری کر
ئەو ژی تە ل میهر موشتەری کر
بالایێ بلند تە دایە سەروان
پابەندێ بەلا تەدا تەزەروان
صۆرگول تەکرن ژخار پەیدا
بولبول تە کرن هەزارێ شەیدا
خوەش رەنگی تەدا گیایێ صۆرگول
خوەش دەنگی تەدا نەوایێ بولبول
روناهی تەدا سەری شەمالان
پەروانە کرن بشەوقێ تالان
مەحبووب تە چێ کرن د دلکەش
مەجذووب تە پێ کرن موشەووەش
ئەڤ عیشق و مەحەببەتا د دلدا
ئەڤ زلف و سەلاسلێد د ملدا
ئایا نەتەچێ کرن موقابیل؟
هەر یەک تە بهەڤ کرن موعادیل؟

* یوسف: پێغەمبەرێکی جوولەکان و جوان بوو * زلەیخا: ناوی ژنێکی کاربەدەستێکی میصر کە یوسفی کڕیبوو تەماحیشی تێ کردبوو، ئەم باسە لە قورعاندا هەیە * وامق و عەذرا: یا عەزرا، ئەڤیننامەیەکی زەمانی بەر لە ئیسلامە، عەزرا ناوی کیژەکەیە، لە سەدەی یازدەیەمی کۆچیدا کراوەتە شیعری فارسی * شێخی صنعان: داستانێکی شیعرە لە کتێبی مەنطیقولطەیری شێخی عەططاردا، کە شێخ عاشقی کچە کافرێک بووە، بۆ خاتری ئەو قورعانی سووتاندووە، شەرابی خواردووەتەوە، بوویتە بەرازەوان * نیلوفەڕ: لوولووپەڕ: گوڵێکە لە ئاودا دەڕوێ، ڕۆژ پەرستە، هەر تاو هەڵات سەر لە ئاو دەردێنێ و تاو ئاوابوو سەردەباتەوە بن ئاو * میهر: خۆر، خۆشەویستی * موشتەری: کڕیار، ناوی ئەستێرەیەکی گەڕۆکە لە عاسمان، چیرۆکێکی ئەڤینداری هەیە بەناوی میهر و موشتەری، کە کیژەکە ناوی میهر، مێرێ بووە * بالآ: بەژن * سەرو: داری سەوڵ * پابەند: بەندەوار * تەزەرو: دیکلێ لێڕ و جەنگەلی * خار: ستری، چقڵ، دڕک، دڕوو * هەزار: دە جار صەد * هەزار: جۆرێ بولبولی ڕەنگینە * شەیدا: دینێ ئەڤینێ * نەوا: هەوای گۆرانی * رووناهی: رۆشناکی، رووناکی * شەمال: مۆمی ئایسان * پەروانە: پەپوولە، فڕفڕۆک * شەوق: ئارەزوو، تیشک * دلکەش: دڵکێش، دلبەر * مەجذووب: حاڵ لێ هاتوو، راکێشراو * موشەوەش: تەڤ ل هەڤ، سەر لێشێواو * زلف: کەزی * سەلاسیل: کۆی سیلسیلە: زنجیر * مل: گەردن، شان * موقابیل: بەرانبەر، هەڤبەر * موعادیل: رێکی یەکتر، وەکەهەو

ئایینە تەچێ کــــرن مـــوکـــەرڕەر
حـوسنا خـوە دوان تەکـر مـوصـەووەر
ئایینە لپــێــشـێ تووتیــان: گــرت
داڤـەک تـە ل پێشێ کـوڤـیـان گـرت
ئـایـیـنـە ژوان وەیە کــــو ئـاڤـــــە
ئەو عـــەکــســە ژوان وەیە کــو طاڤــە
نـەقـــــــشـێ تـە دبیـن ئـەو د ئـاڤـێ
نـاکـن حــــــەذەرێ ژ ئـاڤ و داڤـێ
لـەب تـەشـنـە طـەلـەب دکـن زەلالـێ
وێ دانـە و دامـێ، زلـف و خـــــالـێ
مـەقـصـوود کـوبو ژپێشـڤـە حـاضـر
دێ قـــەصـد بکن جـــەمـیــعێ ناظر
تـووتی نـە ب خـــوە شـــەکـــەر درێژن
هـەرچـی دبـهـــــێن ئەوی دبێــــژن
وێ مـەقـصـەدێ مـوخـتـەصـەر دبین
پـابـەنـد دبن گـــــەلەک دمـــــیـن
مـــەقـــصـــوود و مـــورادێ دڵ توشـــایی
ئـەمما تـو "تـضـل مـن تشـــــاء"ێ
هـــەرچی تـە دڤـێ ببێ ضــــــەلالێ
پـابـەنـد دکـی ب زلـف و خـــــــالـێ
هەرچی کـو تو بینی سـەرهـیـدایەت
ڤـێ را بـگـری بـکـی عـــــیـنـایـەت
حـاضـر وی دبـی مـەقـامی مـەعلووم
گـەر خـادیمە وی دگـێـری مـەخـدووم

---

* ئاینە: نەینک، نەینۆک، عەینک، قۆدی * موکەرڕەر: دووبارە * موصەووەر: شکل کشایی * تووتی: طوطی، مەلێکە دەتوانێ لاسایی خەڵک بکاتەوە و بپەیڤێ * داڤ: داوی راو * کـوڤی: حـەیوانە کـێـوی * حەذەر: پارێز، خۆپاراستن * لەب: لێڤ * تەشنە: تی، توونی، تینوو * زەلال: پاک و خـــۆش * دام: داو * دانە: دان، دەنک * ژپێشـڤـە: لە پێشـەوە، هەر لە پێشـدا * جـەمـیع: گش * ناظر: تەمـاشـاکـەر، چاونۆڕی هەل * دبهـێن: دەبیـسن * مەقصەد: مەبەست، جێگەی بۆ چوونێ * مـوخـتـەصـەر: بەپوختی، بەکـورتی * پابەند: تێگیراو، قاچ بەستراو، بەندەوار * تضل من تشاء: گـومرادکی کـەسێ تە بخوازێ گومراکی، ئایەتێکی قورعانە لە زمان موسا پێغەمبەرەوە دبێ: خودێ بۆ تە دخـوازێ ئەم بدی هیلاکێ چمـا کـەم عەقلێت مەکارن کرنە... تمام فیتنا تەیە، تە بە فـیـتنا خـوە لارێ دکی کـەسێ تە بخـوازێ، رێشـاندەدەیە کـەسێ تە بڤی، تەی مەزن و دۆستی مە، ژ مە ببـهورە و رەحمێ بمە بکە، تە چێترین بهوردۆخی * ضەلال: گومرایی، ئاڤارتیی، لارێ بوون * هیـــدایەت: شــــارەزایی، رێکزانی * عینایەت: چاڤدێریکرن، قەنجی د گل کرن * حاظر: دەس لەجێ * مەقام: جێگە * مەعلووم: دیاریکراو * خادیم: خزمەتکار، بەنی * مەخدووم: کەسی خزمەتا وی دکن

بێ سەجدە تە ئەی جەنابی مەعبوود
ئادەم کرە قیبلەگاه و مەسجوود
عیسا تەکوسان گەهاندە، ئەوجان؟
ئایا ب چتە حەباندی ئەوجان؟
دەرسا کو بخەف تە گۆتە ئیدریس
ئەلبەتتە د چو مەقامێ تەقدیس
ئیبلیسێ فەقیرێ بێ جینایەت
هیندی تە هەبوو دگەل عینایەت
هەر رۆژێ دکر هەزار طاعەت
لەورا کو تە دا وی ئیستیطاعات
وی سەجدە نەکر لغەیرێ مەعبوود
گێرا تە ژ بەردەرێ خوە مەردوود
یەک سەجدە نەکر لپێشێ ئەغیار
قەهرا تە کرە موخەللەدوننار
ئەلقیصصە ژ حیکمەتا تە ئاگاه
فەردەک مە نەدی تەبارەکەڵڵاه
عیرفان طەلەبێ د صاحیب ئیدراک
دەرحەقێ تە گۆتی "ماعرفناک"
خانی بنەزانییا خوە دەرحەق
گومراه ببت نەدوورە ئەلحەق
ئیللا کو مەگەر موعین خودا بت
یا راهبەرێ وی موصطەفا بت
یارەب تو بحەقی موصطەفا کی
خانی ب خوەرا تو ئاشناکی

* سەجدە: سەر لعەردێ دانان بۆ کڕنووش * جەناب: وشەی ڕێز لێنان * مەعبوود: ئەوی دێتە پەرستن * قیبلەگاه: رووگە * مەسجوود: ئەوێ سەجدە بۆ دبن * کوسان: کوسا، چلۆن، چاوا * ئەوج: بلند یان پڕ بلند * حەباندن: خۆشویستن * جان: رح * خەف: خەفی، نهێنی * ئیدریس: پێغەمبەرێکە * ئەلبەتە: بێگومان * تەقدیس: مبارەکی و پیرۆزی * ئیبلیس: شەیتان * فەقیر: هەژار * جینایەت: خەتا و گوناه * هندی: تا ئەو دەمەی * طاعەت: پەرستن، گوێ دان بە فەرمان * ئیستیطاعەت: توانایی * دەر: دەرگا* مەردوود: دەرکراو، بەردایی * ئەغیار: کۆی غەیر: بیانی، نامۆ * قەهر: تووڕەیی * موخەللەد: بۆ هەمیشە * موخەللەدوننار: هەمیشە لە ئاگردابێ * ئەلقیصصە: پوختەی وتار * ئاگاه: هایدار * فەرد: تاک * تەبارەکەڵڵاه: تاک و بێ کەمایەسییە خودێ * عیرفان: خواناسین * عیرفان طەلەب: داواکاری ناسینی خوا * صاحیب ئیدراک: دارای تێگەیشتن * دەرحەق: دەربارە * "ماعرفناک": نەمان ناسیت، فەرموودەی پێغەمبەرە: "ئەی خوای ئێمە وەک پێویست بوو بتناسین نەماننناسیوی" * دەرحەق: لەبارەی خواوە * ئەلحەق: بەڕاستی * ئیللا: مەگین * موعین: ئاریکار * موصطەفا: بژاردە، "ناوی پێغەمبەری خۆمانە"

دانایێ موعەممەرێ کوهەن سال
ئەڤرەنگەهە گۆ ژ بۆمە ئەحوال
کو عادەتێ پێشیێ زەمانان
ئەڤ بوو ل هەمی جیهـ و مەکانان
وەقتێ وەکو شەهسەوارێ خاوەر
تەحویل دکر د ماهێ ئازەر
یەعنی کو دهاتە برجێ سەرسال
قەط کەس نەدما د مەسکەن و مال
بیلجوملە دچوونە دەر ژ مالان
حەتتا دگەهیشتە پیر و کالان
رۆژا کو دبوویە عیدێ نەورۆز
تەعظیم ژ بۆ دەما دلئەفرۆز
صەحرا و چەمەن دکرنە مەسکەن
بەیدا و دەمەن دکرنە گولشەن
خاصما عەزەب و کەچێ د باکیر
ئەلقیصصە جەواهیرێ د نادیر
تێکدا د موزەییەن و مولەببەس
ڤێکرا ل تەفەڕوجێ مورەخخەص
لاکین نە ب توهمەت و ب موننەت
بەلکی ب طەریقێ شەرع و سوننەت
لەورا کو ئەوان غەرەض ژ گەشتێ
مەقصوود ژ چونیا ب دەشتێ
ئەوبو کو چ طالب و چ مەطلووب
یەعنی دوو طەرەف موحیبب و مەحبووب
ئەڤ هەردو جەلەب کوهەڤ ببینن
کوفوێ د خوە ئەوژ بۆ خوە بینن

* موعەممەر: تەمەندار * کوهەن: کەون * شەهسەوار: شاسوار * خاوەر: خۆرهەڵات * برج: مزڵگەی خۆر * مەسکەن: خانی * کال: باپیر * دلئەفروز: دڵخۆشکەر * بەیدا: چۆڵ، صەحرا * دەمەن: بنار * گولشەن: گوڵزار * عەزەب: لاوی تازە پێگەیشتووی بێ ژن * باکر: شوونەکردوو * موززەییەن: رازاوە، خەملی * مولەببەس: بەجلک و بەرگ * تەفەڕوج: سەیران * مورەخخەص: دەستوور پێدراو * توهمەت: بوختان * موننەت: زۆری * شەرع: رێگەی ئاین * سوننەت: پەیڕەوی لە ئاکار و دابی خەڵک * طالب: خوازەر * مەطلووب: خوازراو * جەلەب: کۆمەڵ * هەڤ: یەکتر * کوفو: هاوشان، هاوکوف

## سەیر و گەشت ل دەشتێ

دەورا فــەلەکی ژ بەخــتێ فــەیروز
دیســان کــو نومــا ژ نوڤــە نەوروز
مــەبنی ل وێ عــادەتێ مــوبارەک
شـەهری یو سـوپاهی یان ب جـارەک
بازێر و کــەلات و خــانی بەردان
تەشــبیــە ب نەژدیــان و جــەردان
صەف صەف د مەشینە کوهو دەشتان
رەف رەف دخوشینە سەیر و گەشتان
ئەصنافێ ئومـەم صـیـغـار و کوببار
قـەطعـا ڤـەنەمـا د شـەهرێ دەییـار
هـندەک ب پەیایی چوونە باغــان
هـندەک ب ســواری چوونە راغــان
هـندەک ب تەبایی و ب کــەثرەت
هـندەک ب هەڤـالی و ب وەحـــدەت
رابوونە ڤــە خــانم و خــەواتین
وان ژی، تژی گــول کــرن بەسـاتین
حوران کرە مەسکەنێ خوە جەننەت
بێ پەردە و، بێ مــەلال و مــیـننەت

* دەور: سوور، چەرخ * فەیروز: پیرۆز * مەبنی: بەگوێرەی، لەسەر شوێنەواری * شــەهری: بازێری * ســوپاهی: چەکدار، لەشکری * کەلات: قەڵا، دز * نەژدی: تاڵانکەر، جــەردە، گــوران * صەف: ریز * دمەشین: دەچوون * کوه: کێو * رەف رەف: پۆل پۆل * گــەشت: گــەڕان * صنف: نەوع * صــیــغــار: پچووکان * کوببار: مەزنان * قەطعا: بەهیچ جۆر * دەییار: مرۆ * پەیا: پیادە * راغ: مێرگ و بناری سەوز * تەبایی: هەواڵەتی و تێکڕایی * کــەثرەت: زێدە، فرەیی * وەحدەت: تەنیایی * خــەواتین: خاتوونان * بەساتین: باغان * مــەلال: وەڕەزی * میننەت: منە

دوشـــيـــزە و دوخـــتـــەر و روالان
پاكـــيـــزەعـــوذار و زلف و خـــالان
ئەتراب و كـــەواعـــيـــبێ د عـــەزرا
مـــوردان و مـــوراهـيـــقێ د زيبـــا
ئەصحابێ قوماشێ لوطفێ روخسار
ئەربابێ مـــەتاعێ حـــوسنێ ديدار
وان لێك دكرن مـەتاعێ يەك عـەرض
تەخـــمين دكـــرن ب گـــول وەلعـــەرض
ســـەوداگـــەرێ عـيـشق بوون د بازار
هـەم بايعێ حـــوسن و هـەم خـــريدار
ســـــەرســـــالي و باكـــيـــــر و روالان
صـــەدسـالي و جـوان و پيـر و كـالان
سـەرسال ل رەسم و راهێ مـەعـهـوود
گـيرا ل جـيـه و مـەقـامێ مـەحـمـوود

* دوخـتـەر: دۆت، كـەچ، قـيـز * روال: تازەلاو * پاكيزە: پاقژ، خاوێن * عوذار: لاجـــانگ * ئەتراب: هـاوتەمـــەنان * كەواعيب: مەمك قيتان * عەزرا: كچى شـوونەكـردوو * موردان: كـوڕانـى بێ مـوو، دەمـــڕووت * مـوراهيق: لاوى ئاو تێگەڕاو، كـە تازە شەيتانى پێ دەكەنێ * زيبـا: خۆشـيـك، جوان * ئەصحـاب: خـاوەنان * لوطف: نەرمـى * روخسـار: دێم * ئەرباب: خودانان * مەتاع: كالآ * عـــەرض: رانان * تەخــمين: بەراورد * طول: درێژى * عـەرض: پانايى * بايع: فرۆتۆخ * خريدار: كڕيار * سەرسالى: مەبەست كەم تەمەن و ساوا * باكير و روال: كـــچـى شـــوونەدارو تازەلاوان * مەعهوود: وەك بەرێ، عادەتى * مەقامى مـــەحـــمـــوود: جـــێگەى پەسندراوى پەسەندكراو

## جلكێد كەچكان ل لاوان

قـــينديلىّ مـــونيـــرىّ دەيرىّ ئـەزرەق
مـيشكاتىّ حـەمـەل كـو كر مـورەووەق
سـەرسال كـو بوو ژ نووڤـە مـەعـمـوور
مــيـر دايـە كــورِىّ د تـازە دەسـتــوور
دەسـتـــوور كــو بـوو ژ بۆ وشـــاقـــان
رابوون هـەمى شـبـهـەتىّ عـوشـاقـان
تێك چونە ب مــەعـرەضـا مــەزادىّ
دلدادەيىّ مـــەقــصــــەد و مـــورادىّ
ئيللا كـــو تەنىّ مـــەمـــۆ و تاجـــدين
وان دانە خـــوە دوخـــتــەرانە تەزيـين
يەعنى د دەمــا كـــو بوويە تـەحـويـل
ئەو هـەردوو برا د جــــامــــە تـەبديل
ئـيـســـتــەبرەق و ســـوندسـن د بەردا
چەند مـيـعـجـەر و مەقـرەمـە بسـەردا
كـــاكـــۆل كـــربـوونە طورە هەر ســـوو
پەرچەم كــربوونە زلف و گــيــســوو
وان لەو كـــربـوو ليـــبـاس تـەصـــريف
دا قــــەط نـەبتن ل وان چو تەكليف
پوشـــيــدە ليـــبـــاسىّ دلبـــەرانى
ســـەيران دكـــرن ب ســـەر گـــرانى

* قينديل: چرا * مونير: رووناكيدەر * دەير: ئەنواى رەبەنان * ئەزرەق: شين، كەوە * ميشكات: دەلاقە، تاقە * حەمەل: كاور * مورەووەق: زۆر جوان و صاف * مەعموور: ئاوەدان * دەستوور: مەرەخەستى * وشاق: كورِى دەمرِووت * مەعەرەض: نمايشگا، رانانگە * مەزاد: هەراج * ئيللا: مەگين * تەزيين: رازانەوە * تەحويل: گۆرِان * جامە: جلك * تەبديل: گۆرِين * ئيستەبرەق: پارچەيەكى ئەستوورى ئاوريشمييە * سوندوس: پارچەيەكى ئاوريشمينە * ميعجەر: سەرپێچى ژنانە، شەدە و هەورى * مەقرەمە: لەچك و دەسمالّى سەر * طورە: مۆرى بەقيچەلّ فاچى حكومەتى * تەصريف: گۆرِينەوە * تەكليف: زەحمەت * پوشيدە: پۆشياو * سەرگرانى: بەنازوفيزەوە

## دوو کورێ نەنیاس

وان هەردوو کورێ د جامە تەبدیل
وەقتێ دکرن د شەهرێ تەحویل
ناگاه عەجاییبە ک نوما وان
یەک جوز ژ عەقلێ قەط نەما وان
دیتن د مەحللە و زوکاکان
هەر کوچە و غورفە و شباکان
صەد تازە جوان ژ رەنگێ سەروان
دیبا و حەریر و خەز دبەر وان
پانصەد ژ کەچ و کوڕ و روالان
ئەو چەندە ژ قیسمێ پیر و کالان
ئەنواعێ موذەککەر و موئەننەث
هندەک د بورەهنە هن مولەببەس
هندەک د ئەعالی و ئەکابیر
هندەک د ئەدانی و ئەصاغیر
پێخواس هنەک هنەک د سەرکۆل
کاشۆ ژ پیان و سەر وەکی هۆل
سەر مەستە هنەک هنەک د سەرخوەش
دەم بەستە هنەک هنەک د دەمکەش
گویندە هنەک هنەک د خاموش
پویندە هنەک هنەک د مەدهوش
هن جامە دوڕیدە هن د سەرخەش
هن عەقل رەمیدە هن موشەووەش
هندان دکرن فغان و فەریاد
هن بویی ژ قەیدێ عەقلێ ئازاد
هەریەک د مەقامەکی دیگەرگوون
هەریەک بە جەفایەکی جەگەرخوون

* ناگاه: ژنشکاف * عەجایب: سەمەرە
* نوما: دیاری دا * مەحەللە: تاخ،
گەڕەک * زوکاک: کووچە، کۆڵان *
غورفە: ژوور، وەتاغ * شباک: پەنجەرە
* دیبا: حەریر * خەز: پارچەی
ئاوریشمین * موذەککەر: نێر *
موئەننەث: مێ * بورەهنە: رووت، طازی
* مولەببەس: بەجلک، پۆشتە * ئەعالی:
بلێندان * ئەکابر: مەزنان * ئەدانی:
نزمان * ئەصاغیر: بچووکان *
سەرکۆل: سەرقۆت * کاشۆ: گۆچانی
گۆبازی * هۆل: گۆ * دەمکەش: بێدەنگ
و کڕ * دەمکەش: هەناسە هەڵکێش *
گویندە: بێژەر * خامۆش: کڕ * پویندە:
غاردەر * مەدهۆش: دڵ بوراوە *
دوڕیدە: دڕیاو * خەش: شکست، قەڵش
* رەمیدە: رەویو * موشەووەش: پەشێو
* قەید: بەند و زنجیر

ئەو هەردوو دەمەک ڤەمان تەحەییور
بون غەرقەیێ لوجەیێ تەفەککور
تاجدین سەکنی و پرسیار کر
پرسا خوە ب ئێکە ئیختیار کر
گۆ ئەی خضرێ رەهێ هیدایەت
بێژ: ئەڤ چ بەلایە بێ نیهایەت
وی گۆتێ: دوو شەهلەوەندێ شەدداد
ئیرۆ لڤێ خەلقێ بوونە جەللاد
هەرچی کو دبینن ئەو دوو سەرخوەش
فیلحال دکن وەها موشەووەش
وان گۆ: تە نەدی کو ئەو چ ڕەنگن
وی گۆ: دووکورن زیادە شەنگن
وان گۆ: کو ب شیر و شەشپەڕن ئەو
یانە ب خەدەنگ و خەنجەرن ئەو؟
وی گۆ: کو ب غەمزە و ب ئاوڕ
خەلقێ د کوژن وەکی ب کێبڕ
وان پرس دکرن کو گەر ببینن
دا بۆ خوە ب مەردی دەست هەلینن
هەردوو دوی کاری بوون کو ناگاه
دیتن کو ژ مەحضێ قودرەتوڵڵاه
ئەو هەردوو پسەر وەکی دوو پەیکەر
تابندە بشکلێ شاهێ ئەختەر
یەک هەیئەت و شکل و یەک لیباسن
ئەمما دوی شەهرێ رەنگ نەناسن
سیرەت مەلەکن صووەر پەرینە
نە بایعن ئەو نە موشتەرینە

* تەحەییور: سەرگەردانی * غەرقە: نوقوم * لوجە: نێرینەی ئاوی زۆر * تەفەککور: رامان * سەکنی: وێستا * ئیختیار: پیرە پیاو * رەهـ: ڕێگا * هیدایەت: شارەزایی * شەهلەوەند: شای لاوچاکان * شەدداد: زاڵم * جەللاد: میرغەزەب * شەشپەڕ: گورز، گۆپاڵی سەربە بزمار * خەدەنگ: تیر * کێبر: کەی بڕ: سەرە تیری دم پان * دەست هەلێنن: دەست بکەنەوە، دەستەوەکەری بکەن * مەحضێ قودرەتوڵڵاه: هەربەقودرەتی خوا * پسەر: کوڕ * پەیکەر: کۆتەڵی جوان * تابندە: تیشکدەر * ئەختەر: ئەستێر * هەیئەت: بیچم * سیرەت: رەوشت * صووەر: ڕەنگ و ڕوو * ئەوباش: هاوسەر: مەبەست هاوقەد و بالایە

ڤـان هەردوو بران کـو ئەو دوو ئەوباش
دیـتن دل و جــان وەدان ب شــــاباش
ئەو ڕەنگ گـــــەڕیان جنـوون و والـەه
ئیــدی قــە نـەبوون ژ عــەقلێ ئـاگــەه
نە فـەهـم و خـیـرەد نەعـەقل و نەهۆش
گـێـر بوون لسـەر زەمـینێ مـەدهۆش
فـیلجـومله ژ دل ژجـانی سـیـر بوون
فـیلحـال ژ دوورڤـە هـەردەگـیـر بوون
وان هەردوو فـرشـتـەیێ د کـوببــار
دبـتن دوو مـــــــــــەلـەک زیـادە دلـدار

* شـاباش: پێـشـکەش * فـەهـم: فـام، تێگەیشتن * خـیـرەد: عـەقڵ، ئاوەز * گـێـر: حـەپەسـاو * سـیـر: تێـر * هەردەگیر: زەمینگیر

مەھ زادەنە لاکین ئافتابن
دلدادەنە لێ جگەر کەبابن
تەشبیھ بصەیدێ نیمە بیسمیل
بێ شبھە گەھانە حالێ موشکیل
ناچار بەزینە سەر شکاران
فکرینە روخێ د وان نیگاران
زانین کو نەصەیدێ سەرسەرینە
سەرخەیلێ سوپاھێ دلبەرینە
وەسطان و نەظەر کرن بە دیققەت
وان ھاتە ب قەلبێ رەحم و ریققەت
ئەلقیصصە ژ حوسنێ وان غەزالان
رەحمەک کەتە قەلبێ وان روالان
سیرا دلێ کر ب ھەڤ تەعەللوق
نورا روخێ وان ب ھەڤ تەعەششوق
مەکشووفە طەریقێ ئاشنایی
روحان قە نەکر ژ ھەڤ جودایی
یەکرەنگیێ صرفێ عالەمێ غەیب
ظاھیر دکر ئیتتحادێ لارەیب
حوببێ وە کرن ب ھەڤ گرفتار
حوسنێ وەکرن ب ھەڤ طەلەبکار
تەد گۆ کو چ قالب و چ مەقلووب
ھەر چار چ طالب و چ مەطلووب
بێ شبھە یەکن چ جان چ ئەرواح
ئەو موتتەحیدن چ تەن چ ئەشباح
حوببا د دلان وە کر حەلاوەت
بوغضا د دلان وە کر عەداوەت
نسبەت ب مە حادیثن عەدیمن
لاکین ژ حەقیقەتا قەدیمن

* میھ: گەورە، مەزن * میھزادە: گەورەزادە، رۆڵەی نەجیم و گەورەپیاوان * ئافتاب: خۆر * دلدادە: ئەڤیندار * جگەر: جەرگ * کەباب: برژاو، بریانی * صەید: نێچیر * نیمە بیسمیل: نیوە بیسمی ئەڵلاھ... باڵندە کە سەری دەبڕن و پێش گیان دەرچوون پەلە قاژەو باڵەتەپە دەکا... دەڵێن مەلی نیوە بیسمیلە * شکار: نێچیر * نیگار: جوانی دڵرفێن * فکرین: روانیان * سەرخەیل: سەرۆک، پێشەنگ * سوپاە: لەشکر * دیققەت: وردی * ریققەت: نەرمی و نازکی * تەعەللوق: علاقەدار، هەڵواسراو * تەعەششوق: ئەڤینداری * مەکشووف: خویا * طەریق: رێگە * قە: بەهیچ جۆر * صرف: خالیص و بێ خەوش * عالەمی غەیب: دنیای نادیاری * لارەیب: بێگومان * گرفتار: گیرۆدە * تەدگۆ: تۆ دەتگوت * چ قالب و چ مەقلووب: کوانێ بەدەن و خاوەن دڵ، کوانێ جل گۆڕاوی دل دۆڕاو، واتا ... نەدەکرا جیاوازی لە نێواندا پەیدا کەی، هەرچوار هەم ئەڤیندار بوون و هەم گراوی * جان: گیان * ئەرواح: روحان، زانایان لایان وابووە نەفس و روح دوون کە بە فارسی جان و رەوان دەڵێن * تەن: بەدەن * شەبەح: دیمەن، تارماییی لەش * حوب: خۆشەویستی * حەلاوەت: شیرانی، شیرنایەتی * بوغض: رق، رک * عەداوەت: دوژمنی * حادیث: تازەساز * عەدیم: نەهیچ * قەدیم: لەمێژینە

لەورا کو جونودێ جان موجەننەد
چێ بوونە د عیلمێ حەق موخەللەد
هن موئتەلیفن هنەک موخالیف
هن موختەلیفن هنەک موئالیف
وان موئتەلیفانە پێکڤە ئولفەت
ئاخر وەکرن نەما چو کولفەت
یەعنی کو ئەوان کوڕی دخونخوار
گاڤا وەهەدیتن ئەو بریندار
ئەو هەردوو ب صەد دلان حەباندن
رونیشتن و هەردوو وەرگەڕاندن
گاڤەک سەیرین ل بەژن و بالان
پێلەک حەیرین ل زولف و خالان
گۆتن عەجەب ئەڤ کەچێ د کێنە
یان هەردوو مەلائکێد خودێنە
ئەڤ میوە ل کی جهێ گەهانە
ئەڤ گول ل چ گولشەنێ نومانە
سەروێ د چ جویبارەکینە
طەیرێ د چ مەرغوزارەکینە
ماوەرد ژ هێسترێد گولگون
رێهتن لروخێد وان د پرخون
عیشقێ کربوون وەسا نەهشیار
قەطعا نەد بوون ژ خوە خەبەردار
ئاخر کو کرن بخامەیا عەشق
حوسنا خەطێ وان ل لەوحێ دل مەشق
وان ڤێ کو بزانن ئەو چ ئەصلن
لەوڕا کونزانن ئەو چ نەسلن

* جنوود: لەشکرچی، سەربازان * موجەننەد: ئامادەی کار * موخەللەد: تاهەتایی * موئتەلیف: هۆگر * موخالیف: دژ * موختەلیف: نەوەکهەڤ * موئالیف: سازگار * کولفەت: زەحمەت، گرانایی * حەباندن: خۆشویستن * پێلەک: تاوێک، دەمێک * گولشەن: باغچەی گولان * جویبار: رووبار، قەراغ جۆ * طەیر: مەل، باڵندە * مەرغوزار: مێرگ و چیمەن * ماوەرد: گولاو * هێستر: رۆندک، فرمێسک * گولگون: بەڕەنگی گوڵ * رێهتن: رژتیان * هشیار: وشیار* خەبەردار: هایدار * خامە: قەڵەم * لەوح: تەتەڵە * مەشق: نووسین بۆ فێربوون * ئەصل: رەگەز * نەسل: تۆرەمە

ئەنگوشتەریێ د وان جوانان
کێشان ژ ئەصابعێد خودانان
خاتەم ژ ئەنامیلێد خوە کێشان
دانینە جیهان ژ بۆیێ نیشان
یاقووت ب موهرییان گوهۆرین
ئەلماس ب شووشەیێد بلۆرین
سەرسال و خوەشی ژ دەست ب دەر دان
عەیشێ خوە بەدەل کرن ب دەردان
ئاگاه ئەجانیبن خویا بوون
ناکام کرن ویداع و رابوون
مان هەردوو برا وەکی دوو صەیدان
پابەستێ سەلاسیلان و قەیدان
رابوون کو شەڤەک سیاه و طاری
شەمس و قەمەران کری تەواری
رەه شبهەتێ مرغێ نیمە بیسمیل
بێ قووەت و بێ تەوان و بێ دل
سەرسام و دەوار و صەرع و مەحروور
سەودا و فوئاد و خەبل و مەخموور
صەد جاری د کەتنە ئاستانان
حەتتا کو گەهانە ئاشیانان
هەرچەندی گەهیشتنە مەقامان
ئەمما کو ل وان دوو تەلخ کامان
رۆژ و شەڤ و وەقت و صوبح و ئێڤار
یەکسان د نومان ل وان ب یەک جار

* ئەنگوشتەری: هەنگولیسک، ئەنگوسیلە، کلکەوانە * ئەصابع: کۆی ئەصبع: تلی، قامک، تبل، کلک * خودان: خاوەن * خاتەم: ئەنگوستیلە * ئەنامیل: کۆی ئەنمول: سەرپەنجە، سەرتبل * موهری: مورو.* ئەجانیبن: نامۆیان، لاوەکییان * خویا: دیار * ناکام: بێ مراد * ویداع: خواحافیزی، خاترخوازی، مالآوایی * سەلاسیلان: زنجیران * قەیدان: پێوەندان * تەوان: هێز * دەوار: گێژی * صەرع: فێ * مەحروور: نۆبەتیدار * سەودا: نەخۆشیی حالّ تێکچوون * فوئاد: دلّ ... مەبەست نەخۆشیی دلە * خەبەل: گەللایی، نیمچە شێت * مەخموور: سەرگێژ وەک گێژی خومار * ئاستان: بەربێلآیی، بەردەرگا * ئاشیان: هێلین، هێلانە * مەقام: جێگە * تەلخ: تالّ، طەحل * کام: دەڤ، زار

## ژانا برینێ ئەڤینێ

ئەو دوخـتـە چەشم هەردوو شـاهین
ئەوسـوخـتـە پەر مـەمـۆ و تاجـدین
خوەش چوونە شکارێ کەبک و قازان
ناگـاه بسـەر ڤـە شـبـهێ بازان
نوورەک فـتلـی ل وان ژ ناگـەهـ
ئێـدی قـە نەمـا ئەوان چو ئاگـەهـ
هندی کـو د حـەفـتـەیا حـەمـەل بوون
ئەو زێدە د وەحـشـێ یو خـەبـەل بوون
ئەو هـەفـتـە لوان کـوبوویە سـالیف
خـوکـەردەیێ عـیشـقێ بوون مـوئالیف
رابوونەڤـە رۆژەکی ب یەکـڤـە
فکرینە ب رەنگ و روویێ یەکـڤـە
عـیـشـقێ کـر بون وسـا مـوبەددەل
وان ئێک و دوو ناسـنەکـر ژ ئەووەل
ئەووەل دکـرن ژ هـەڤ تەغـەڕوب
پاشی کـو کـرن ب هـەڤ تەقـەڕوب
دیـتن خـوە ب پاچـەبـەند و زەنـگل
پەرواز و فـڕین مـحـال و مـشکیل
ئوسکـۆڤـە کـە ظـولمەتێ ب سـەردا
جلفـۆیەکـە ئولفـەتێ ب بەردا
بێ طوعـمـە و بێ شـەراب و بێ چاڤ
بێ مـەقـصـەد و بێ موردا و بێ گـاڤ
مـەسـتـانە ژ رەنگێ چەشـمێ دلدار
مـەخـموور و سیـاه مـەست و بیمـار

* دوخـتـە: دووراو، درواو * چەشم: چاڤ * شـاهـین: مـەلێکی راوکـەرە * سوختە: سووتاو، سۆهتی * پەڕ: باڵ، تووکی باڵ، چەنگ * ناگەهـ: ژنشکاڤ * ئاگەهـ: هایدار * حـەمـەل: کاوڕ... برجی سـەر سـاڵ کـە خـۆر لەسـەرە بەهارا دەیکاتە مزڵ * وەحشی: دوورە خەڵک * خەبەل: نیمچە شێت * سالیف: رابردوو * مـوئالیف: هـۆگـر * مـوبەددەل: گـۆڕدراو * تـەغـەڕوب: نەناسـیـاوی * تەقـەڕوب: نزیکی * فـتلی: وەرسـووڕا، بەدەورەدا گـەڕا * وسـا: بەجـۆرێک * زەنگل: زەنگوڵە * پەرواز: فـڕین * ئوسکۆڤ: تەپڵەی تەنگ و چکۆڵە کـە بەسـەری بازی تازە گیراودا دەکرێ تا چاوی نـەبینـێ * ظـولمەت: تـاریکـی * جلفـۆ: پارچەیەکی سوورە بەسـەر بازی رامنەبوویدا دەدەن تا رام و کـەوی دەبێ * ئولفەت: هۆگری * طوعمە: چێشکە، خۆراک * سیامەست: زۆر سەرخۆش

مـــانەندێ دەهانێ یارێ دلتـــەنگ
نـالـین ژ رەهـا دلـێ وەكـی چـەنـگ
گۆتن عـەجـەب ئەم كـو بوونە بیـمـار
یـا بـوونـە دكـی شـــــەرێ بـرینـدار
یـانـە وەهـــە ئـەم چـرا نـكـــاریـن
مـەجـروح و ضـەعـیف و دلفگارین
ئەڤ رەنگە ئەوان دكر تەفـەحـحـوص
ماهیـیەتێ حالێ خوە تەجەسسوس
تـاجـــــدیـن فكـری د دەست بـرایێ
تیـسـت گـــوهەرەك وەكی چرایێ
یاقـــووتەكـــە مـیـــثلی دانەیێ نـار
مـەشـعەل صـیـفـەتە ژ بۆ شـەڤا طار
مـــانەندێ شــەمـالێ ئەو تئـیـسـی
حـــەككاك بـناڤێ "زین" نڤـیـــسـی
دەسـتێ خـوە درێژ كـری كـو بینت
دا قـــــەنج نـەظـەر بكـەت ببـــینت
مـــەم ژی فكری د دەسـتێ تاجـدین
ئەلماســــەكــــە بێ بەها و تەخــمـین
لێ ئیـسـمێ "ستی" كری كیـتـابەت
ئوسـتـادەكی صـاحـیـبێ مـەهارەت
صـەراف ئەگـەر ببـیـتـە بوقـراط
تەخـمین بكەتن ب وەزن و قـیـراط
بـازار بـكـەت ژ بـۆ فـــــــەلاطوون
مـەجـمـوعێ خـەزانەیێ د قـاروون
ثومنا ئەمــــەنێــد وان نگینان
نـابت ب وقـــــــووفێ دوور بـیـنان

* بیــمـــار: نەخـــۆش * چرا: بۆچی، لەبەرچی * نكارین: ناتوانین، تواناـمـان نیـیـە * مـەجـرووح: بریندار، زامـار * ضـــەعـیف: لاواز * فگار: شــەكـەتی بریندار * تەفـەحـحـوص: پشكنین * ماهییـەت: چۆنیەتی * تەجەسسوس: دۆزین * فكری: دیتی * تیـــــست: دایسێت، گرداره * میثل: وەك * دانە: دەنك، دەندك * نار: هەنار * مەشعەل: شاپلیتە، مەشخەلان * شەمال: مۆم * تئیسی: دایسا * حەكاك: مۆرهەڵكەن * لێ: لەوی * كـیـتـابەت: نووسین * مـــەهارەت: كـارامـــەیی، لەزەبری * صـەراف: زێر و زیڤفرۆش * بوقـراط: فەیلەسوفی بەناوبانگی یۆنانی * وەزن: كێشان * قیراط: كێشیك لە سێ و شــەش بەشی مـثـقـال بەشـێكە * بازاركـردن: ســەوداكـردن، كـرین * فــەلاطون: ئەفــلاطون ... پیـــتۆڵی بەناوبانگی یۆنانی * خەزانە: گەنجینە * قـاروون: لە چیرۆكـاندا دەوڵەمـەندی هـەرە لەزەبرە * ثومـن: هـەشـت یـەك * ئەمـــەن: نرخ * نگین: نقـێم * وقـوف: ئاگاداری * تەعەجـجوب: سەیرمان * تەحەییور: سەرسوڕمان

مـایـن د تەعـەجـجـوب و تەحـەیـیـور
دامـان و گـەلەک کـرن تـەفـەککور
زانـین کـو صـەواحـیـبێ نگـینان
هـەرچی کـری کـر سـتی یو زینان
رۆژا وەکـو بوویە عـیـد و تەحـویـل
ئەو ژی گـەریانە جـامـە تەبدیل
چاوا خـەملینە ئەڤ کـەچانی
ئەو ژی گـەریانە جل کـورانی
ئەو بوون کـو مـە گـۆ د رۆژێ نەوروز
مـیثلێ مـەه و مـیـهرێ عالەم ئەفـروز
ئەو هـەر دوونە ئێـد دەست ڤـەمـشتن
ئەو هەردوونە ئێ د خـەل د کـوشتن
ئەو بوونە د شـەهرێ بوویی جـەللاد
ئەو بوونە کـو خەل ژ دەست ب فـەریاد
ئەو بوونە ل ڤـان جگەر کـەواندن
ئەو بوونە کـو ڤـان ب دل حـەباندن
وان هەردوو بران ب عـەقل و تەخـمین
بێ شـائیـبـە قـاتلێ خـۆ زانین
تـاجـدین ل نک هەبوو شـعـوورەک
عیشقێ د وی هێـشتبوو قصوورەک
گـۆ رابە برا ژ ناڤ نڤـینان
بـەس ئـاه بـکـە ژ بـەر بـریـنـان
ئەم شـێـرن و ئەو خـوە دوو غـەزالن
پڕ عـەیبـە کـو ئەم ژ بەر بنالن
مـەم پوختـەیێ عـیـشق بوو تەمـامی
گـۆتێ کـو برا مـەگـەر تو خـامی
داظەن نەبری مـوجـەسـەمم ئەز
سـەرتا ب پـیـان مـوقـەسـەمم ئەز

* تەفەککور: بیرکردنەوە * عید: جەژن * جامە تەبدیل: جل گۆڕیاو * مەگۆ: ئێمە گوتمان * مەگۆ: تۆمەز * مەه: هیف * میهر: خۆر * عالەم ئەفروز: دنیا رۆشنکەر * ڤەمشتن: هەڵماڵین * خەل: خەڵک * فەریاد: هاوار * کەواندن: داغکردن * حەباندن: خۆشویستن، ئەڤاندن * شائیبە: گومان و دوودڵی * قاتل: بکوژ * شعوور: هەست * قصوور: کۆتایی * پڕ: زۆر * خام: کاڵ * ظەن: گومان * موجەسەم: خاوەن لەش * موقەسەم: دابەشکراو

ئەڤ جیسم ل من بوویە موخەططەط
ئەو خەط هەمی بوینە مونەققەط
تەئثیر وە رەنگە عیشق و وەمقان
بیططول د طول و عەرض و عومقان
یەک نوقطە نەهن ژ دەردێ خالی
هێژا تو دبێ چرا دنالی
دل بوویە مەحەللێ عیشقێ حالا
ڤی حالی دڤێ مەحەلێ ڤالا
نینە عەجەب ئەربیم حلوولی
من مایە ژ صوورەتێ هیولی
شاهەنشەهێ عیشقێ بێ غەرەض هات
جەوهەر ڤەشری دەما عەرەض هات
ئەڤ حال و مەحەلل و جیسم و جەوهەر
عیشقێ ژ خوەرا کرن موسەخخەر
جان و جگەر و دل و هناڤان
دەست و سەر و پێ و پشت و چاڤان
وەڵلاهی یەکی نەمایە راحەت
بیللاهی یەکی نەمایە طاقەت
بزاداندنە وان ژ من عەلایق
بیلجوملە د بێن کو: "نەحنو عاشق"
ناپرسی ل حالێ من تو ظالم
هێژا تو دبێژی ئەز نەنالم
ئەڤ رەنگەهە وی کو کر تەظەللوم
تاجدین قە نەما ژ بۆ تەکەللوم
ئەڤ مانە د گەل ئەڤان برینان
بەحثا مە ل سەر ستی یو زینان

* جیسم: قالب، لەش * موخەططەط: خەتدراو * مونەققەط: نوختە نوختەکراو * تەئثیر: کارتێ کردن * وەمق: ئەڤین * بیططول (بالطول): بەقووەت و بەتوندی * طول: درێژایی * عەرض: پانایی * عومق: قووڵایی * حالا: ئێستا * مەحەل: جێگە * ڤالا: خاڵی، بەتاڵ، چۆڵ * شاهەنشەه: شاهەنشاه: پادشای پادشایان * بێ غەرەض: بێ رک و کینە * جەوهەر: رەچەڵەک و بنیچە * ڤەشری: شاردرایەوە * دەما: وەختێک * عەرەض: پەیدابووی تازە * موسەخخەر: بەردەست * راحەت: ئاسوودە * طاقەت: توانایی * بزاندن: پساندن * عەلایق: کۆی عەلاقە: پەیوەند * بیلجوملە: بەگشتی * نەحنو عاشق: "نحن عاشق": ئێمە ئەڤینداریین * هێژا: هێشتا، هێمان * تەظەللوم: گلی، شکایەت * تەکەللوم: قسەکردن، ئاخافتن، پەیڤین

## نێچیر بوونا نێچیرڤانا

ئەو ژی ڤەگەرین ب وی لیباسی
حاضر شەلییان کو کەس نەناسی
هەرچەند کرن لیباسێ تەبدیل
ئەمما نەدبوون ژ حالێ تەحویل
عیشقێ کر بوون وسان موبەددەل
ئێدی نە دچوونە حالێ ئەووەل
قەط کەس نەدگۆ ستی یو زینە
خەلقێ وە دزانێ ئەجنەبینە
داینەکە وان هەبوو زەمانی
تەشبیهێ بەلایێ ئاسمانی
زالا فەلەکێ ل بەر زەبوون بوو
وێ ناڤ ژپیری "حەیزەبوون" بوو
ئەو هاتی ژ غەفلەتێ ب سەردا
فکری کو جلێ د وان د بەردا
روونیشتنە بێ مەذاق و مەشرەب
وندا کرنە ذەقەن د غەبغەب
یەعنی د تەحەیور و مەلالن
مەهپارە د حالەتێ وە بالن
جلوا بوویی جەوجەمێ د تازە
رەنگێ سەمەنێ ب جایێ غازە
کافور مەثەل عوذارێ قانی
صۆرگول گەریانە زەعفەرانی
زانی کو پەری دبێ لیباسن
مەجلووبی مەحەببەتێ ئوناسن
گۆ ئەی هەوەسا دل و هناڤان
هەریەک ژ وە روهنییا دووچاڤان

* حاضر: دەسبەجێ * شەلییان: رووت بوونەوە * وسان: وسا، بەو جۆرە * ئەجنەبی: بیانی، نامۆ * داین: دایەن، تایەن، لەلەی کچان کە ژن بێ * زال: پیرێژن * زەبوون: عاجز و بێ دەسەلات * حەیزەبوون: پیرێژن * مەذاق: چێژە * مەشرەب: جێ خواردنەوە... مەبەست ئەوە بێ خواردن و خواردنەوە و بێ کەیف و دەماغ بوون * ذەقەن: چەناگە * غەبغەب: بەرچێلە، بەرخەبەبە * مەلال: وەڕەزی، جاڕزی، * مەهپارە: پاژی هیڤ * وەبال: بێ حاڵی و نارەحەتی * جلوا: سیس، ژاکاو، پەژمەریو * جەوجەم: گۆگەم: گوڵێکی زەردی زۆر شەق و جوانە * سەمەن: کا * غازە: سووراوی خۆ جوانکردنی ژنان * کافوور: بەرهەمی دارێکە ... دەرمانە و زۆر سپی رەنگە * عوذار: لاجانگ * قانی: سوور بەڕەنگی خوێن * زەعفەران: بەری گیایەکە زۆر زەردە، وەک کاخڵی دەچێ * مەجلووب: راکێشراو، براو * ئوناس: خەڵک * هەوەس: ئارەزوو

حافظ ژوەڕا مەگەر خودێ بت
جانێ مە ژ بۆ وەڕا فدێ بت
هون هندە موقەییەدن د قەیدێ
ئیرۆ ب تەنێ کو چوونە صەیدێ
وە زوو شەمراند ژ بۆ چ سەرسال
هون راستی ببێن کو بوویە ئەحوال
بێژن کو موقەددیمە چ ڕەنگە
ئەڤ حیرەتە یا خەیالێ ڕەنگە
هون بوچی حەزینن ئەی مەطایا
نینن چو نەتیجە بێ قەضایا
هون بێژنە من کو بو قەضییە
کەنگێ ل مە خەف دبت خەفییە
ئەز دێ نوهە رەملەکی بڕێژم
ئیسمێ و ضەمیرێ ئەز ببێژم
یا شووشە و مەندەلا خوە دانم
ماهییەتێ حالێ دێ بزانم
وان گۆتنە دایەیێ نیهانی
ئەم صبحێ کو چوونە دەر ژ خانی
هەرچی ل مە بوو دووچار و پەیدا
حاضر گەریا جنوون و شەیدا
ئاخر کو ژ حەددێ چوویە دەر جەور
جەورێ ل مە عاقیبەت نوما دەور
ئەم ژی گەریان مەلوول و مەغبوون
هاتینەڤە ئەم خەفیف و مەجنوون
داین بتەئەننی یو تەوەللا
چو بالیڤە دایە وان تەسەللا
گۆ هون ب جەمالێ شەهریارن
هەریەک ژوە شاه و خوندکارن

* حافظ: پارێزگار، پارێزەر * فدێ: فیدا، گۆڕی، قوربان * هون: ئێوە، ئەنگۆ * ئیرۆ: ئەمڕۆ * وە: ئێوە، وا * شەمراند: فرێتان دا، وازتان هێنا * موقەددیمە: پێشەکی * بەنگ: حەشیش: گیایەکە دەی کێشن و پێی گێژ دەبن * حەزین: خەمگین * مەطایا: کۆی مەطیە... ئەوی بۆ سواربوون دەست دەدا * نەتیجە: بەرهەم * قەضایا: کۆی قەضییە: مەسەلە، ڕووداو * خەف: ون، نەپەنی * خەفییە: نهێنی، نەپەنی * رەمل: فاڵی بەقوم * ضەمیر: دڵ، لێرەدا مەبەست نهێنیی ناو دڵە * مەندەل: جەغز و کاسەی سەر داپۆشراو کە فاڵگران بەکاری دێن بۆ جندۆکە دواندن * شووشە: وردەبابەتی بەردەستی فاڵچی، هەچی وردە * دووچار: تووش * پەیدا: دیاری * حاضر: هەرلەجێ * جنوون: شێت * شەیدا: دین، پەشێو * جەور: ناحەقی و زوڵم * عاقیبەت: لە پاشان * مەلوول: وەڕەز * مەغبوون: لە سەودا تێشکاو * خەفیف: سفک * تەئەننی: لەسەرخۆیی، کاوە خۆیی * تەوەللا: دۆستانە و خۆشەویستانە * تەسەللا: دڵدانەوە

کی بت کـو نەبت مـوطیع و مـوحـتـاج
کی بت کـــو نـەدت وە بـێ طـەلەب بـاج
هـەرچی وەحـــــەباندی ئەی پـەریزاد
حـــوسـنا وە دکــەت ژ بۆ وە مـــونقـــاد
خـــاصـمـــا دڤی شـــەهری بت وە دلدار
ئـەز دێ وی بـکـم نـوهـا خــــــــەریدار
بێـــژن کـــیـــــیــــە دا بچم ببـــینم
حــــــــاضـــــــر بکرم ژ بـۆ وە بینم
وان گــۆتنە حـــەیزەبوونێ ســاحــیـــر
دەردێ ل مــە ئەی طـەبیـــبێ مـــاهـیـــر
بێ شـــبـــهـــە دەوا ژ دەست تـە تێتن
تـەقـــریر ئەگـــەر ژ دەست مــــە بێتن
تـەقـــریر و ئەدا کـــــرن مـــــەحـــــالە
تـەدبیـــــــر و دەوا کــــــرن بـەطـالە
هـندی هـەنە کـیــژ و کــوڕ د بوهـتـــان
بەلکی د جـــەمـــیـــعێ بەژن و بـوهـلان
کەس نینە ب لوطف و حوسنێ مەشهوور
ئیللا کـو د دەفـتـەرا مـە مـەسطوور
یـەعنی هـەمـی روو ب روو مــــــە دینـە
هـندی دڤی شـــــەهری ئادەمـــــــینە
ئیـــرۆهـە دوو کــەچ غـــەریب و شـــیـبـا
ســـــەرتا ب قـــەدەم دەبیق و دیبــــا
زیبــــەندە ژ شکلێ شـــاهـێ خـــاوەر
تـابـەندە ژ رەنگێ مــــــــاهـێ ئـەنوەر
ناگـــەه ل مــە بوون دووچار و ظاهـیـــر
گـــێـــر بوونە ژ دوورڤــە هەردوو نـادیر
ئەم چوونە ب ســەر بنێین کــو کـینە
فکرین نـەوەکی مــــــە ئادەمـــــــینە

* جـەمــال: جـوانی، رندی * شــەهرەیار: شـاه، پادشـاه * خـوندکـار: پادشـاه * مـوطیع: بەرفـەرمـان * موحـتـاج: ئاتاج، چـاو لـەدەس * طـەلـەب: داوا * بـاج: سـەرانە * مـونقـاد: بەردەست و زەلیل * نوها: هەر ئێستا *حاضر بکرم: ئامادە بکەم * سـاحـیـر: جـادووگـەر * طـەبیب: بژیشک * مـاهیـر: کـارامـە * تـەقـریر: ئەداکرن ... باسی رووداوکرن * تەدبیـر: دەبراندن، پێ چاران * جەمیع: هەموو * بەژن: کـــۆی بەژ... دەشت و دوورەئاو * بوهلان: کۆی بوهل: گـەلی و شیـو و دۆڵ "لە هەرسێ نوسخـەدا قـافـیـەی دووهەم بوهتـان نووسـراوە، من کـە دەزانم بـوهل گەلییـە، نەمزانیوە بوهت گـەلی بێ بەلام ئەگـــەر بوهت لە زاراوەیەکی کـــوردیدا بەگـــەلی و دۆڵ بلـــێن وەک بـوهل هـەر بوهتـــەکـــە رێک و لەبارتر دەبێ . هـ" * ئیـرۆهە: ئەمـرۆکـە * غـەریب: نـەناس * شیبا: پەشێو، شێواو * سەرتاب قەدەم: ســــەرتاپا * دەبیق: جـــۆرێ پارچەی ئاوریشـــمـــینی زۆر ناسک بوو، کـــە لە شارێکی میصر بەناوی دەبیق دەتەندرا و ناوبانگی بەدەبیق یان دەبیقی دەرچووە * دیبا: پارچەیەکی جوانی لە ئاوریشـمـە * زیبەندە: جوان و رازاوە * شاهی خاوەر: رۆژ، خۆر * تابەندە: بەتیریژ، تیشکدەر * مــــاه: هیڤ * ئەنوەر: هـەرە رووناک * دووچار: تووش * ظاهیـر: دیار * گـێـر: حـەپەسـاو * نـادیر: کـەم وێنە * بنێین: تماشاکەین * فکرین: دیتمان

تەحقیق مەلەک وەیا پەری بوون
لەورا کول ئاف و گل بەری بوون
گاڤا کو مەدیتن ئەو پەریزاد
ئەم ژی گەڕییان ژ عەقلێ ئازاد
ئەو هەردوو وەکی دوو جامی جەمشید
ئەم هەردوو میثالێ ماه و خورشید
گاڤا وەکو پێکڤە بوون موقابیل
میصباح و زوجاج بوون موعادیل
قارووره ژ نەجمێ مونعەکیس بوو
نوورەک مە ب قەلبێ موقتەبیس بوو
قیندیل و فتیلە گەر ژ وان بوو
ئاگر ژ روخێ مە هەردوان بوو
زەیتێ مە و ئاگرێ مە دیسا
بەربوومە و دل مە پێ ئەیسا
صوهتین خوە بخوە نزان چ حالە
هشیارییە خەونە یا خەیالە

* بەری: بێبەش، دوور * موقابیل: بەرانبەر * میصباح: چرا * زوجاج: شووشە * موعادیل: هەمبەر، رووبەڕوو * قارووره: شووشە * نەجم: ئەستێرە * مونعەکیس: کەوانەکەر، دانەوە * نوور: رووناکی * موقتەبیس: قەبەس گیر، قەبەس: چروسک ... لێرەدا هێما بەو ئایەتانەی قورعانە کە لە زمانی موساوە دەڵێ: "موسا بە خێزانی خۆی گوت من هەستم بە ئاگرێک کردووە دەچم شایەتا ... چروسکێکتان بۆ بێنم یان رێشاندەرێک لەسەر ئاگر پەیدا کەم" * قیندیل: چرا * فتیله: پلیتە * زەیت: رۆن، رۆن زەیتوون * دیسا: دیسان، گەڕایەوە، کەوانەی کرد * بەربوومە: تێمان هەڵگرا * ئەیسا: ئایسا * نزان: سووکەلەی نزانین، نازانین

## حەیرینا دایین

داین حەیری ژ ماجەرایە
گۆ ئەی رح و قالبێد دایە
هون چوونە تەفەڕوجا روالان
فاریغ ژ تەعەششوقا غەزالان
شکلێ کو وە دیتی بێ مەئالە
مەیلا وە بقسمێ ژن بەطالە
مەیلا بەشەری بەشەر دڤێتن
ئەمما وە کەچان پسەر دڤێتن
کەچ قەط ل کەچان دبن خەریدار
بێ نەقدی کوڕان مەحالە بازاڕ
کوڕ ئاینەیێ جەمالێ ذاتن
کەچ مەظهەرێ پوڕتەوا صیفاتن
بۆ ذاتێ صیفەت غەرەض میثالە
جەوهەر نەبتن عەرەض محالە
قایم دبتن عەرەض ب جەوهەر
بێ شەمس قەمەر دبت مونەووەر
مەیلا ژ روخێ کوڕان بەری بت
صەد جار کو حوری و پەری بت
ئەو مەیل کو دێ بکەت وە مەفتوون
ئەو لەیلێ کو دێ بکەت وە مەجنوون
مەجنوون کو نەبت عەدیلێ لەیلێ
لەیلێ کو دکەت بلەیلێ مەیلێ
گول قەط ل گولان دبیتە عاشق؟
عەذرا خوە بخوە دبیتە وامق؟
خوسرەو نەبوویا سەوارێ شەبدیز
شیرین لشەکەر د بوویە پەرویز؟

حەیری: واقی وڕما * ماجەرا: ڕووداو * قالب: بەدەن، لەش * تەفەڕوج: سەیران * فاریغ: والا، خالّی * تەعەششوق: ئەڤاندن * غەزال: مامز، ئاسک * مەئال: بەهرەدانەوە * بێ مەئال: بێهوودە * مەیل: ئارەزوو، ئاوڕ وەسەردان * بەطال: بێ ناوەڕۆک * بەشەر: مرۆڤ * پسەر: کوڕ * بازاڕ: سەودا و مامەڵە * ئاینە: نەینیک، نەینوک * جەمال: جوانی * ذات: کەس، نیاز خوایە * مەظهەر: نوێنەر * پوڕتەو، تیشک * صیفات: ئاکار

* غەرەض: مەبەست * میثال: نموونە * عەرەض: بەسەردا هاتوو، پەیدابووگ * محال: نەشیاو * قایم: وێستاو * شەمس: خۆر * قەمەر: هەیڤ، هیڤ * مونەووەر: ڕۆشنکراو * مەفتوون: دینی ئەڤین * مەجنوون: دین، شێت *عەدیل: بەرانبەر* کو دکەت: کوادەکا * عەذرا و وامق: باسمان کردن * وامق: عاشق * خوسرەو: پادشا، پادشایەکی ئێران * شەبدیز: ناوی ئەسپێکی خوسرەو بوو * شیرین: گراویەکەی فەرهاد و ژنی شاخوسرەو * شەکەر: ناوی ژنێکی تری خوسرەو، یان ژنێکی دلبەری ئەو بوو، خەڵکی ئیسفەهان * پەرویز: نازناوی خوسرەو شایەکەبوو

فـــەرهاد جـــووا ســـرشكی پر خـــوون
نینا؟ نەددی ســــەواری گــــولگوون
ژەو چەندەهە عـــالەمـــا ریجـــالان
بـەگـــــــزادە و ســــــادە و روالان
دل قـــەط وە نەبت ب كـــەسـقـــە مـــایل
كـــــیـــــژن د ئەدانـی و ئەراذیـل
بێ نام و نـیـشـان و غـەیرە مـەعروف
قەلبێ وە ب وان كو بوویی مەشغوف
ئەڤ ئەمـــر ب من قـــەوی مـــەحـــالە
ئەڤ خـــەونە وە دیتی یا خـــەیالە؟
زینی كـــو بهـــیـــستن ئەو مـــەعـــانی
ئەڤ نەغـــــمـــــە ژ پەردەیێ دەرانی
ئەڤ رەنگەهـە گـــۆتـە دایـەیا پـیـــر
غـــالب تە نەمـــایە عـــەقل و تەدبیـــر
تە دگـــۆ وەكی مـــەندەلا خـــوە دانم
حـــالێ كـــو خـــەفی بتن دزانم
شكلێ كـــو مـــەدی نە بێ مـــەئالە
تەحـــقـــیـــقـــە نەخـــەونە نەخـــەیالە
وان گـەر مـەلەک و ئەگـەر بەشـەربوون
گەر قیسمی نیساء و گەر پسەر بوون
ئەنگوشـــتـــەریێ د وان ئەڤـــانە
ئینانە مـــە ئەو ژ بۆ نیـــشـــانە
رەملێ تـو ئەگـــەر ب راست دزانی
خـــاتەم ئەڤـــە دێ بزان خـــودانی
وی شـــەهلـەیێ حـیلەكـار و جـادوو
گـــۆ بینە ژ بۆمـــە خـــاتەمـــا زوو
دا ئیـــشـــەڤـــە رەملەكێ برێژم
حەتتا صـبـە صـاحـیـبـان ببێژم

* فـــەرهاد: ئەڤـــینداری بەناوبانگ * سریشک: هێستر، رۆندک، فرمێسک * نینا: نەهێنا * گولگون: ناوی ئەسپێک بووە كە شیرین بە سواری ئەو چووەتە دیداری فـەرهاد * عالەم: مـەخلووقـات، حەشامات * ریجالان: پیاوان * كیژن: كچانی * ئەدانی: نزمان * ئەراذیل: بێ نرخ و پەستـان * غـەیرە مـەعـرووف: نەناسـراو * مـەشغووف: پڕ لە ئەڤین * ئەمـر: كـار، كـارەسـات * قـەوی: زۆر * مـەعـانی: واتایان * نەغـمـە: ئاواز * پەردە: هەوای سـتـران * غـالب: زۆرتر وێ دەچێ

* مـەئال: بنەڕەت * تەحـقـیق: راست و دروست * قیسم: بەش * نیسـاء: ژنان * دێ بزان: دەبزانە * خـودان: خـێـو، خاوەن * شـەهلە: پیرێژن * خـاتەمـان: ئەنگوستیلان * ئی شـەڤە: ئەمشەو * صبە: بەیانی *

حـــاضـــر ســـتـــيـــيێ نگین دەرانـی
دا دەســـتێ عـــەجـــووزەیا زەمـــانـی
زینێ وەهـە گـــۆتـە حـــەیزەبوونێ
من دل بوویە وەرطەیێک ژ خـــوونێ
گـــاڤـا وەکـــو وەرطـە دێتـــە جـــوشی
وەقـــتێ کـــو دکـــەت بکەت خـــروشی
تـەسکین دکـــــەت ئەو نگین دلـێ ژار
دەم دەم کـو ددم د چەشـمێ خـونبـار
زینـهـــــار ئـەگـــــەر دبـەی نگـینێ
زوو بینەڤـــــە بـۆ م دلحـــــەزینێ
لـەورا بوویە صـــــەبری م ژ هـەیمان
ئەو بو من خـــاتـەمـــا ســـولـەیمان

نگین: نقـیم، مـەبەست هەنگولیـسکە * عـەجـووزە: پیـرێژن * وەرطـە: چەق و زەلکاو، شوێنێک کە پیاو لێ دەرنەچێ و بەهیـلاک بچێ * دێتـە جـۆشی: هەڵدەقـوڵێ * خـرۆش: هاوار و گـازی، گـرمـە و ناڵە * تەسکین: هێـور، ئارام، هێدی * دەم دەم: جار جار * زینهـار: تکات لێ دەکـەم، ئەز د بەخـتێ تەدا، دەغیلە * دلحەزین: دڵ خەمگین * لەورا: چونکە * صـەبری م: سـەبووری من * هەیمان: تونیایەتی و سەرلێشێواوی لە رێگەی ئەڤیندا * خـاتەما سـولەیمان: کلکەوانەی حـەزرەتی سـولەیمان پێغەمبەر، کە هەرچی بیویستایە پێی دەکرد

## رەمل و مەندەل

وێ دەللەیێ بێ فەصال و موحتال
صبحێ خوە گیهاندە پێشێ رەممال
زێرەک دوو برن د دەست خوە بۆ پیر
ئەڤ رەنگەهە کر ضەمیرێ تەقریر
گۆ من دوو کورک هەین د مەعصووم
بێ باب و یەتیم و ژار و مەحرووم
رۆژا وەکو بوویە عید و سەرسال
ئەو ژی ب طەریقێ طەبعێ ئەطفال
رابوونەڤە هەردوو چوونە گەشتێ
غولان غەلەطاندبوون ل دەشتێ
ئیرۆهە دەما کو بوونە پەیدا
دینن تەلەسن جنوون و شەیدا
هاتینەڤە بێ لیباس و طازی
گەهـ گەهـ دکرن فیغان و گازی
بێ هۆش دکەڤن گەلەک دمینن
گاڤا وەکو رادبن د دینن
ئەڤ خاتەمە نە ئەوان ددەستن
گویا تو دبێژی ب ڤان د مەستن
ئەی واقفێ رەمز و کاشفێ راز
بێچارەمە ئەز تو چارە پەرداز
ئیحسان بکە قەنج ژێ خەبەردە
کانی صەبییێ د من چ دەردە
مەجنونییە صەرعە یا هەوایە؟
چاوا مەرەضە چ بۆ دەوایە؟

* دەللە: هاتۆچوکەر دەنێواندا، دەلاڵ * بێ فەصال: ناقۆلا و خواروخێچ * موحتال: گزیکار * صبحێ: بەیانی * رەممال: فالگرەوە * ضەمیر: وەشارتو * تەقریر: بەیان * کورک: کوریژگە * مەعصووم: بێ گوناح * یەتیم: سێوی * ژار: بێچارە * مەحرووم: بێبەش * طەریق: رێ و شوێن، داب * ئەطفال: زارۆکن * غول: پیرەهەڤی، پیرەهەڤۆک، مێردەزمە، مڵۆزم * غەلطاندبوون: هەڵفریواندبوون * تەلەس: تەواو مەست، شەشدانگ، سەرخۆش * جنوون و شەیدا: شێت و پەشێو * طازی: رووت و قووت * گەهگەهـ: جارجار * فیغان: هاوار * دین: شێت * واقیف: هایدار * کاشیفێ راز: خویاکەری نهێنی * چارەپەرداز: چارەساز، کارساز * ئیحسان: قەنجی، چاکە * قەنج: باش * صەبی: زارۆک * مەجنوونی: دینی * صەرع: فێ * هەوا: ئەڤین، بای نەخۆشی * مەرەض: نەخۆشی، نەساخی * دەوا: دەرمان

ئەی مـورشـیـد و پێـشـەوایێ مـوقـبـیل
حـەللالێ عـوقـود و حـەللێ مـوشـكیل
سـیـڕەک هەیە وی دڤـان نـگینان
پـەیـدایـە ل نـک وە دووربـیـنان
ئەصـحـابێ نگین ببـێژە کـینە
جـینـنینە پەرینە ئادەمـینە؟

* مـورشـیـد: ڕێ نیـشـاندەر، پێـشـەوا، سەرکردە، پێشرەو * موقبیل: بەختەوەر * حەللال: ڤەکر * عوقود: کۆی عەقد: گرێ * حەل: شیکردنەوە * موشكیل: ئاڵۆز * سـیـڕ: نهـێنی * جـیننی: جندۆکە، ئەجندە، لەخۆمان چاکتر * پەری: جـوانـی نادیار جگە لە مـرۆڤ * ئادەمی: مرۆڤ، بنیادەم

## بزیشکا دەرەوین

ئەو واریثێ عیلمێ دانیالی
کاڤا فکری د شکلێ فالی
فیلحال د رەحمێ ئوممەهاتان
بێ وەضعێ تەوەللودا بەناتان
لەحیان و نەقییێ پێکڤە دیتن
تاجدین و ستییێ پێکڤە دیتن
شکلێ تەرەحێ دگەل غەمێ دیت
بێ پەردە وی زین دگەل مەمێ دیت
ئەڤ رەنگەهە گۆتە قاصیدا پیر
مەقصوود ب مەکر و کیذب و تەزویر
ما قەط دبتن ژ بۆ تە حاصیل؟
بێ راسترەوی محالە مەنزل
تە دگۆ کو کورێ د من د دینن
نابێژیە من ستی یو زینن
رۆژا وەکو چوونە گەشت و سەیران
وان دینە ل رێ دوو دیدە حەیران
یەعنی دوو کورێ د سەر و قامەت
رابوویە ل وان کوڕان قیامەت
فیلحال ئەڤان دوو ئافتابان
دل چویە ڤەبال دوو ماهێ تابان
ئەو بوونە ژ عیشقێ ڤان د بێهۆش
ئەڤ بوونە ژ حوسنێ وان د مەدهۆش
ئەڤ شیفتەیێ بەلایێ عیشقن
ئەو تەشنەیێ کەربەلایێ عیشقن

* واریث: میراتگر، کەلەپوور بەر * عیلم: زانست * دانیال: ناوی پێغەمبەرێکی جوولەکانە * فکری: نواڕی * شکل: بیچم * فیلحال: هەرلەجێ * رەحم: رەحەمە، منداڵدان * ئوممەهاتان: دایکان * وەضع: دانان * تەوەللود: زان * بەنات: کچان * لەحیان: ناوێکی تایبەتی فاڵگرانە کەسێ خەتی وەک ئەلف (ا) بەقیتی لە رەمڵەکەدا دیار بکەن بەو شکڵە: (أ، أ، أ) * نەقا: نەقی: تەپۆڵکە رەمڵێ رووتەن: ئەویش ئەگەر لە رەمڵ لێکداندا فاڵگرەوە قیتایی وەک تەپۆڵکەی چکۆڵەی دەرەمڵەکەیدا بوو: دەڵێ: زۆر چاکی هێناوە، بەڵام ئەگەر وێنە ئەلفەکان لە درێژەوە بە راکشاوی بوون و قولکەی چکۆڵە کەتە سەر رەمڵەکە نیشانەی خراپ هێنانە * تەرەح: کەسەر و کول * غەم: خەم و دەرد * قاصید: راسپاردە * مەقصوود: مەبەست * مەکر: فێڵ * کیذب: درۆ، دەرەو * تەزویر: هەڵبەستە و ناڕاست * ما: مەگەر، بۆ * راست رەوی: راست رێڤەچوون * مەنزل: قۆناغ * دیدە حەیران: چاو جوان * قامەت: بەژن و باڵا * قیامەت: ئاخرەت، ئەو دنیا * ماهی تابان: هەیڤێ بەتیرێژ، رۆهنی دەر * بال: جەم، کن، نک، با * شیفتە: شێویاو * بەلا: نەهاتی، بەلا * تەشنە: تی، تینوو، توونی

ئەڤ خاتەمە ئێ د وان کورانن
ڤان ژی دو نگین د دەستێ وانن
چاوان خەملینە ئەڤ کورانی
ئەو ژی گەرییانە جل کەچانی
پیرێ وەهە گۆتە شێخی رەممال
من شبهە نەما دکەشفێ ئەحوال
لیکین تو ببێژ ئەو چ ئەصلن
قەنج کەشف بکە کو ئەو چ نەسلن
بەگزادەنە ئەو عولا مەقامن
جوندی نەسەبن وەیا عەوامن؟
شێخ گۆ: کو ددینێ عیشقبازی
بەیعەک هەیە ئەو دبێن تەراضی
بێ شەرطێ کەفائەتێ رەوایە
شەرطێ موتەعاقیدان رەضایە
خاصما کو کورێد ڤان بژاری
دوڕ دانەیە ئێک و ئێک مراری
بەگزادەیە یەک ژ نەسلێ میران
یەکژی بنەسەب کورێ دەبیران
وی ساحیرەیێ ژ بۆ نیشانە
دیسان خەبەرەک کرە بەهانە
گۆ عاشق و موبتەلا و دینان
مەفتوونێ ژ بۆ ستی یو زینان
ئەو نابنە قابیلێ حیسابان
ناگونجنە دەفتەر و کیتابان
شێخم تو دزانی ئەڤ جزیرە
تێکدا کوبەرا و کوردە میرە

* کەربەلا: شارێک و شوێنێکە لە عێراقی ئێستا، کە ئیمام حوسێن دروودی خوای لێ بێ لەوێ خەزای کردووە، ئاوی فوراتی لێ قەدەغەکراوە و خۆی و خێزان و یارانی بەتینوویەتی ماونەوە و هەر لەوێ شەهید کراون * پیرێ: پیرەژن * شبهە: گومان و دوودڵی * کەشف: کفش * لاکین: بەڵام * عولا مەقام: پایە بەرز، جێ بڵند * جوندی: ئازا، جوان و لاوچاک * لەشکری و دیوانی: لێرەدا مەبەست دیوانییەکەیە * عەوام: رەشایی، بۆرەپیاک * دین: ئایین و رەوشت * بەیع: سەودا، فرۆش * تەراضی: هەردوو لارازی * شەرط: مەرج * کەفائەت: بەرانبەری، هاوشانی * رەوا: دروست * موتەعاقیدان: کڕیار و فرۆشەران * رەضا: رازی بوونە، قنیات هێنانە * دوڕدانە: مرواری درشت و تاقانە * مراری: مرواری * خەبەر: پەیڤ، قسە * موبتەلا: تووشهاتوو * مەفتوون: شێت و شێواو * نابنە قابیلێ حیسابان: هەر لەژمار نایەن * شێخم: ئەی شێخی من * تێکدا: وێکڕا * کوبرا: گرە گرە، مەزن * کوردە میر: میرە کورد یان کورد میر، کوڕی میران

ئیــحــســـــان بکە پەردەیێ هـلینە
ئەو هەردوو مـــەلەک ببـێـژە کــینە
عـــەهدا مـــە وەبت تەنێ ببـــینم
چـل زێـڕی بـچـم ژ بـۆتـە بـیـنـم
شـێخ گـۆ تو هـەڕە ببین وەشـاقـان
تەفـتـیش بکە جـیـە و زەقـاقـان
هـەرچی کـــو دبێـــژن ئەو عـــەلیلە
ئـەو عــــــیللـە ژ بۆ تـەڕا دەلـیـلـە
بنمێ خـــوە بصــــورەتێ طەبیـــبـان
بێ پەردە دبینی وان حـــەبیـــبـان
گـــاڤـــا کـــو تە دیتن ئەو مـــەلەکـوار
کـەشـفـە ژ قـومـاشێ ژی خــەریدار
خـاصــمـا کـــو ددەسـتێ وان نگینن
مــــەنقــــووش ل وان ســــتی یو زینن
رابووڤـە عـەجـووزە شـبـهێ لوقـمـان
ســـەر تا ب قـــەدەم دەوا و دەرمـــان
قـاروورە و حـوقـقـە نەشـتـەر و کیس
هـەلگرتن ئەوا خـــەبیـــثێ تەلبـیس
دانێ بـەغـەلا خــوە چەند کـتـێـبـەک
دنما ب حــەکـیـمـەیێ عـەجـێـبـەک
حـاضـر خـوە گـەهاندە پیشـەکـاران
فــــیلحـــــال بوویە نەدیمێ یاران
وان گـــۆ: تو ژ کـوڤـە تێی چ پیـری؟
غـالب تو ژ عـیلمـەکی خـەبیـری؟
گۆ: هـەرچی کو ظاهیری حـەکـیـمم
زێدە ب دوو عـــیللەتان عـــەلیـمم
زایـل دکـم ئەز قـــــــەوی دوو ژانـان
دەردێ بـەدەنـان و دەردێ جـــــــانـان

* هلینە: لادە * مـەلەک: فـریشـتـە * عـــەهد: پەیمان * وەشـــاق: تازەلاو، نۆجـوان * تەفـتیش: پشکنین * زەقاق: کـووچە و کـۆڵان * عـەلیل: نەسـاخ، نەخۆش * عیللە: سەبەب، هۆ، سـەمەد * دەلیل: شـارەزاییکەر * بنمێ: خـۆت نیـشــان دە * صـورەت: شکڵ، بیـچم، تەرح * طەبیب: بژیشک * حـــەبیب: خۆشـتەوی * مەلەکوار: وەک فریشتە * مـەنقـووش: نەخشـاو * لوقـمـان: ناوی بژیشک و هۆزانێکی زۆر کـەونارایە کە لە قورعانیشدا ناوی هاتووە * قاروورە: شـووشەی دەرمـانان * حوققە: قوتولکە * نەشـتـەر: تیـخـەلەی برین دڕین * کـیس: توورەکـە * خـەبیث: پیس * تەلبیس: خۆگـۆڕاوی حیلەباز * بەغەل: پاخل، باوەش و بن کـەوش، بن هەنگل * دەنما: دەی نواند * حـەکیم: بژیشک * عـەجیب: سـەیر و سـەمـەرە * حاضـر: لەجێ * نەدیم: هـاونشین * غـــالب: زۆرتر، باقڵ * خـەبیـر: هایدار * عەلیم: عالم، زانا * زایل دکم: لادەبەم * قەوی: زۆرتر * بەدەن: لەش

وان گـــۆ تو ژ بۆ مـــەرا خـــەبەردە
دەردێ کـــو ل جـــانی بت چ دەردە؟
وێ گـوٚتی: کـو هـون مـەگـەر نەبینن
وی دەردی عـــــەلامـــــەتن نەهـینن
ئەو دەردەکی زێدە بێ مـــــەجـــالە
صـیحـحـەت ژ وی دەردیرا مـەحـالە
دووربت ژوە ئـەو گـــــــەلێ روالان
ئەو بەرقـــە د صـــورەتێ شـــەپالان
گـــاڤـــا ڤـــەددەت وەکی برووسکە
بێ شـــوعلە و پێت و بێ چرووسکە
بێ جـــورحـــە و قـــورحـــە و برینە
ناڤێ لوی دەردی هـەر ئەڤـــــینە
ئەمما وە د صـــــۆژتـن هـناڤـــــان
خـــونا دلی تێ ژ هـەردوو چاڤـــان
وان گـۆتنە وێ کـو "خـەیرەمـەقـدەم"
حـالەن نـەخـوەشـن ژمـە دوو هەمـدەم
ئیـــحـــســـان بکە هەردوویان دەواکـە
دەرمـــان کــە ب نەوعـــەکی تو راکــە
هـەرچی تـو دبێـــژی ئـەم وســـاکین
هـەرچی تـو دخـــــوازی ئـەم ئەداکین
پیرێ خـوە گـیـهـاندە نک مـەریضـان
وەقــــتێ فـکـری دوان عـــــەزیزان
وێ گـــۆتە ب هـەمـــدەم و دەلیـــلان
تەنهـــا مـــە بهـــێلن و عـــەلیـــلان
دا ئەز بکرم ڤـی دەردی تەشـــخـــیص
پاشێ بکم ئـەز دەوایێ تـەلخــــیص
هـەڤـــرێ هەمی چوونە دەر ژ با وان
پیـــر مـــا ب تەنێ دگـــەل دوو لاوان

---

* عـەلامـەتن: نیشـانان * مـەجـال: دەرفەت، بوار * صیحـحەت: لەشساخی * بەرق: برووسکە * شـــەپال: رند، بەدەو، جوان و شۆخ و شەنگ * ڤەددت: دەداتەوە، کەوانە دەکا * شـوعلە: گڕ، پێت، بلـێـســە * چرووسک: بزووت * جورح: برین * قورحە: کوانی چڵکن * برین: زام * هناڤـان: هەناوان، جەرگ و دڵ و سـیـپـەلاکـان * "خـەیرەمـەقـدەم": بەخـێـرهاتی، پێ و قـەدەمت بەخـێـر * حالەن: ئیستێکە * هەمـدەم: هەڤاڵ * وسـا: ئاوها * ئەدا: جـێـبـەجێ، دان * دەلیل: شـارەزاییکەر * تەشـخـیص: دیاردە * تەلخـیص: پوخـتـەکـردنەوە * ژباوان: لەکن وان.

## ئەڤیندار کفشن

بیمارێ ب دەردێ عیشقێ بەدحال
ناگەهـ فکرین کو چوونە هاڤال
رونیشتی ژ پێشی وانڤە زالەک
قامەت چڤیایی رەنگ هیلالەک
ناهیستە کەلامەکێ دبێژت
دگریتن و هیستران درێژت
گۆتن چ کەسی تو ئەی دلارام
بۆچی دگری وەها ب ناکام
وی گۆ ب سەرێ ستی یو زینێ
مەحضەن ژ وەرا دکم گرینێ
مەخصووص ژ نک ستی یو زینان
هاتم ل وە خوەش بکم برینان
ئەنگوشتەریێ د وە ئەڤانە
ئینانە مە ئەو ژ بۆ نیشانە
هون هەلگرن و بدن نگینان
بەدنام مەکن ستی یو زینان
ئەز قاصید و هوون ژ بۆ مە مەقصوود
هوون من مەکن ئەی موراد مەردوود
ئەڤ موژدە ئەوان دەما کرن گوش
یەکجاری ژ شاهیان نەما هوش
هشیار کو بوون دەمەک نەوەسطان
فیلحال بەزینە پێ و دەستان
تەکرار ل دەست و پێ و داوان
صەد بوسە ددان ئەوان دوو لاوان

* بیمار: نەخۆش * بەدحاڵ: خراپحاڵ، حاڵ شڕ * ناگەهـ: لەپڕ * زاڵ: پیرەژن * قامەت: بەژن * چڤیا: کۆمەوەبوو * هیلال: هیڤک، مانگی یەکشەوە * ناهیستە: بەسپایی، هێدیکا * کەلام: پەیڤ * دلارام: هێورادلی * ناکام: بێ مراد * مەحضەن: تەنیا و تەنیا * مەخصووص: نەخوازا * خوەش: چاک * بەدنام: ناوزڕاو * مەردوود: دەرکراو * دەما: وەختێ * کرن گوش: بهیستن * شاهی: شادی و کەیف * تەکرار: چەندپاتە * داو: دامێن، داوێن * بوسە: ماچ

داین حەیری ژ ئیشتیاقێ
بەردا گریێ ژ ئیفتراقێ
گۆ غەم مەخون ئەی مراد و مەقصوود
مزگین ژ وەڕا ب حەققێ مەعبوود
تەوفیق رەفیق بت ژ باری
ئەز دێ وە بکم بسیحر کاری
هون جوملە ل عەردەکی جەمابن
هەرچار ب مەقصەدا خوە شابن
نام و نەسەبا خوە هون عەیان کن
سیرا دلێ بۆ مەڕا بەیان کن
دا ئەز ڤەگەڕم ب ڤان نگینان
تەسخیر بکم ستی یو زینان
تەعجیل بکم ژ بۆ ثەوابێ
زو بێمەڤە ئەز دگەل جەوابێ
تاجدینێ نگین ژ دەست دەرانی
دا دەستێ عەجوزەیا زەمانی
مەم تێ فکری کو بێ نگینێ
کەنگێ دکەتن موراد و ژینێ؟
گۆ دایە تو من بدێرە مەعذوور
کێ جانی ددست ژ دەست خوە دەستوور
ئەڤ خاتەمە ئیسمە گەر طەلیسمە
من جان ئەوە قالبێ مە جیسمە
ئەی دایە تو قاصیدی حەبیبی
بێ شوبهە ل دەردێ من طەبیبی
صەدقەی سەرێ ذیلجەمالێ زینێ
مەستینە ژ دەستێ من نگینێ

* ئیشتیاق: ئارەزوو * ئیفتیراق: جیایی و دووری * مەعبوود: خودێ * تەوفیق: بەمەبەست گەیشتن، تۆفیق * رەفیق: هەڤاڵ * باری: خودێ * سیحرکاری: جادووگەری * هون: ئەنگۆ، هنگ * جوملە: هەموو * عەرد: هەرد * جەما: کۆم * شابن: شادبن * عەیان: دیاری، ئاشکەر * تەسخیر: بەردەست * تەعجیل: پەلە، لەز * ثەواب: خێر * جەواب: بەرسڤ، وەرام * مودار: مدارا، گوزەران * بدێرە: بکە * مەعذوور: بەخشراو، مەعاف * دەستوور: مەرمخەسی * قالب: بەدەن، جیسم، لەش * صەدقە: صەدەقە، خێر * ذیلجەمال: ذولجمال: خاوەن جوانی

گــــاڤـــا تو دچیـــڤــــه ئەی وەفــــادار
ئەڤ رەنگه ژمـن ببـــــێـــــژه دلدار
ئەو شـــاهه ئەگـــەرچی ئەز گـــەدامـــه
ئەلطافێ شــــەهـەنشــــەهانه عــــامـــه
ئـەز بـەنـده نـەلایـقـێ ویـصـــــــــالـم
خــــورســـــەنده بصــــورەتێ خــــەیالـم
راضـیــمـــه ژ ئەو قـــەدەر جــەمـــالێ
من بینتــــه خـــــەلوەتا خـــــەیالێ
هــەرگــــــــاه ژ ئـاهــێ دل بـطـرسـت
گـــــەهگاه ژ حــــالێ من بپــــرست

* گەدا: پارسەک * ئەلطاف: ئیلتیفات، روحم و دلۆڤـانی * شــەهـەنشــەهانە: پادشایانە * عامە: هـەمووانییە * بەندە: بەنی، کۆلە، خـولام * لایق: شـیـاو * ویصــال: پێک گــەین * خــورســەند: کەیفخۆش و رازی * صـورەت: وێنە * خـەلوەت: جێگەی تەنیـایی * هەرگاه: هـەرگـاڤ، هـەردەم * ئاه: هـەناســەی ســـارد * طرس: ترس * گـــەهگاه: جارجار

## چاڤ نهێری

ئەو هەردوو نیهالێ عەرعەرا شەنگ
رونیشتی میثالێ غونچە دلتەنگ
چڤیایی ب فکر و سەر نشێڤی
هەر لەحظە ژ دایەیێ بهێڤی
مەخمووریێ غەبووقێ بێ نیهایەت
موشتاقێ صەبووحێ بوون ب غایەت
دیتن کو ژ ناگەهی طەبیبە
وێ هاتی ب صوورەتەک عەجیبە
زین و ستیا ژ عیشق مەدهوش
وان دایە کرن رەوان دەراغوش
گۆتن ب خودێ کی ئەی دلارام
ئایا تە کرینە ئەو مەلەک رام
رەملا تە چ گۆ پەری تە زانین؟
یان هەردوو دشووشەیێ تە ئانین؟
تێرا ل مە کون کری سوێدا
ئایا تە نەزانی ئەو کێ لێ دا
وێ گۆ ب سەرێ وەیێ مووبارەک
صەد جاری قەسەم دکم نە جارەک
ئەز هاتمە ڤێ دەمێ ژ با وان
ئەمما گونەها م تێ ب لاوان
هەردەم کو ستی یو زین دبێژن
صەد رەنگی سرشکێ خون درێژن
قوربانێ وەبم ب ڤێ کەمالێ
ئەو هەردوو بەشەر ب وێ جەمالێ

* نیهال: نەمام * عەرعەر: دارێکی جوان و راستە * شەنگ: شۆخ * میثال: وەکو * چڤیایی: چەماوە * سەرنشێڤی: سەرداخستوو * لەحظە: دەم، تاو * مەخموور: خومار * غەبوق: شەرابێ کە لەشەودا دەخورێتەوە* صەبوح: شەرابێ کە بەیانی دەیان خواردەوە * بێ نیهایەت: بێ برانەوە * بەغایەت: یەکجار زۆر * رەوان: بەپەلە * دەراغوش: لەباوەش * ئایا: ئاخۆ، داخۆ* رام: کەدی، کەوی، حەمایەت * سوێدا: سوەیدا: ناوەندی دل * مووبارەک: پیرۆز * قەسەم دکم: سوندێ دخوم * سرشک: رۆندک * کەمال: بێ کەمایەتی

چاوا وه بژارن ئەو دوو ممتاز
زیبەندەیێ وەصلن ئەو سەرئەفراز
وەڵلاهی قەسەم دکم ب باری
ئەو هەردوو دوڕێ د وه بژاری
نابن د چو بەڕ و بەحر و کانان
نینن وه مەلەک د ئاسمانان
ئەو هەردوو ژ بۆ وەڕا سزانە
میرزانە ئەگەر وەگەر گەدانە
ئەو دەللە ب دل وه بوویە دەلال
دلدادە ژ پێشڤە مان دەمەک لال
زین و ستیان نەمان ژ بۆ هۆش
گاڤا کو ئەوان کر ئەو خەبەر گۆش
ئەلقیصصە ژ کونهێ ماجەرایێ
هشیاری کو دایەیێ ددایێ
ئاگر تە دگۆ گیهاندە نەفتێ
پێت ژێ دچوو ئاسمانێ هەفتێ
عیشق ئاگرە تەن چیایێ طوورە
دل ئەو شەجەرا ب نار و نوورە
میشکاتە قەفەص قەبەس چرایە
جان زەیتە، فتیلە وی خەفایە
دل شووشەیە ئەو چرا د ناڤە
سیڕ جوزئە دکوللێدا بەلاڤە
بیلکول ژ سەری حەتتا ب ئەقدام
صۆهتن بوی ئاگری دلارام
گۆتن ژمەرا تو دلنەوازی
ئەی دایە ژ بۆ مە چارەسازی

* مومتاز: هەرەباش * زیبەندە: شیاو * سەرئەفراز: سەربڵند * چو: هیچ * بەڕ: بەژ: وشکانی * بەحر: دەریا، زەریا * کان: کانگە * سزا: شیاو * دەللال: شارەزاکەر * دلدادە: عاشق، دڵبەخشیو * لال: بێ زمان، لاڵەپەتە * کونهی: نووک و بەدوڕاستی رووداو * ماجەرا: رووداو * پێت: بڵێسە * ئاسمانێ هەفتێ: حەوتەمین عاسمان * تەن: لەش * شەجەر: دار * نار: ئاگر * نوور: رووناکی * میشکات: دەلاقە، تاقە * قەفەص: رکە * قەبەس: چرووسک * زەیت: رۆن * فتیلە: پڵیتە * خەفا: نادیار * جوزء: پاژ * کول: گشت * بیلکول "بالکل": بەتێکڕایی * ئەقدام: کۆی قەدەم، پا، پێ * دلنەواز: دڵ لاوێنەوە * چارەساز: کارپێک هێنەر

دیهـــقـــان توی ئـەم وەکـی نیـــهـــالـین
ئەزمـــان تـویـی ئـەم ب خـــوە د لالین
گــەر لحظەیەکی نەکی تو گــوفــتــار
گـەر سـاعـەتـەکی نەبی تـو غـەمـخـوار
ئەم دێ وەکــو خــار و خـــەس هەبا بن
ئـەم دێ وەکـــــو بەرگـێ بـەر هـەوابن
ئـەی واقـــیـــفـێ واقـــیـــعـــاتـێ دێرین
ئەم غـــەیرێ تە مــەحـــرەمـــان نەدێرین
تـاجـــدین دگــــەل مــــەمـێ تـەگــــۆتـی
پەروانـەنـە پـەڕ ل وان مـــــەصــــۆتـی
ئـەو ژی نـوهـە پـر د ئـیـنـتــــــیـظارن
بـەلـکـی ژ مــــــــە زێـدەتـر نـەچـارن
رابـە هـەرە زوو ببـــێـــــژە تـاجــــدین
گـــەردێ تە ســتی بڤێ مــەمێ زین
مـــزگین ژ وەڕا مـــە هـوون قـــەبوولـن
ئـەم ژی ژ وە زێـدەتـر مـــــــــەلوولـن
عـــیـــشـــقـــا وە جـــەلەو ژمـــە رەڤـــایە
مــــانیع ل مــــە پـەردەیا حــــەیایە
ئـەو پـەردە ژبـۆ وەرا عـــــــــەدیمـە
بـێ پـەردەیـی بـۆ وەڕا قــــــــەدیمـە
خـــوازگین و وەســــایط و وەســـــیلە
هـەرچی کـــو ژ با وە بێن جـــەمـــیلە
ئەڤـــڕەنگە ببـێـــژە وان حـــەبیـــبـان
مـەجـمـووعێ مـەوالی یو خـەطیـبـان
هـنـدەک ژوەرا بـبن رەجـــــــــاچی
هـنـدەک ژ مـــــەرا بـبن دوعـــــــاچی
بـەلکی کـــربت خـــودێ مـــوقـــەددەر
وەصــــلا مـــە و وە ببت مـویـەســـــەر

* دیهـقـان: وەرزێر، باغەوان * نیـهـال: نەمام * ئەزمـان: زمـان * غـەمـخـوار: مشورخـۆر * خار و خەس: درک و داڵ * هـەبا: تۆزی زۆر ورد و نـەرم * بـەرگ: گەڵا، مـەبەست خەزەڵە * بەرهـەوا: بەربا * واقیف: هایدار * واقیعات: رووداوان * دێرین: لەمێژینە * مەحرەم: هاوڕاز * نەدێرین: نیمانە * پەروانە: پەپووله، منمنۆک * نوهـە: نهـۆ، ئێستا * ئینتیظار: چاڤـــڕێ، چاوەڕوان * نەچارن: ناعیلاج و بێچارەن * مەلوول: خەمبار و جاڕز * جەلەو: هەڤسار * رەڤایە: رفاندووە * حەیا: شەرم * عەدیمە: نییە * قەدیم: مێژینە * خوازگین: خوازبێنیکەر* وەسایط: بۆنە و هۆیان * وەسیلە: ئەسباب * جەمیل: پەسند * مەوالی: دۆستان * خەطیب: خوتبەخوێن، قسەبێژ، وتاربێژ * رەجاچی: تکاکار * دوعاچی: نزاگۆ * کربت خودی موقەدەر: خوا لە بەرێوە بڕیاری دابێ * مویەسسەر: پێکهاتوو، بەهاسانی پێکهاتن

## خوازگینی

خوەش وەقتە ژ بۆ عەلیلێ موشتاق
خاصما کو ژ بو قەبیلێ عوششاق
دەرمانەکی صیحەحەت و شیفایێ
مزگین و بەشارەتا وەفایێ
ناگەه بگەهیتە وان ژ دوڕدان
ئازاد بکەت ئەوان ژ دەردان
ئەودایە ژ رەنگ ئەرەسطەطالیس
سەر تا ب قەدەم لیباسێ تەلبیس
دیسان کەتە صورەتێ طەبیبان
حاضر خوە کەیاندە نک حەبیبان
ئەو موژدە وەکی مە گۆتی گۆتن
ئەو صۆتی وەکی نەصۆتی صۆتن
ئەمما ب وی ئاگری وەگەش بوون
تە دگۆ قە نەخوەش نەبوون دخوەش بوون
گۆیا کو ئەوان ژ دەست فەلاطوون
خوارن ب یەقین دەوا و مەعجوون
رابوونەڤە چوونە نک هەڤالان
چەندەک ژ مەحاریم و روالان
ئاگاهی کرن ژ ماجەرایی
رابوون ب تەعەصصوب و تەبایی
گاڤا کو ئەوان بهیست مزگین
هایدان بتەبایی خەلق و خواگین

* عەلیل: نەخۆش * موشتاق: بەهێڤی * خاصما: نەخوازە، بەتایبەتی * قەبیل: کۆمەڵ، بەرە * عوششاق: ئەڤینداران * صیحەحەت: ساغی، شیفا، مەفا * بەشارەت: مژدە * ناگەه: ژنشکاف * ئازاد: ئازا، رزگار * ئەرەسطەطالیس: ئەرەسطۆ، عارەسو: پیتۆلی بەناوبانگی یۆنانی * تەلبیس: نەڕاست و فێلاوی* حاضر: دەستبەجێ * قە: هەرگیز * خۆش: ساغ، دڵشاد * مەعجوون: دەرمانی تێک هەڵشێلدراو، ماجووم * مەحاریم: کۆی مەحرەم: هاوڕاز * ماجەرا: سەرگوروشتە * تەعەصصوب: لاگیریکردنی توند و تۆخ * تەبایی: ئاشتی و هاوتایی * هایدان: خەبەریان دا * ب تەبایی: بە تێکڕایی * عولەما: زانایان * عادل: کەسێ کە بۆ شایەتی دەشێ * ئومەرا: ئەمیران * جاهیل: نەخۆندی * جاهیل: جحێڵ، لاو

هندەک عـــولەمـــا و هن د عـــادل
هندەک ئومـــەرا و هن د جـــاهل
رابوونە ڤـە جـوملە چوونە نک مـیـر
ئەڤ رەنگە کـرن قـەضـیـیـە تەقـریر
کـەی والـیـیێ مـولک و مـال و مـیللەت
وەی حـــامـیـیێ داد و دین و دەولەت
تو ســـایەیێ لوطفێ کـــردگـــاری
ئیـــرۆ ل مـــە شـــاه و خـــوندکـــاری
شـــاهی نەظەرا تە کـــیـــمـــیـــایە
مـــاهی ئەثەرا تە پڕ ضـــیـــایە
هەرچی تە ڤـەخـــۆندی ئەڤ عـــەزیزە
هەرچی تە نەخـــۆندی بێ تەمـــیـــزە
هەرچی تـە کـــرە چراغ و گـــەش کـــر
گەر حـال خـەرابە ژی تە خـوەش کـر
تاجـــدین ئەگـــەر چی مـــیـــرزایە
نیـــســـبـــەت ب تە بەندەیە گـــەدایە
هـاتـن کـــو بکن ژ دل دوعـــــایێ
فـــیلجـــوملە دکن ژ تە رەجـــایێ
تاجـــدین ســـتـــیـــیێ ژ تە دخـــوازت
ئەو قـــول ب چەراغـــیـــیێ د نازت
ئـەوبـەنـدەیە وی بـگـێـــــــرە ئازاد
زیبـــــەندەیە وی بدێرە دامـــــاد
مـــیـــر گـــۆ کـــو هەچی وەدیتی لایق
ئەلبـــەتتـــە ژ بۆ مـــەرایە فـــایق
هەرچی کـــو وەکـــیلە بێت و روونت
مـەولا کـیـیـە؟ خـوطبـەیێ بخـوونت

* قەضـیـیـە: مەسـەلە * تەقـریر: باس، بەیان * کەی: کەهۆی * والی: خاوەن * حـــامی: پارێزەر * داد: عـــەدالەت * سایە: سێبەر * لوطف: چاکە و دلۆڤانی * کردگار: خودێ * نەظەر: تەماشا * کیـمـیا: مس بەزێڕکەر * ئەثەر: شوێن کـردەوە * ضـیـا: رۆشنی * ڤـەخـۆندن: بەسـەر کردنەوە * عەزیز: بەڕێز و قەدر * تەمـیـز: فـەرق و جـودایی * بەندە: بەنی، کۆلە * گەدا: پارسـەک * هاتن: هـاتووین * رەجـــا: تکا * چەراغی: خـزمـایەتی لە ژنەوە* دنازت: شـانازی دەکا * قول: کۆلە، کۆیلە، بەنی* وەکیل: بریکار * مـەولا: مەلا * خـوطبـە: وتار بۆ مارەبڕانە * عەقد: گرێدان، مارەکردن * ئیجاب: بەجێ

عەقدا ستییێ مە کر ل تاجدین
ئیجابە ئەڤە قەبوولە ئامین
فیلحال "چەکۆ" بەزی یو پیێ میر
تەقبیل کر و قەبوولێ تەقریر
مەجموعێ مەلا و شێخ و میران
ئاغا و ئەکابیر و فەقیران
ڤێکرا ب دەڤێ خوە وان ثەنا کر
تێکدا ب دلێ خوە وان دووعا کر
میر گۆ بقوتن دەف و رەبابان
بینن هەمی شەربەت و شەرابان
دا بەزمەکە شادیمانە دانین
ئیرۆهە کو صوبحە ئەم نزانین
دێ شبهەتی ڤێ دەمێ دخوەش بین
یا دێ بمرین وەیا نەخۆش بین؟
حوبلایە لەیالی ئەی مەوالی
کانێ چ دەزێن عەلەتتەوالی؟
ئەڤ شیوەن و شاهی تەوئەمانن
ئەڤ چەرخ و فەلەک دبێ ئەمانن
گەه نوور نومانە گاه مەظلەم
گەه سورنومانە گاه ماتەم
گاڤا کو دبینی وەقتێ عوشرەت
دافەوت نەکی زەمانێ فورصەت
لەورا کو زەمان میثالێ شیرە
نابێژیتن ئەڤ مەلایە میرە
ئیرۆهە ژ بۆ رەضایێ تاجدین
من ژی ژ خوە عەد بکن ب خوازگین

* قەبوول: قبووڵ * بەزی: غاری دا * تەقبیل: ماچ * مەجمووع: جڤات * ئەکابیر: گرە گرە * فەقیر: هەژار * ثەنا: پەسندان * دوعا: نزا * بقوتن: بکوتن * بەزم: هەنگ * شادیمانە: بەخۆشی * صوبح: بەیانی * حوبلا: زکپڕ * لەیالی: شەوان * مەوالی: دۆستان * عەلەتتەوالی "علی التوالي": بەشوێن یەکتردا، لە دووهەڤ * شیوەن: شین * شاهی: داوەت، شایی * تەوئەم: جمک، دووانە * چەرخ: خول، زەمان * بێ ئەمان: بێ دەرەتان * گەه: جار * نورنوما: رووناکیدەر * مەظلەم: جێ تاریکی * سوور: بەزم و ئاهەنگ * ماتەم: ئازیەتباری * عوشرەت: خۆش رابواردن * فورصەت: دەرفەت * فەوت نەکی: لەدەست نەدەی * میثال: وەکو * رەضا: رازیبوون * عەد: حیساب * غولام: خزمەتکار، خولام * فەنا بوو: لەناو چوو

ئەڤ چەندە زەمانە ئەو غولامە
دایم د غولامییێ تەمامە
ئەو هندە دخزمەتا مەدا بوو
عومرێ وی د بەر مەدا فەنابوو
شەرطە د شەریعەتا وەفایێ
ئەم ژی ژویرا بخوون جەفایی
ئیروەه د خزمەتا وی رابین
بیذذات د خذمەتا ویدا بین
میرێ وەهە کێ بتن کوجانی
شاباش نەدتێ ب شادمانی
گەر من هەبتن هەزار و یەک سەر
وان جوملە ب رۆژەکی ب دەفتەر
گەر ئەز نەکرم فیدا ب جارەک
میرینی ل من نەبت موبارەک
تاجدین کو د خذمەتا ئەمیر بوو
چەشناوی ددەست و چاشنی گیر بوو
ئەلقیصصە ب شەوکەتا خوە ئەو میر
رابو ب خوە بوویە چاشنی گیر
کێشا وی ب مەجلیسا خوە خوانەک
گۆیا کرە فەرش ئاسمانەک
قورصێ مەه و میهرێ ئاسمانی
ئانین تەد گۆ جایێ نانی
ئەڤ لەنگەرییێد زیڤ و زێرین
شبهەت فەلەکێد زۆر و ژێرین
هەر صەحنێ مەزن میثالێ بورجەک
سەرپۆشێ ل سەر ژرەنگێ دورجەک

* شەریعەت: رێوشوێن * جەفا: زەحمەت * بیذذات "بالذات": هەر خودێ خۆ * فیدا: گۆری، قوربان * میرێنی: میرایەتی، سەرداری * موبارەک: پیرۆز * چەشن، چاشنی: لای شا و خان و گەورە پیاوان کەسێک کە زۆر نۆکەرێکی باوەڕ پێکراوە لەو خواردنەی دێتە دیوان لە هەریەکی کەمێک دەچێژێ نەوەک دەرمانی خراپی تێ کرابێ، بەو کابرایە دەڵێن چاشنیگیر و بەو کەوچکەی پێیەتی دەڵێن چەشنی... چاشنی چەشن: چاشنی: چێژە * شەوکەت: شکۆ * مەجلیس: کۆڕ * خوان: سفرە * فەرش: رایەخ * قورص: کولێرە * مەه: هیڤ * میهر: خۆر * بەجایی: لە باتی، لە بری * لەنگەری: قاپی قووڵ و گوشاد * صەحن: صەحەند، قاپی شیو تێکردنێ * بورج: قۆنگرەی قەڵا * دورج: صندووق * تەبسی: ئامانی زەلامی لالێو هەڵگەڕاوە * کاسە: زەرک * کاسە ئێد فەغفوور: زەرکن چینی * ئەختەر: ئەستێرە * ضیاء: رووناکی

## بناشتێ خانی ب قەلەمێ خوەڕا

ئەی راکیبێ واقیعێ پیادە
وەی عاشقێ صەفحەیێ د سادە
ئەی شاعیرێ صاغیر و نگون سەر
وەی ساحیرێ ساخیر و فسوونگەر
ئەی هایمێ وادیێ ضەلالێ
وەی غاوییێ دەعوەتا کەمالێ
ئەی خامەیێ سەرتەراشێ بەدڕەنگ
بەس نامەیێ خوەش قوماشێ خوەشڕەنگ
رووڕەش کە ب ناڤێ خەطط و خالان
بەد نام بکە ب بێ و دالان
هندی وەکو خەط غوبار و هوورە
ئەو خەط ژ لەگافەتێ نەدوورە
گاڤا کو ژ رەنگێ مەشقێ پڕ بوو
یا شبهەتێ نەسخ و ثولثێ گر بوو
ئەو ناسیخێ نوسخەیا جەمالە
بێ رەونەق و روهنی یو کەمالە
لازم ئەو دلبەرێ د سادە
خەط لێ نەبتن وەکی قەلادە
خوەش زینەتە خەط ل ماهێ روخسار
هندی ل روویان نەبویە هەڤسار
ئەی خامە تەژی گەلەک درێژ کر
ئەڤ نامە بەسە تە پڕ قرێژ کر

* راکیب: سوار * واقیعی: لە ڕاستیدا * واقیع: کەوتوو * صەفحە: رووکار، رووپەل * شاعیر: خاوەن هەست * صاغیر: زەلیل و زەبوون * نگون سەر: نخوون سەر، سەرنخوون * ساحیر: جادووگەر * ساخیر: گاڵتەکەر، تیزکار * فسونگەر: سحرباز * هایم: بەرهەڵدای بێ خاوەن * وادی: گەلی، شیو، نواڵ * ضەلال: ئاڤارێیی، گومڕایی * غاوی: هەڵەی نەزان * دەعوە: ئیدیعا، داوا * خامە: قەڵەم * سەرتەراش: سەرتاشراو * بەدرەنگ: ناحەز، کرێت * خۆش قوماش: پارچە جوان * خەت و خاڵ: نیشان و مووی سەر روو * بەدنام: ناوزڕاو * بێ و دال: ب، د. پێکەوە دەبنە بد... واتا خراب * غوبار: تۆز * خەتی غوبار: شێوە خەتێکی ورد و جوانە * لەطافەت: نەرمی و جوانی * مەشق: لەبەر نووسینەوەی منالان کە تازە فێرە نووسین دەبن * نەسخ: ثولث: هەریەک لەو دووانە شێوە خەتن * گڕ: درشت * ناسیخ: کوژێنەوە، لەبەینبەر * نوسخە: نووسراوەوە * دلبەر: جوانی دڵڕفێن * سادە: بێ ریش و سمێڵ * قەلادە: گەردانە، رستە * زینەت: جوانی، خشڵ * ماه: هیڤ * روخسار: روو * هەفسار: هەوسار * قرێژ: چەپەڵ، چڵکن

هەرچەندی کەلام شبهێ دوڕ بت
بێ قەدر دبت، دەما کو پڕ بت
نابینی ب قیمەتن جەواهیر
لەورا کو د هندکن د نادیر
سەهو و غەلەط و خەطا و نیسیان
مەجمووعەیێ ناپەسەندێ عیصیان
تەحریر کرن تە بێ تەئەممول
کێ دی بکەتن ژ تە تەحەممول
کەس نینە بکەت ژ بۆ تە تەحسین
گوێندەیێ ئافەرین و نەفرین
ئەی بێ ئەدەبا خرابە بێ عار
گوستاخ و ستەمگەر و سیەهکار
هندی کو سەرێ تە من قەلەم کر
ئەو چەند تە خەطی خەطا رەقەم کر
هندی کو سەرێ تە من تەراشی
ئەو چەند تەکر گونەه تەلاشی
فەحاشی تە کر ب رەنگێ "خانی"
نەققاشی تەکر میثالێ "مانی"
مەشغوولی بەسە ب لەعب و لەهوان
تۆبا خوە بکە ژ خەطیٔ و سەهوان
جارەک وەرە سەر طەریقێ تۆبە
هندی نەگەهیشتیە تە نۆبە
نۆبەت کو گەهیشت تە خەصم خامە
طەی کر ل مە ئەڤ نزاع نامە
وێ بەطلێ دلاوەرێ زەبەردەست
ئەووەل کەمەرا تەهەووری بەست

* کەلام: پەیف * دوڕ: مرواریی درشت
* پڕ: زۆر، زەحف، زاف * قیمەت: نرخ،
بەها، بایی * هندک: کەم * نادیر: کەم
وێنە * سەهو: هەڵە، غەلەط، نەڕاست *
خەطا: سووچ * نیسیان: لە بیر کرن *
ناپەسەند: نەهێژا * عیصیان: گوناح *
تەحریر: نووسین * تەئەممول:
بیرکردنەوە، رامان * تەحەممول:
تاقەتی قبوول کردن * تەحسین:
ئافەریم، پەسن * نەفرین: خراپە گوتن،
تووک لێکردن * گوستاخ: رووقایم *
ستەمگەر: زاڵم * سیەهکار: رەشکار،
کار خراب * قەلەم کرن: پەڕاندن *
خەطا: هەڵە * رەقەم: نووسین *
فەحاش: جنێو فرۆش، قسەی نالەبار
بێژ * نەققاش: وێنەکێش، رەنگرێژ *
مانی: پێغەمبەری وێنەکێشی قەدیمی *
لەعب: گاڵتە * لەهو: گەمەی بێ تام *
تۆبە: گەڕانەوە * خەطێ: هەڵە * سەهو:
لە بیرکرن * طەریق: رێگە * نۆبە: نۆرە
* خەصم: دوژمن * خامە: قەڵەم *
طەی: پێچانەوە، لوولدان * نزاع: کێشە
* بەطل: پاڵەوان * دلاوەر: نەترس *
زەبەردەست: باڵادەست * کەمەر:
پشتێند * تەهەوور: هاروهاجی

بو راکێبێ دولدولێ ئەنامیل
دەرحال دگەل مە بو موقابیل
کێشا ژ زەبانێ ذول فەقارەک
بو خەصم دگەل مە شەهسەوارەک
سل بو رکێیا ژوان عیتابان
ئەزمان گەرییا ب ڤان جەوابان
گۆ ئەحمەد ئەگەر تو نەی خەبیثی
هەرچی کو تە گۆت من ئەو نڤیسی
قەولێ د تە قەنج ئەگەر خرابن
فیعلێد تە خەطا ئەگەر صەوابن
ئەی بەد عەمەلۆ تو قەنج دزانی
تۆ قایل و فاعیل و خودانی
نەی بووم و دعالەما نەییستان
مەی بووم نە ب دەستێ مەی پەرستان
گافا کو تە ئەز بریم ژ سازی
نە دەنگ د من هەبوو نەگازی
تەدوور کرم ژ نک هەڤالان
مەهجوور کرم ژ ملک و مالان
بەند و وەصلێ دمن سەرا بوون
ئەووەل تە کرن ب ئەمرێ کون کون
پاشێ کو تە کر د باغێ عیشقێ
کون کر دلێ من ب داغێ عیشقێ
تە پف کرە جیسمێ من دەما جان
هاتن ژ دلێ من ئاه و ئەفغان
نەفخا تە ل من دل و جەگەر صۆت
هەرچی کو تە پف کری من ئەو گۆت

* راکێب: سوار * دولدول: ناوی ئێسترێکە کە ئیمام عەلی سواری دەبوو * ئەنامل: کۆی ئەنمولە: سەرپەنجە، گەی سەری تبل * دەرحال: دەسبەجێ * موقابیل: بەرانبەر * زەبان: زمان * ذولفەقار: دوخدار * "ذوالفقار": ناوی شمشێرێک بووە بە قەدی ئیمام عەلییەوە * شەهسوار: شاسوار، شۆڕەسوار. سل: تووڕە * رکێیا: رقی هەستا، لە رکەوە چوو * عیتاب: سەرکۆنە * ئەزمان: زمان * جەواب: بەرسڤ * خەبیث: پیس * قەول: پەیڤ * فیعل: کردە * خەطا: هەڵە * صەواب: چاک و راست * بەدعەمەل: کار خراب * قایل: بێژەر * فاعیل: کارا * خودان: خاوەن * نەی: قامیش، قامووش، چیتک، زەل * عالەم: دنیا * نەییستان: قامیشەلێن، قامیشەڵان * مەی: شەراب * کو تە ئەز بریم: کە تۆ منت بری * سازی: ساز و تەیاری * سازی: زەڵەک، قامیشەلێن * مەهجوور: دوور * بەند: گرێ * وەصل: قەف، گەو * سەرابوون: سەرەوبن، سەرنخوون * ئەمر: فەرمان * کون: ببە: کون: قول، کونا * پف: فوو * جیسم: لەش * دەم: فوو، هەناسە * نەفخ: پف

ئەز لالم و بێ زەبان و خـــــامـــــووش
بێ نەفس و نەفەس ژ قیسمێ قامووش
بەزمـــا طەرەبێ ب من تە خـــوش کـــر
دیوانی گـــونەهـ ب من تە رەش کـــر
هەرچەند کــــو طاهیـــــری هەیم ئەز
ســـــــازەندە تویی وەکی نەیم ئەز
مـــا نەی ب خـوە تشــتــەکێ دبێــژت؟
خـــامــە ب خـوە رەشــحــەکێ درێژت؟
کــاتیب قــەلەمێ دکــەت ســیــەهکار
ســـــازەندەیە نەی ژ دەست ب هاوار
نای و قـــەلەم و کـــیـــتـــاب و نیـــشـــان
تیـر و هەدەف و کـــەمـــان و کـــێـــشـــان
مـــەحکوم و عـــەلەیهی بوون ب تەقـــدیر
هێژ ئیسمێ گونەهـ نەبوویی تەسطیر
یـارەب تـو دزانـی خــــــــانـیـێ ژار
تەشــبــیــهـ ب خـــامـــەیا گـــرفـــتـــار
قـــەلبێ وی د دەست تەدایە ئەلحـــەق
دەستێ وی د دەست خوە نینە موطلەق
گـــافـــا کـــو ل وی تە ســـەر قـــەلەم کـــر
هەرچی تە ئیـــرادە کـــر رەقـــەم کـــر
ئامـیـر تـوی ئەو ب ئەمـرێ مـەئمـوور
مـــەئمـــوور دبن هەمـــیـــشـــە مـــەعـــذوور
گـــەر دایـیـــە وی تە ئیـخـتـیـــارەک
ئەو ژی وی ســـپـــارە تە ب جـــارەک
پەیوەســـتـە د دەست تەســـەر قەدەم بوو
ئەو گـــەر عـــەلەم و ئەگـــەر قـــەلەم بوو

* خاموش: کڕ، بێدەنگ * نەفس: گیان * نەفـەس: هەناسـە * قـیـسم: بەش * قـاموش: زەل، چیتک، چیت، قـامیش * طەرەب: خـــۆشی و شـــایی * دیوان: کـــتـــێبی شـــیـــعـــران * هەیم: هەم * سـازەندە: سـازلێدەر، سازکـەر * نەی: بلور، بلوێر * مــا: بۆچی، مـــەگـــەر * رەشـحـە: دەلاندن، دەلاو، تەڕایی کەم * کاتب: نووسەر* سیەهکار: کارڕەش * نـای: بلوێر * قــەلەم: ئالا، خـــامـــە * کیتاب: کتێب، پرتووک * نیشان: کێلک، ئامـانج * نیـشـان: نوخـتـە و خـەت * هەدەف: ئامـانج، نیـشـانە * کـەمـان: کەوان * مـەحکومـو عـەلەیهی "محكوم عليه" حوکم بەسەردا دراو * ب تەقدیر: بە فـەرمـانی خـوا، بڕیاری خـودێ * ئیـسـم: ناو * تەسگیـر: خـەت دران، نووسران * ئەلحەق: بەڕاستی، بێگومان * موطلەق: بەهیچ جۆر* ئیرادە: ویستن * رەقەم: نووسین.
* ئامیر: فەرماندەر * ئەمر: فەرمان * مەئموور: فەرمانبەر * مەعذوور: عوزور قـــبـــوول، جـــێگەی چاو لێ پۆشین * پەیوەستە: هەمیشە * قەدەم: پێ، لاق * عەلەم: ئالا

نەفـع و ضـــەرەرا خـــوە ئەو نزانت
یا قـــەنج ژ بـۆ خـــوەرا چ زانت؟
چاوا کـــو ژ بۆتـەرا رەضـــایـە
ئەو نەی صـیـــفـــەتە وی ئەو هەوایە
وەڵڵا ژ سـفـیـدی یو سـیـاهـی
وی قـەصـد و غـەرەض تویـی ئیـلاهـی
ئەمما ب مـــورەککـەبا قـــەبایح
روو رەش کـرنە گـەلەک صـەفـایح
خەططێ تەیە سەر نویشت و سەرمەشق
سیە سالە خەطێ خەطا دکەت مەشق
لەورا کـو دەمـا ژ غـەیب فـەک بوو
تەئریخ هەزار و شـێـست و یەک بوو
ئیـسـال گـەهیشـتـە چلل و چاران
وی پێشـرەوێ گـوناهکاران
ڤـێکدا ژ مـەناهیـیـان گـەلەک مـال
یەک پول نەهـن ژ حـوسنێ ئەعـمـال
ئەووەل کـو تەدا ژ عیشـقێ مـەطلەع
ئاخـیـر بدە وی تو حـوسنێ مـەقطەع

نەفع: قـازانج، فـایدە * ضـەرەر: زیان * رەضـا: رازیبـوون * هەوا: با * هەوا: ئەڤین * وەڵڵاە: سـوند ب خـودێ سفیدی: سپیایی * سیاهی: رەشایی * قـەصـدا: مـەبەست * غـەرەض: هزری دڵی * ئەمما: بەڵام * مـورەککەب: رەنگی رەش بۆ نووسین * قەبایح: کۆی قەبیح: پیس، خراپ و کرێت * صەفایح: کـۆی صـەفـحـە: لاپەڕ، رووپەڕ * سـەر نویشت: چارەنووس * سەرنویشت: ئەو خەتەی فێرکار بۆ زارۆکانی دەنووسێ تا لەبەری بنووسنەوە * سـەرمـەشق: خەتی مامۆستا بۆ لەبەر نووسینەوە و راهاتن * دەم: وەخت، گـاڤ * غـەیب: نادیار * فەک: جیابوونەوە، هەڵپسان * تەئریخ: مـێـژوو، دیریک، دیرۆک * ئیسال: ئەم ساڵ * پێشرەو: رەم کێش، سەرگەلە * مەناهی: ئەو کارانەی خوا گـوتوویە مـەیکەن، نارەوایان * پول: قـۆشـە * حـوسن: باشی، چاکی * ئەعـمـال: کۆی عـەمـەل * کردە: کـار * ئەووەل: سـەرەتا * مـەطلەع: جـێگەی دەرکـەوتن و سـەرکـەوتن * مـەقطەع: جێگەی برین، برانەوە

بەیاری خوا سەعات نۆ و سی و هەشت دەقیقەی رۆژی یەکشەممەی ٥ گەلاوێژ ١٣٦٥ شەمسی ١٩ ناوجێژنانی ١٤٠٦مـانگی ٢٧ تەمـووز ١٩٨٦ خـاچپەرسـتی لە نووسینەوەی ئەم مەم و زیە بوومەوە. هەژار لە شاری کەرەج.

# سەرەتا

## ١

شاعیری نەمر و بەناوبانگی کورد پیرەمێرد ڕاست دەکا کە دەڵێ: (نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین). میللەتان هەرگیز نامرن، میللەتان هەرگیز ئەستێور و وەجاخ کوێر نابن و شوێنیان کوێر نابێتەوە. کەند و کۆسپ لە ڕێگەی هەموو هۆز و تیرە و بەرە و میللەت و نەتەوەیەکدا بووە و دەشبێت، میللەتان وردە وردە و لەسەرخۆ دەبووژێنەوە و دەگەشێنەوە و بەخۆدا دێن و پێ دەگەن لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا، لە تەنگانە و لێقەوماندا، لە وەختی ژێر دەستی و دیلی و زەبوونیدا، لە تووش هاتنی کەند و کۆسپی نەتەوایەتیدا، کەسانێک هەڵدەکەون کە تیشکی خۆشەویستیی میللەت، نەتەوە دۆستی، هاوخوێن پەرستی، ڕووناکایی جوامێری و پیاوەتی و مرۆڤایەتی، عەشق و ئەوینی بێشکەی باوک و باپیریان، خانە و لانەی خۆیان و کەسوکاریان، مایەی ژین و ژیانیان دەداتە مەغز و مێشکیان، بیریان ڕوون دەکاتەوە، دڵیان دەگەشێنێتەوە ئاسۆی دیمەنگای چاویان هەراو بەرین دەبێنن و بە دڵی وریا و زیندوویان زووتر و زۆرتر هەست بە ئێش و ئۆف و دەرد و ناڵەی میللەتەکەیان دەکەن. مرۆڤایەتی و جوامێری، ویژدان و گەل پەرستی تێن و تاویان دەدا کە بە پەرۆشی وڵات و نیشتمانی خۆیانەوە بن، خەمی گەلی خۆیان بخۆن و بکەونە چارەسەری هۆز و ئاو و خاکیان، لەسەر وڵات و نیشتمانیان بکەنەوە، مافی خوراوی نەتەوەیان بستێننەوە، خەڵک ڕابەری بکەن بۆ ژیانێکی باشتر و دواڕۆژێکی ڕووناکتر.

ئاشکرایە کە پێداویستیی هەر میللەتێک بە پێی ڕۆژگار و ناوچە و مەڵبەند دەگۆڕێت. بەڵام ئەوانەی ئەو ئەرکانەیان گرتووەتە ئەستۆی خۆیان و لە ڕێگای ئاوات و ئارەزووی میللەتەکانیاندا ڕەنجیان داوە و ژیانی خۆیان لە پێناودا ناوە چ سەرکەوتووبن و چ تێ شکا بن نەتەوەکانیان ڕەنج بە خەساریان ناکەن، هەمیشە

لەمەڕ ئەوان ئەمەکدار دەبن و لە کانگای دڵدا جێگەیان دەکەنەوە و هەموو بەرەیەک بەبەرەی پاش خۆیان دەسپێرن. پێشینان چەند جوانیان وتووە: (دڵ ئاگای لە دڵە).

هەروەکو میللەتان لە دڵی ئەو جۆرە پیاوە گەورانەدا حاواونەتەوە، ئەوپیاوانەش لە دڵی نەتەوەکانیاندا دەحەسێنەوە. هەڵکەوتوویی ئەمەیە و هەڵکەوتووش ئەمانن. هەڵکەوتوویش وەکو باوی ژیان و پێداویستی عینسان رەنگاورەنگ و جۆراوجۆرە، دەریای مێژوو پڕە لەم جۆرە گەوهەرانە کە هەر یەک لە بیچمێک و هەر تاکەی لە رەنگێکە.

فەیلەسووفەکانی یۆنان کە خزمەتیان بە زانیاری کردووە، کریستۆف کلۆمب کە ئەمەریکای لە گەرووی ئاودا دۆزیوەتەوە، لنکۆلن و جۆرج واشنگتۆن کە گەلی ئەمەریکایان لە بێگانە و دیلی رزگار کردووە، یان شکسپێر و ڤیکتۆر هوگۆ و دانتی و پۆشکین و مەکسیم گورکی و چیخۆف بە نووکی قەڵەم چاوی دوژمنی گەلیان کوڵیوە، نموونەیێکی بەرز و بەنرخی هەڵکەوتوویین.

میللەتان هەموو لە بنەماڵەی ئینسانن، هیچ نەتەوەیەک لە هۆزێکی کە گەورەتر نییە، رەسەن و نارەسەنی قسەیەکی پڕوپووچە. پێشکەوتوویی و دواکەوتوویی سەبارەت بە رێگە و جێگە و پێوەندیی ئابوورییە کە بووەتە هۆی شارەزایی و دەوڵەمەندی و تێگەیشتن و پێگەیشتن.

ئەو میللەتانەی لە جێگای نەرمان و گەرمێن و بەرێژە و پڕ پیت و بەرەکەت، یان لە قەراخ چەمی گەورە و لەسەر بەندەران و لە پەنای کانگایاندا ژیاون زووتر و زۆرتر بووژاونەتەوە.

ئەمریکا کە ئەمڕۆ خۆی بەسەرگوڵی جیهانی ئابووری دەزانێت چوار پێنج چەرخ لەمەوپێش لەسەر نەخشەی جیهان ناوی نەبووە، یەکەتیی سۆڤیەت(*) کە ئەمڕۆ ئاڵای لەسەر پشتی مانگ هەڵکردووە نیو چەرخ لەمەوپێش لە دەریای چارەڕەشی و نەزانی و دواکەوتوویدا پەلەقاژەی بوو.

کوردیش میللەتێکە لە میللەتان، وەکو نەتەوەکانی دیکەی جیهان لە بنەماڵەی ئینسانە، بە کوێرایی چاوی دیکتاتۆر و کۆنەپەرستەکانی ئێران و تورک و عەرەب

---

(*) یەکەتیی سۆڤیەت: سیستەمی سیاسیی کۆمۆنیزم بوو لە ڕووسیا، ساڵی ١٩٩١ هەڵوەشایەوە.

رەوتی مێژوویی خۆی دەبڕێ و دەگاتە وارگەی بووژانەوە و پێگەیشتن.

نەتەوەی کورد هەرچەند جێگاکەی - کە کوردستانە - کێو و کەژ و سەخت و چڕ و سارد و سڕە و پێوەندیی ئابووری لەگەڵ دنیادا کەم بووە و بەهۆی چاوچنۆکیی ئیستیعمارەوە کوت و پچڕ کراوە دیسان لە زگوزا نەوەستاوەتەوە و ئەستێور و وەجاخ کوێر نەبووە.

بارامی چوبینە کە لە پێش ئیسلامدا خەسرەوی ئیمپراتۆری ئێرانی راو نا و کردی بە ماڵی قەشەدا، سەلاحەدینی ئەیووبی کە رۆژهەڵاتی لە دەستدرێژیی ئەورووپا رزگار کرد و کونە مشکی لە (ریچار شێردڵ)ی ئیمپراتۆری بەریتانیا کرد بە قەیسەری، ئەبو حەنیفەی دینەوەری و ئیبن خەلەکان لە مێژووزانیدا، ئامێدی و شارەزووریی لە رێ و شوێنی ئیسلامدا، ئەحمەدی خانی و مەولەوی و بێسارانی لە جیهانی ئەدەبدا نموونەی بەرز و بەنرخی هەڵکەوتووەکانی کوردن.

لە نزیکتر بدوێین شێخ مەحموود کە بەکوێرایی چاوی ئیستیعمار بانگی حوکومەتی پادشاییی کوردی دا، قازی موحەمەد کە لە کوردستانی بەستراو بە ئێرانەوە ئاڵای کۆماری کوردی هەڵکرد و خوێنی خۆی کردە هەوێن و رشتیە خاکی پاکی مەهابادەوە، مەلا مستەفای بارزانی کە بە بنەماڵە بەربەرەکانیی ئیستیعماری عوسمانی و ئینگلیزیان کردووە و خۆشی بەرەنگاری ئیستیعماری بەریتانیا بوو، لووتی نوری سەعید و فاشیستەکانی تورک و ئێرانی دا لە بەرد و بۆ یەکەمین جار بە شاکارە ستراتیجییەکەی لەمپەر و سنووری ئاسنینی ئیستعمار و نۆکەرەکانی شکاند و چووە یەکەتیی سۆڤیەت، یان لە جیهانی ئەدەبدا پیرەمێرد و بێکەس و حەمدی و کاک هەژاری خۆشمان هەر کامێکیان لە بابەت کاری خۆیانەوە نموونەی هەڵکەوتوویی گەلی کوردن و لەو رۆڵانەن وەجاخی کوردیان رۆشن کردووەتەوە.

٢

ئەحمەدی خانی یەکێکە لەو هەڵکەوتووانە لە دڵی میللەتی کورددا دەژین، لەو رۆڵە بەنرخانەیە وەجاخی کوردی رۆشن کردووەتەوە، لەو ئەستێرە گەشانەیە لە عاسمانی ئەدەبی کوردیدا هەمیشە دەدرەوشێتەوە.

خانی ناوی ئەحمەدە کوڕی ئەلیاسە، لە عێلی خانییانی وڵاتی بایەزید و بۆتانە،

ساڵی ١٦٥٠ لە دایک بووە و لە تەمەنی پەنجا و هەشت ساڵیدا لە بایەزید مردووە و نێژراوە. ئەلیاسی باوکی بە چەند ساڵ پێش لە دایکبوونی ئەحمەد لە بایەزید دانیشتووە، بەڵام پێوەندیی لەگەڵ عێلەکەی خۆیدا هەر بووە. ئەوان لە بایەزید گەورەماڵ بوون. ئەحمەدی خانی لە مزگەوتی مرادیەی بایەزید، لە ئۆرفە و لە ئەخلات و بتلیس خوێندوویەتی و سەری لە میسریش داوە، زانایەکی سەربەدەرەوە و بەناوبانگ بووە.

***

شاکاری ئەحمەدی خانی چیرۆکی مەم و زینە، ئەگەر شاکاری نیزامی گەنجەوی کە لەیلا و مەجنونە پاڵەوانی چیرۆکەکەی عەرەبن و چیرۆکەکەش لە بنەڕەتەوە عەرەبییە، ئەگەر یەکێ لە شاکارەکانی تری کە شیرین و فەرهادە پاڵەوانی چیرۆکەکەی کوردێکە، لە چیرۆکی مەم و زینی ئەحمەدی خانیدا پاڵەوانانی چیرۆکەکەش کوردن و چیرۆکەکەش لە بنەڕەتەوە کوردییە.

مەم و زین ڕەواقی مێشک و شیلەی مەغز و بیری خانییە "ئەو وتارە شیرنانە و ئەو بیرە جۆراوجۆرە پاکی کچی تازەبووک و رووسوورە"، خانی ئەو تەڵای دەستەوشار و ئەو گەنجە بەنرخ و بێ ئەژمارەی لە دەریای بیری هەراو و بەرینی خۆی کۆکردووەتەوە و بە لێزانییەکی هەڵکەوتووانەوە بە هەودای بێ هاوتای هەوریشمی شیعر هۆندوویەتەوە، لە شار و بازاڕی هەندەرانی نەکڕیوە و لە خەزینە و گەنجینەی کەسی نەدزیوە، ڕاست دەکا کە دەڵێ:

ئەم نامە کە خاوە، یان لە باوە
سەد رەنجی لە رێگەدا، دراوە
ساوایە، مناڵە، شیر نەمشتوو
تازە بەرە، تازە پێگەیشتوو
میوەی منە خۆشە بۆی نەماوم
کۆرپەی منە بووەتە چاوی چاوم
خشڵ و جل و یار و زێڕ و زەنبەر
نەمخواستووە هی منن سەروبەر

ئەگەر چیرۆکی مەمی ئالانیش لە پێش ئەحمەدی خانیدا گوترابێت هیچ لە نرخی شاکارەکەی خانی کەم ناکاتەوە، چونکە خانی چیرۆکێکی خەیاڵیی هەڵنەبەستووە، بگرە چیرۆکێکی راستەقینە و رووداوی بەجوانترین خشڵ رازاندووەتەوە و بە شیرینترین شێوە هۆندوویەتەوە. ئەوەتا دەبینین دوای چەند چەرخ تازە لە بازاڕی ئەدەبدا ئەو شتانە پەسەند دەکرێن کە باری راستەقینەی رووداو نیشان بدات، واتە خانی لە سەردەمی خۆیدا و بەسێ چەرخ و نیو لەمەوپێش بە بیری ورد و چاوی تیژ و دڵی رووناکی چیرۆکی ئەمرۆ پەسەندی گوتووە و کاری ئەمرۆی کردووە. سەرەڕای ئەمەش فیردەوسی تووسی دەڵێت: "رۆستەم قارەمانێک بووە لە سیستان من کردوومەتە رۆستەمی داستان". ئایا کەس هەیە بڵێ: چونکە رۆستەم لە پێشا بووە شانامەی فیردەوسی شاکارێکی ئەدەبی نییە؟ یان چونکە چیرۆکی قەیس و لەیلا عەرەبییە و چیرۆکی شیرین و فەرهاد کوردییە، لەیلا و مەجنون و شیرین و فەرهادی نیزامی شاکارنین!

راستە کە ئەحمەدی خانی چیرۆکێکی دڵداری نووسیوە و لەمەدا بە پێی داب و داهاتی کوردەواری بزووتووەتەوە، چونکە نەتەوەی کورد بۆ هەموو جۆرە کارێکی گرنگ چ شەڕ و شۆڕ چ عەشق و دڵداری چیرۆکێکیان لێ گێڕاوەتەوە و پتریش وابووە ئەو چیرۆکانە بە شیعر گوتراون و پێیان گوتووە: "بەیت"، وەکو بەیتی لاسە شۆڕی باڵەکی، ناسر و ماڵ ماڵ، بەیتی دمدم، شێخی سەنعان، خورشید و خاوەر و بەیتی ئەورەحمان پاشای بەبە و... هتد، خانی لە پەسنی پاڵەوانانی چیرۆکەکە و سەریەکخستنەوەی بەسەرهاتەکان و رێکوپێکیی کارەساتەکان و نەرم و نیانیی وشەکان و جوانیی شێوە و خۆشیی راوێژ و تەڕ و پاراویی قسەکاندا، گەیاندوویەتە ئەوپەڕی رەوانی و دادی داوە، بەڵام جگە لەمەش خانی مەبەستێکی گرنگتری بووە و مەم و زینی کردووەتە بەهانە، وەک خۆی ئەڵێ:

دەردی دڵی خـــۆم بێ لەم وتانە
زین و مــــەم، ئەدی چین؟ بەهانە

مەبەستی راستی خانی دەردی دڵ بووە، خانی لەو هەڵکەوتووانە بووە کە زۆر زوو هەستی بە ئێش و ئۆفی نەتەوەکەی خۆی کردووە، ئاوات و ئارەزووی میللەتەکەی

خـۆی بە گـوێچکەی دڵ بیـسـتـووە، کـوت و پچـڕی و دیلی و کـەنەفـتـیی کـورد و کوردەواریی بەوردی سەرنج داوە و گلەیی لە بەختی رەشی کورد دەکات و دەڵێ:

بەدبەخـتـی سـەری لە ئێـمـە داوە

تۆزکـاڵێ کـەمـایەسی نەمـاوە

ئاخـۆ دەبێ روو بکاتە کـەمـبوون؟

یاخـۆ هەر دەبێ بە مـانی گەردوون!

خـانـی سـەردەمـی دەسـتـەڵاتداریی کـوردی بیـر دەکـەوێتـەوە و کـەنەفـتـیی پاش سەربڵندی ئەبینێ و گلەیی لە رۆژگار دەکات و دەڵێ:

رێ و شـوێنی وەهایە چەرخی گەردوون

نەویایەتیـــــیـــــە لە پاش بەرزبوون

خانی ورە بەرنادا و نـاهومێد نابێت و تیشکی هیوا لە دڵی دەدا ئارەزووی مـیللەتی کورد دەردەبڕێ و دەڵێ:

تۆ بڵـێی کـە هەڵێ چ زوو چ دێرێک

بۆ ئێـمـە لە عـاسـمـان سـتـێرێک؟

بەختی مـە لە خەو هەڵستێ جارێک

جـــارێک بکەوێتـــە کـــار و بارێک

خـانـی بە پێی رۆژگـاری خـۆی دەرمـانی دەردی کـوردەواری دەدۆزێتـەوە و داوای پادشـایەک دەکـات کـوردسـتـان بخـاتەوە سـەر یەک و کـوردان سـەربەرز کـات و لە کەساسی رزگاریان کا:

بۆ مـەش کـە هەبایە پادشـایێ

خـوا تانجێکی پێ ببەخشـیایێ

ئێمـەی لە کەسـاسی دەردەهێنا

بێسـتـانی هیـوای وەبەر دەهێنا

مـەغز و مـێشکی خـانی لەو رۆژگـارەدا رەمـەکی نـەبووە، بیـری ئەم پیـاوە لە چاو زەمانی خـۆی سەمەرەیە. خـانی بلیمـەتێکە لەو زەمانەدا پێودان و رێ و شوێن بۆ ئەو

پادشایە دادەنێت کە ئارەزووی دەکات بۆ کوردستان و دەڵێ:

بۆ مەش کە ببایە سەربڵندێک

زۆرزان و بەبیر و مەرد و رەندێک

ئینجا روو دەکاتە پارە و دراوی حکومەتەکەی و وێنەی پادشایەکەی لێ دەدا و دەڵێ:

نەخشێ لە دراوی مەش درابوو

بێ نرخ و چرووک و باو نەمابوو

خانی لە ژێر دەستی تورک و عەجەمان بێزارە و فەرمانبەری بۆ کوردان بەلاوە شەرم و عارە و دەڵێ ئەگەر پادشایەکمان بووبوایە:

تورکان نەدەبوون بەسەرمەدا زاڵ

بۆ کووند نەدەبوونە لانە و ماڵ

چۆن بۆ عەجەمان دەبوونە ژێر دەست؟

ژێر دەستی شتی وەها نەوی و پەست

خانی بیر لە هۆی سەربەرزی و گەورەیی دەکاتەوە و سێ شت دەدۆزێتەوە، یەکیان دلێری و ئازایی، دووەمیان مەردی، سێیەمیان دڵئاوایی و بەخشەندەیی:

ئەم بووکی جیهانە بۆ کورێکە

شیرێکی بەدەست و شێردرێکە

خشڵ و جل و شیرینی و نیشانی

بەخشینە بە بیر و رێگەزانی

پرسیم لە جیهان رەقی لە بەردی

نەرمیت بە چییە؟ گوتی: بە مەردی

خانی کە ئەم ئاکارانە هەموویان لە کورددا دەبینێت و تەماشاش دەکات هەر ژێر دەستن، توورە دەبێت و گلەیی لە چارەنووس دەکات:

دنیا کە وەها بە بەخشش و شیر

بۆ پیاو دەستەمۆ دەبێت و دەسگیر

کورد چۆن دەبێ دیل و چارەڕەش بن
کەی راستە لە خۆشی دوورەبەش بن
دەسـتـــرژدیی ئەمـــانە حـــاتەمـێکە
هەر گــوردێ لەمــانە رۆســتــەمـێکە

خـانی لە تووڕەییـیـەکـەی خـاو دەبێـتـەوە و دێتـەوە سـەرخـۆ، سـەرلـەنوێ بە وردی سەرنجی ژیانی نەتەوەکەی دەدات و هۆی راستیی دیلییەکەیان دەدۆزێتەوە و دەزانێ کـە ئالۆزی و نـاکـۆکـیی ناوخـۆیان و سـەرڕەقـی و دەمـارزلـیـانە، بەلام دلی نـایە رێوڕاست بیلێ و بەشێوەیەکی هێجگار نەرم و مامۆستایانە دەری دەبڕێ:

هێندەی کـە بەجـەرگ و دوورەترسن
کــەمـتــر لە بەیەک گــەیین دەپرسن
کــەس بۆ کــەسێ نابێ چاودەبەر بێ
هەرکـــەس دەیەوێ زل و لەســـەر بێ
لەم سـەرڕەقـیـیـە و دەمـاری زلیـان
بێگانـە دەبـن ســـــواری ملیـــــان

ئەمـجـار خـانی دوامین دەرمـانی دەرد و ئاخـرین چارەی دیلی و ژێر دەسـتی و هۆی رزگاری و سەربەرزی دەدۆزێتەوە و دەلێ:

کـــوردیش کــە ببــایە یەک دڵ و دەست
دەسـتـیـان دەکـەوت ژیانی سـەربەست
پـەیدا دەبـوو باو و گـــــەورەیی و ژیـن
نـاومـــان دەردەکـــرد بـە بیـــر و زانـین

***

وەکو لە پێشـەوە گوتمـان خانی ئەم چیرۆکەی کردووەتە بەهانە بۆ دەربڕینی دەردی دڵی خۆی، خـانی شێوەی ژیان و سـەنگبـاییی مێشک و بیر و ئاکاری مـیـر و بەگ و خانان و مەزنانی ئەو سـەردەمەی باش هەڵسەنگاندووە و زۆر چاکیان تێ گـەیشتووە، زانیویەتی کە پەیدابوونی پادشـایەک و کۆبوونەوەی دەسـتـەلات لە دەست دەوڵەتێکدا بە کـەیفی مـیر و بەگ و خـانان نییـە، تەنانەت ناشـتـوانێ ئارەزووەکـەشی بێ پەردە و

ڕاستەوخۆ دەربڕێت، ناچار بووە ئەم چیرۆکە بهۆنێتەوە و بەناوی سەرەتاوە لەم بابەتەوە بدوێ، جگە لەمەش دەیەوێت مەیگێڕ رژدی نەکات و پیاڵەی بۆ پڕکا و نەپسێنێتەوە و لە پەستا بیداتێ تا کار بکاتە سەر دەروونی و هێزدار بکا دڵەی زەبوونی، لە میر و مەزنان نەترسێ و رازی نهێنیی خۆی دەربڕێ، جا لێرەدا بە شێوەیەکی بەرزی ئەدیبانە دەستی وەشاندووە و بەکوێخا و گزیریان ناو دەبات:

مەیگێڕ لە دەسی مەدە هەلێکە
وەک گیانی نەمر مەیێکی تێکە
کوێخا و گزیر بەلاّن نەزانن
دەرکەین کوڵ و خەم ئەویش لەوانن
سەرخۆش ببم و بەخۆم بنازم
نیازم هەموو ئاشکرا بخوازم

خانی جگە لەوە کە مەترسیی لە میر و مەزنان بووە، لە خوێندەوارانی سەردەمی خۆشی دڵنیا نەبووە، چ بکا چارە چییە و بڵێ چی؟ "کەڵەشێرێکی بێوادە بخوێنێ سەری دەبڕن"، گوڵێکی لە زستاندا بروێ سەرما دەیبات، چیکڵدانەی خەڵک بیروباوەڕی بەرز و بڵندی خانیی هەڵنەگرتووە، ناچار پەنا بە خوا دەبات و دەپاڕێتەوە چیرۆکەکەی نەکەوێتە دەس لاساران و خوێندەوارانیش لێی لە هەرا نەدەن:

خوایە مەدە دەستی پیاوی لاسار
ئەو دڵبەری شۆخ و شەنگ و نازار
پاڕانەوەمە لە خوێندەواران
بێهودە نەکەومە لێو و زاران

خانی پاش ئەوە کە دەزانێ کەس گوێ ناداتە دەردی دڵەکەی، کەس قازانجی خۆی نانێتە پێناوی گەل، کەس ئامادە نییە هەنگاوێک بەرەو ئامانجە بەرزەکەی هەڵێنێت، تاک و تەنیا هەر خۆیەتی و خۆی:

مەزنی مەکە ژیر و چاکەناسە
بۆم تێ نەگەیندرا چ باسە!

له عاسمانی بەرزی ئامانج و ئارەزوویەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆی، ئەركی خۆی كە ئەدیبێكە ئەنجام دەدات و دەیەوێ تا بۆی بكرێ خزمەتی ئەدەب و زمانی كوردی بكا، و كارێكی وا بكا:

بێگانە نەڵێن كــە كــورد نەزانن
بێ نووســـەر و هـونەر و زمـــانن

چیرۆكی مەم و زینی خانی وەك گەنجینەی پڕ لە گەواهیرات وایە، دەكرێ لە زۆر بابەتەوە لێی بدوێین، بەڵام لەم سەرەتایەدا ئەوەندە بەسە، خوێندەواران خۆیان بە وردی سەرنجی بدەن و بە ئارەزووی خۆیان گەوهەری نایابی لێ هەڵبژێرن.

٣

هەژار ناوی عەبدولرەحمانە، كوڕی حاجی مەلا محەمەدە، ساڵی ١٩٢١ لە دایك بووە، لە بنەماڵەیەكی زانای ئاینییە، هەژار وەكو جارێكی تریش لە سەرەتای دیوانەكەیدا كە بەناوی "ئاڵە كۆك"ەوە چاپ كرا، نووسراوە بیر وردی و باریكبینی لە نالی، میللەت دۆستی و نیشتمان پەرستیی لە حاجی قادری كۆییەوە وەرگرتووە.

حاجی مەلا محەمەدی باوكی هەژار هەرچەندە زانای ئاینی بوو، چاو لە دەستیی پێ ناخۆش بوو، نەیدەویست بە یارمەتیی ئەم و ئەو بژی، خەریكی بازرگانی بوو، بژێوی خۆی بە دەستی خۆی پەیدا دەكرد و كاروباری ئاینیی خەڵكی بە خۆڕایی ئەنجام دەدا. كەس و كاریان لە لادێ زۆر بوو، هێندێك زەویوزاریشیان هەبوو، جا سەبارەت بەمانە، هەژار لە ژیانی خەڵكی ناوبازاڕ و مەلا و فەقێی مزگەوت و وەرزێر و جووتێری لادێ شارەزایە، واتە لە هەناوی گەلدا ژیاوە و بە ئێش و ئۆف و رەنج و دەردی گەل ئاشنایە. گرینگترین لایەنی شیعرەكانی هەژار ئەمەیە كە بە زمانی ساكار و بێ گرێ و قۆرتی گەلە، ژیانی گەل نیشان دەدات، ئاوات و ئارەزووی گەل دەردەبڕێ، دەردی گەل دەناسێ و دەرمانی بۆ دەدۆزێتەوە.

هەژار شاعیرێكی دڵداری نییە، عاشقی چاوی كەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نییە، عاشقی كێو و كەژ و بەندەن و چیا و شیو و دۆڵی كوردستانە، شەیدای گەلی خۆشەویستی كوردانە، لە پێناوی كورد و كوردستاندا گێرە و كێشە و چەرمەسەریی زۆر و زەوەند و بێ ئەژماری دیوە، بەڵام شاعیرێكی ئازا و دڵقایمە، سەری بۆ هیچ

ئەنگ و چەڵەمەیەک دانەنەواندووە، بەهێزی بیروباوەڕی خۆی لە بەرامبەر هەموو تاڵی و سوێری و سارد و گەرمی ڕۆژگاردا ڕاوێستاوە، هەرگیز لە شیعرەکانیدا هاواری خۆی ناکات، هەمیشە بە پەرۆشی گەلەوەیە.

هەژار مێشک و بیری هەراو و بەرینە، ئازادیی بۆ نەتەوەی کورد و گشت نەتەوەکانی تریش دەوێت . هەژار لایەنگری ئاشتییە و دوژمنی شەڕ و جەنگە. هەمیشە نووکی ڕمی قەڵەمی ڕادەدێرێتە چاوی ئیستیعمار و دیکتاتۆری و کۆنەپەرستی و دەرەبەگی. هەرکەس شیعرەکانی بخوێنێتەوە ئەمانەی بە ئاشکرایی تێدا دەبینێت.

گەلێ شیعری هەژار بە زمانی ئازەربایجانی و ڕووسی وەرگێڕاون، سەربەخۆ یان لە ڕۆژنامەکانی وڵاتەکانی سۆڤیەت تەنانەت لە ڕۆژنامە هەرە گرینگەکان وەکو: "پراڤدا" و "ئازڤێسیتا"دا چاپ کراون، هەژار لەم سەفەرەدا کە چووە یەکەتیی سۆڤیەت بە ئەندامی شانازی دەستەی نووسەرانی ئازەربایجانی سۆڤیەت دیاری کرا. بە کورتی هەژار یەکێکە لە ڕۆڵەکانی کورد کە لەباری شیعر و ئەدەبەوە وەجاخی کوردستانی ڕۆشن کردووەتەوە.

هەژار لە هەڤاڵەتیدا ڕاست و بە ئەمەگ، قسەخۆش و دەم و ڕاوێژ شیرینە، بێ فیز و بێ فرۆفیشاڵە، خۆپەسەند و دەمارزل نییە، لە بابەت بیچمەوە حەز دەکەم وێنەیێکی خۆی لەگەڵ ئەم سەرەتایەدا چاپ بکات تا خۆتان ببینن و پێویستی بە گێڕانەوە نەبێ.

هەژار کە مەم و زینی خانیی لە ڕاوێژی کرمانجییەوە بە سۆرانی دەگێڕێتەوە، نەوەرگێڕان و تەرجەمەیە، نەبەڵگەیە بۆ ئەمە کە ئەم ڕاوێژانە وەک دووزمانی جیاوازی وان، بگرە ئاسەوارە بەنرخەکەی خانی بەشێوەی ڕەوان و ڕێکوپێکی ئەمڕۆ و بەکوردی پەتی ژیاندووەتەوە و گیانی خانی بەم کۆماری دیموکراسیی کورد و عەرەبە و بەم ئازادییەی کە ئارەزووی دەکرد شاد کردووە و بەرەی ئەمڕۆی بە شاکارەکەی خانی و ڕۆژگاری خانی ئاشنا کردووە. بەم جۆرە بەخۆداهاتن و بووژانەوەی ئەدەبی کوردی نیشان داوە. هەرکەس مەم و زینی خانی لەگەڵ مەم و زینی هەژار بە وردی سەرنج بدات تێ دەگا کە ئەدەبی کوردی چ مەودایەکی بڕیوە تا

ئاوا گەشاوەتەوە و گەیشتووەتە ئەمڕۆ. لە بازاڕی ئەدەبدا ئەمە کارێکی زۆر گرینگ و هێژایە و خزمەتێکی گەورەیە بە ئەدەب و کولتووری کوردی. ئیتر هومێد وایە هەژار بتوانێ پتر یاریدەی گەل و نیشتمانی بدات.

حەسەن قزڵجی

## بەرکوڵێک لەلایەن وەرگێڕەوە

لە مەڵبەندی سولەیمانیدا باوە دەڵێن "موکریانی نانی بە نانی دەخۆن"، نیازیشیان ئەمەیە نان دەگوشنە شۆرباوە و بەنان دەیخۆن، بەڵام من بەمەشەوە نەوێستام چووم کوردیم وەرگێڕاوەتە سەر کوردی! جا بزانین چۆن و لەبەرچی؟ منداڵ بووم لە تەمەنی سێزدە و چاردەدا فارسیم دەزانی و تازەش گڕوگاڵی کوردی خوێندنەوەم کەوتبووە سەر. لەو رۆژگارەشدا لە مەڵبەندی ئێمە نووسین و خوێندن بە زمانی کوردی بەرانبەر بە یاسای داگیرکەران زۆر بە گوناهێکی گەورە دەژمێردرا.

بەڵام خوێن گەرمی و منداڵی، زۆر بیر لەو وردە وردانە ناکاتەوە. هاورێیەکم هەبوو، تۆزێک بەتەمەن لەمن زلتر و بە بیر و ژیری زۆر لە من باوەخۆشتر بوو دەمانتوانی تاق و واز لێر و لەوێ نووسراوەی بەکوردی پەیدا کەین و خۆ بکوتینە ناوباخان و دەری شار و زمانمان بە خوێندنەوەیان رابێنین.

یەکەم نووسراوێکی زۆرم لێ خۆش هات کۆمەڵە هەڵبەستەکەی حاجی قادر بوو کە دەتوانم بڵێم چاوی نیشتمان پەرستیم بەو پشکووت، حاجی هەموو شت بوو لەبەر چاوم، داهێنەری کوردایەتی، یەکەم بژیشکێ کە باش دەردی کۆمەڵی ناسیوە و رێگەی چارەی نیشان داوە، تەنیا هونەرمەندێک کە دەستی لە کلکی نووسەرەکانی بەرێ بەرداوە و باری بەند و باوی لە پێ هەڵگوتنی ئاغا و پیرانەوە خستۆتە سەر رچەی گەل خۆشەویستی و نیشتمان دۆستی و هوروژم بردن بۆ سەر خوێنمژان. تا رۆژێک گەیشتینە ئەم هەڵبەستەی کە دەڵێ: تەنها ئەمە وەها نین دیباچەکەی مەم و زین پێتان دەڵێ چلۆنن ئاکاری پیاوی چازان. هەیاران! لە پێش حاجیشدا یەکێکی دیکە بووە کە گەلی کوردی بانگ هێشتووەتە سەر خوانی گەل پەرستی و دنەی داون بۆ ژیانی سەربەخۆبوون و سەربڵندی و حاجییەکەی ئێمەش یەکێکە لە شاگردە ئەمەگ ناسەکانی ئەو.

کەوتینە پێ و شوێنی مەم و زین، بەخوا دیتم وا رۆژێک هاورێکەم بە گەشکەیەکەوە

پیلی کێشام بۆ دەری شار و مەم و زینێکی لە ژێر بەرۆکی دەرخست و دەستمان کرد بە دیباچە خوێندنەوە، بەڵام چت لێ بشارمەوە هەر هێندە بوو بە راوێژ تێ گەیشتین نیازی چ بووە، ئەویش چونکە فارسییەکانمان دەزانی لەوی بەولاوە هەرچی بەدەوریا هاتین و چووین چمان بۆ بە چ نەکرا و هەر تەقەمان لە سەرەوە دەهات. رۆژگار سووڕا و کەوتینە دەربەدەری و کۆڵان گەڕی، ساڵی ١٩٥٣ کە لە بوخاریست گەڕامەوە و پازدە رۆژ لە جەزیرە مامەوە، مەم و زینێکم دەست کەوت ئەمجارە عەرەبیشم دەزانی کە خوێندمەوە بەشی زۆر زۆرتری تێ گەیشتم، تا ساڵی ١٩٥٦ کە کەوتمە کوردستانی داگیرکراوی سوریا و بە باشی زاراوەی کرمانجی فێربووم، توانیم هەمووی ساغ کەمەوە. تازە بۆم دەرکەوت خانی کێیە و چیی گوتووە و پلەی هونەروەریی تا کوێ باڵا چووە.

مەم و زینی خانی گرینگییەکەی نە لەوەدایە کە چیرۆکێکی ئەویندارییە و هۆنراوەتەوە چونکە چیرۆکەکە بەر لە خانیش بەسەتان ساڵ هەر بووە، پایەبەرزیی خانی نە تەنیا هەر لەوەدایە کە پێش هەموو کوردێک هەستی بە دەردی کۆمەڵ کردووە و نیشتیمان پەرستیی هێناوەتە روو، بە بیری من شتی زۆر گرینگ لەو وردەکاری و بنووس لووسی و بوێژییەیدایە کە شانی لە شانی نیزامی گەنجەیی و ئاورەحمانی جامی داوە، تەنانەت دەتوانم بڵێم بەجێشی هێشتوون.

هەر نووسەرێک لە نووسەرە بەناوبانگەکان کە لێیان ورد دەبیەوە هەر لە مەیدانێک و دووانـدا توانیـویانە خـۆ بنوێنن بۆ نموونە فیـردەوسی لە جەنگنامە و سەعدی لە ئامۆژگاری و حافز لە پەسەنی دڵداری چارەڕەش و بادە و نیزامی لە پەسەنی جوانی و خەمباریدا سەرکەوتوون، بەڵام خانی بە تەنیا هەموو شتێک بووە.

خانی لە باسی خواناسی و پەسەندیی پێغەمبەر و پاڕانەوە و وردەکاریی دەروێشانەدا دەستی لە هەموو کەس ئەستاندووە. لە پەسەنی جوانی کچ و سروشتی خواکرد و ڕازاندنەوەی کۆڕی بەزم و ئاهەنگدا کێ دەتوانێ لەبەری بکۆخێ! لە راووشکار و گەرمکردنی مەیدانداریدا تاقە سوارە هەر خۆیەتی. لە پەند و ئامۆژگاری لە دەردی دڵ و لاواندنەوە لە پێک گەیشتن و لێک بڕانی دڵداراندا دەستی هەموو بوێژێکی لە تەختە بەستووە. "هەرچی جوانان هەموو لایانە بەتەنیا لاتە".

## بابگەڕێنینەوە سەر نیشتمان پەرستییەکەی

وەرە لەگەڵم بچینەوە سەدەی یازدەیەمی ئاوارەیی کە دەبێتە چەرخی حەڤدەیەمی خاچ پەرستان و لەوێوە سەیرێکی گەڕی گەردوون بکەین بزانین باوی گەلپەرستی و نیشتمان خۆشەویستی گەیبووە چ رادەیەک؟

بەڵێ ئەو بیرە لەناو رۆژئاواییەکاندا تاک و تەرا پەیدا بووبوو بەلام خۆ لە رۆژهەلاتی ئێمەدا دەتوانم بڵێم لە هەموو ئاسیاشدا کەس بۆنی نەکردبوو، خۆ بەتایبەتی لەم رۆژهەلاتی ناوەڕاستەدا تا پەنجا ساڵیش لەمەوبەر سەروبنی بەندوباو و نوێژ و رۆژوومان هەر بە بەژن و بالای پاتشای موسوڵمانان هەڵدەگوت کە نیازیشمان سوڵتانەکانی عوسمانی بوو.

فارسەکان بێجگە لە شەخسێ و وەخسێ و جەنگی هەمەر و وەتمانی هەزار ساڵ لەمەوبەر هیچیان بە بیردا نەدەهات، حارەب هەر خەریکی تالان و برۆ و کۆچ و کۆچبار و مەڕ و وشتر لەوەڕاندن بوون. تورکیش بەناوی ئاینەوە دەمیان تێ نابووین و بە پیتاکی هەژاری موسڵمان کچ و لووسکە و بادەی کۆن و خۆراکی تازەیان لە پێش خۆیان ریز دەکرد.

لە کوردستانێکی پڕ لە خان و ئاغا و میر و بەگ و چەکمە رەقدا، لە کوردەوارییەکی بە هەزاران پیر و مەلا و بوێژی وای تێدا بووە کە هەر یەکی خۆی بە نۆ مانگای زاو نەگۆڕیوەتەوە، هەرگیز هەستیان بە هۆرەی تورکان نەدەکرد. کەچی لەو ناوەدا مەلایەک لە قوژبنی مزگەوتێکدا لە شاری بایەزید کە بیرێک لە خۆی دەکاتەوە: هەیاران من خۆم دەزانم لە نیزامی و جەلالەدینی رۆمی کەمتر نیم و چەپێکم دەبەر فیردەوسی و سەعدیدا نییە. بۆ کەس لە من ناپرسێ؟ بۆ ناوێرم لای کەس بڵێم منیش شتێکم؟ پێم دەڵێن کوردی و کورتی، بەڵێ کورتم بەلام بۆیە کورتم چونکە گەلەکەم دەستی کورتە، چونکە هیچ پەنا و پەسیوێکمان نییە، چونکە کەسمان نییە نرخی هونەر و کردەوەمان بدا. ئەگەر باوەڕیش ناکەن ئەوا من مەم و زینێک دەهۆنمەوە کە هەزاری وەک لەیل و مەجروون و شانامە و مانامە بە تۆزیشی رانەگەن با هەموو کەس تێ بگەن کە:

کورد هێندە نە گێل و گێژ و کاسن
داخم ئەو بێ کەسن کەساسن
ژیر و بەدڵن گەلێک دەزانن
بێ خێوییە بێ سەر و زمانن
بۆمەش کە هەبایە خێو و سەردار
بەخشندە و ژیرو زیت و وشیار
ژیری و هونەری بەدڵ کڕیبا
ژەنگی لە دڵی هەژار سڕیبا
من ئێستە لە کۆڕی وێژەوانان
ئاڵام دەشەکا لە عاسمانان

خانی سێ سەد ساڵ لەمەوبەر بیری ئازادبوونی خستووەتە بیرمانەوە، خانی داهێنەری نیشتمان پەرستییە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. خانی کەسێکە شتێکی وا بەنرخ و گەورەی بەکوردی بۆ بەجێ هێشتووین کە بە زۆر شانازییەوە خۆی پێوە ڕانێین و بەسەربەرزی بڵێین: ئێمە خانیمان هەیە و گەلێکی خاوەنی خانی بێ، هەرگیز نامرێ.

ئەوەی منی هێنایە سەر بیری وەرگێڕانی مەم و زینی خانی ئەوەبوو: وەک گوتمان مەم و زینی خانی پڕیەتی لە عارەبیی ڕەق و فارسیی گران، ئەمەش نابێ لە خانی بگرین چونکە ئەو دەمەی ئەو پێی ژیاوە ئاوا باو بووە، هونەرمەندیی هەر کەس بەوەدا دەرکەوتووە زۆر وشەی ڕەقی عارەبی و فارسی بەکاربێنێ . جابۆ ئەو دەمەش بەپێی ئەم ڕێ و شوێنە خانی دادی هونەروەری داوە.

من هەموو کەس بۆم بڵێ، هەر پێم وایە و لێشم ڕوونە گەلی کورد درەنگ یان زوو ڕزگار دەبێ و وەک گەلانی خواپێداوی دیکە بۆ خۆی ڕێ و شوێنی ژیانی خۆی ڕێک دەخا و ناچار نابێ وەک ئێستا تەنیا گەلێک و بەچەند زمان بخوێنێ و زمانی خۆشی لێ بەربەست کرابێ . جا ئەو ڕۆژەی من لەبەر چاومە، کوڕی کورد هەموو شتێک بە زمانی خۆی دەخوێنێ و ئەگەر زمانی بێگانەش فێربێ دیارە هیچ یەک لەو زمانانەی ئێستا خەریکیانە بەکەڵکی نایە و هەر بیریشیان لێ ناکاتەوە. ئەو ڕۆژە کوردێکی

وات دەست ناکەویّ لە مەم و زینە کۆنەکەی خانی بگات چونکە هەر کەس عارەبی و فارسی و زاراوەی کرمانجی زۆر باش نەزانیّ و تۆزێکیش لە تورکی سەری دەرنەچیّ و زۆریش لە وشەی سەیر و سەمەرەی دەروێشانە ئاگادار نەبیّ، مەم و زینی خانی بیّ گرێوگۆلّ بۆ ساغ نابێتەوە. جا هەموو رۆژ لە کویّ یەکێکی وەک خۆم پەیدا کەین کە لە سایەی دەربەدەری و کوێرەوەری و شەرِەشەقی جیهان و چەرمەسەرەی ژیانەوە بەناچاری فێری ئەو هەموو وردەکارییانە بکریّ! لەبەر ئەوە هەلم بەدەرفەت زانی و لە زستانی سالّی ۱۹٥۸دا لە جزیرە "لە کوردستانی داگیرکراوی سوریا" مەم و زینی خانیم وەرگێرِایە سەر موکوریانی یان بێژین سۆرانی.

بیخوێننەوە ئەگەر پێتان باش بوو ئەوا ئافەریم بۆ خانی بنێرن، ئەگەر وەبەر دلّیشتان نەکەوت ئەوا تاوانی من بگرن. بەلاّم منیش بۆ پینە و پەرِۆی هەلّە و چەوتییەکانم دەستە و داوێنی بوێژە کوردەکان دەبم و فەرمایشتەکەی خانی دووپاتە دەکەمەوە:

لێم وەربگرن بە سینەیی روون
لێمی نەگرن، چ خۆشە خۆشبوون
بۆم پینە بکەن هەلّەی زمانم
بابێننەوە بیر منیش لەوانم

سوپاس بۆ خوا کە بە کوردی دروستی کردم، سوپاس بۆ خانەدانی حاجۆ ئاغا لە جەزیرە کە لە پەنانیشینیی ئەواندا توانیم ئەمە بنووسم. سوپاس بۆ بارزانی کە بۆی چاپ کردم. سوپاس بۆ شۆرِشی گەلاوێژ کە دەتوانم بە ئازادی بلاّوی کەمەوە.

هەژار

بەغدا ۱۵/۱/۱۹٦۰



مەم لاوی لە پیسەتی و گوناھ دوور　　　زین ئەو کچی وا بە شەرم و رووسوور



دڵ تەنگە دەدەنگی زیر و بەم بێ		دڵداری لەلانی زین و مەم بێ

وا بکەم کە جیهانێ بێ و بنۆڕی		دەژیەنمەوە زین و مەم لە گۆڕی

دەیکەم بە شتێکی وا تەڕ و خۆش		هەرگیز لە جیهان نەبن فەرامۆش

هەڵبەستی وەها هەچی ببینێ		بۆ خانی دەنێرێ ئافەرینێ



زۆر زانی و بیر و وێژەوانی   پارچێکە بڕا بە بەژنی خانی

خانی وەکو ڕۆژە تیشکی داوێ   پێی ناوێ بدەم پەسەندی تاوێ

ئەو باخی گوڵان و من بژارم   بیر لەو دەکەم و دەڵێم هەژارم



زیانی نەدەدین و بێ بەزین بوو      ناویشی ئەمیر زەینەدین بوو

## دیباچە

سەرنامە بەناوی تۆ خوایە
چی بێ ئەمە پیت و پێزی نایە
سەردێری پەری ئەوین پەرستان
جێ ناز و نیازی خۆشەویستان
رووناکی دڵ و بینایی چاوان
گەر تۆ نەبی کێ ئەوینی دا وان؟
بێ ناوی تۆ نامە هیچ و پووچە
نەتنووسێ بنووس کەچ و کورووچە
ناوت بووە شەوچرا لەبەرمان
بۆ دەردی دەروون دەبێتە دەرمان
نەدیاری بەناوی تۆ دیارن
ئەو هۆیە کە مێشک و دڵ لە کارن
گیان بەخشی و ژیندەری گیانی
ئاواتی دڵ و لەبەر دڵانی
دڵخوازی و خۆت ئەوین و نازی
کارسازی و ساز و بێ نیازی
تۆی چوویەتە ردنگی بەرگی سوورگوڵ
تۆی بوویەتە سۆزی جەرگی بولبول
تۆ تیشکی لە کوڵمی دڵبەراندا
تینی لە دەروونی دڵ تەڕاندا
رۆژیت و کەچی ونی لەبەرچاو
رووناکی نە چەشنی ئاگر و ئاو

هەرچی هەیە لێی جیا و جیانی
بێ جێی و چ جێش نییە تیانی
چی دێت و دەچێت و چی هەیە و چوو
هیچی نەبوو تۆ وتت ببە و بوو
گیاندار و نەبوو و دیار و نەدیار
زاناو نەزان و گێل و وشیار
لەو پیتەوە گشتی هاتە بەرهەم
تۆزێ لەوە خاک و ئاوی ئادەم
گەنجینەی و تاکو تۆ بناسین
هاتووین کەچی هێشتە گێژ و کاسین
تاپویەکی تۆیە گەر ژیانە
گەر گیانە دروشمی تۆی نیشانە
ئەو لاشە گڵینە و قوڕینە
هۆی تۆیە کە جێی گیان و ژینە
راسپاردەتە ئەم گیانە پاکە
ناچارە کە یاری خۆڵ و خاکە
گیان تیشکی پریشکی تۆیە روونە
گڵ تیشکی کە لێ نەدا زەبوونە
لێ وردبەوە ئەم وتارە وردە
هەرچەند بە ڕواڵە وردە گردە
پیاو گەر لەشە نزمە ڕێکی عەرزە
گەر گیانە بڵندە پایە بەرزە
لەو بارەوە پووچ و نادیارە
لەملاوە دیار و یاری یارە
گا سەربەرەژێر و گا بەرەوژوور
هەرکەس لە خوا نزیکە هەم دوور

هەرچی کە دیار و نادیارە
بۆ تیرەیی ئادەمی لە کارە
عاسمانێ کەوا زلە و بەرینە
هەرچی کە فریشتەنە و پەرینە
دەزگایەکی وا بە سوورِ گەورە
ساماڵە مژە هەتاوە هەورە
تیرێژە ستێرە رۆژە مانگە
چی جانەوەرە و روا و کانگە
ریشە و رەگەزێک لەناو زەویدان
هەر لاسک و چڵ و وەچێ لەویدان
ئەم چەندە شتی بەنرخ و هێژا
دڵخۆشی دەدەن لە بۆن و چێژا
چی دڵ دەیەوێ ببێتە خۆراک
چی لەش دەیەوێ ببێتە پۆشاک
هەرچی لەمە دوورە یا نزیکە
بۆ ئێمە بە رۆژ و شەو خەریکە
تۆی رێکخەری هەر سەروبەرێکی
بۆمان بە تەکووز و رێکوپێکی
داوتینی بەبێ ژمار و سامان
لای ئێمە نە بیر هەیە و نە ڕامان
زۆر بەدنمەکین و ڕێ نەناسین
نانی تۆ دەخۆین و بێ سپاسین
ئەی خوایە بە دڵ نەزانە خانی
خۆت فێری سپاسی کەی زمانی

## پەسندی خوا و پاڕانەوە

ئەی هێنەری هەردوو عاسمانان
ئەی دووری هەموو هەڵە و گومانان
بێ ڕۆڵە و داک و باب و کاکی
بێ هاوبەش و تاک و پاک و چاکی
نیتن چ وەزیر و یاریکارێک
لات وەک یەکە پادشا و هەژارێک
هەر بووی و دەبیت و پایەداریت
چوونت نییە تا هەتا لە کاریت
تۆ نەچییە زمانێ لال و پاڵە
بیرت لە دڵا بێ مشت و ماڵە
عاسمان و زەوی و مرۆ و فریشتە
هەرچی هەیە وردە یا درشتە
دارا و ڕەبەن و بەنێو و بێ نێو
دار و دەوەن و کەژ و بەژ و کێو
چێو و چڵ و چاڵ و نزم و باڵا
چی خۆشە چ تاڵ چ پڕ چ واڵا
هەرچێکی لە ناخی ئاخ و دەریان
هی چووەتە بناو ئەوی لە سەریان
بەرهەم بوو بەهۆی کر و نیگارت
سەر سووڕە جیهان لە کاروبارت
لەو بەرزییە کۆشکی حەوت نهۆمە
کۆکۆ لە دەوری ستێرە کۆمە

هێندێکی چەقــیــو هێند گــەڕیدەن

دیارن کـــــــەم و زۆری دووره دیـدەن

مـــانگی گــەش و ڕۆژی ڕۆشنیـــدەر

شــینکەی لە زەوی دەبێــتــە راخــەر

چوار ئالی و شــەش ڕەخی هەواگــر

مــــاکی گڵ و باو و ئاو و ئاگـــــر

خەست و شل و توند و خاو و گشتی

تۆی دانەر و ڕانەری لە گـــشـــتی

هــەریـەک لـەبـەزەت بـەپار و پـشـکـە

تیـــشکت لە هـەچی نەداوە وشکە

داهــێـنــەری پـاکــی بــێ نمـوونــە

تۆی بۆنە ئەگـــــەر نەبوون و بـوونـە

چی پاشی دەبێ و چ هات لە پێـشین

چی باوەڕی پێت هەیە و چە بێ دین

هەر گـیـان و دڵ و ســەر و زمـانێک

هەریەک لە تۆ شـان دەدا نیـشـانێک

هیچ شت نیــیــە تۆی نە تێکەڵاوی

بەرچاوی ونـی خـــــــــڕی بڵاوی

چی زیندووە لاشــە تۆی گـــیـــانی

تـۆ ژانـی نـەمــــــــاندەری ژیانـی

تۆی خشڵی لە ڕەنگی خۆشەویستان

تۆی کـینە لەناو دڵی نەویســتـــان

شــیــرن دەکــەیە شــەکـر لە پەروێز

فـــەرهادی لە ژین وەڕێز و پڕ بێــز

یوسف دەبەیە پەنای زەلیـــخـــا

تا دەست و دڵی بدا بە تیـــخـــا

مـــەجـرِوون و لەیل دەکـــەیتـــە ناکـــام

رامـین و وەیس لـە یـەک دەکـــــەی رام

دات وامـقـی شـەنگ نـیشـانـی عـەزرا

لە ســـوێی دڵی خـــەو لە چاوی دەزرا

پیـــری لە جـیـــهـــان بە دووری چازان

بۆ کــــیـــــژێ دەنێـــــریە بەر بەرازان

لولوپەری خـــۆشـــــەویســـتی نـازدار

وات کــرد کـــە لە رۆژ ببـێـتـە کـرِیار

تـــۆ دات بـــە چـــنـــار بـــڵـــنـــدی بـــاڵا

تـاقـــــتـــــــاقـکـەرە وا لـە دەوری هـاڵا

دەروێنـی لـەنـاو درِوو و گــــــوڵـی ئـاڵ

بۆی شـــێت دەبێ بولبـــولی ژیان تاڵ

رەنگان دەخـەیە گــیـا و گـڵــووکـان

چووکـــان دەخـەیە جـرِووک و نووکـــان

گـــرِیێکی دەخـــەیتــە ســـــەر چرایە

دەپـــرووزێ پـەپـــوولـە بـــەم هـــەوایـە

جــــــوانکردنی دلبـــــــەران لە تۆیە

دڵدار کـــــە هـەژار و دڵ بـەســـــۆیـە

ئـەو دڵ تـەرِی و ئـەوینـی دڵگـیـــــــــر

کـــەزیەی کـــە لە مل دەبن بە زنجـیــر

کێ کــردی بە یەکـتـــری بەرانبـــەر

کر تن کـە گەش و رەشن سـەرانسـەر

ئـاوێنـە و ئـاو کـــــــــە دێـنـە وێـنـە

جـــوانیــتـــە لە روونیـــان هەوێنە

ئاوێنەیی پێـــشـی توتیـــــیـــانـی

کێ دیتی شـــتێ کــــە توو تیـانی

تۆی دڵ دەگـــــریت و بـۆ بـەهـانـە
خـــاڵ و کــــەزی دەبنـە داو و دانـە
تۆ هەرچی بڵــێی ئەوی دەبێــژین
چیــمـــان بدەیەی لەوی دەچێــژین
دڵخـــوازی دڵی مـــە تۆی خـــوایە
لەو پێــوە شــتێ لە دەست مـــە نایە
ڕێگا هـەڵە بوون و شـــــــارەزایی
ســەر ڕشــتــە بەدەســتی تۆن دوایی
هـەر کـــــەس دەتەوێ بچێ بە تالان
پابەندی دەکــەی بە بسک و خـــالان
هەرچێکی کـە خـۆت بەزەت پیــاهات
سـەربەرزی دەکـەی بە هـات و داهات
ئادەم لە قـــوڕێ پتـــر نەبووگـــە
ویســتت لە فـرشــتـە بوو بەرووگـە
عـــیـــســـا لە فـــوێکە دڵ پەسندە
نازدارە لە پێـــشـــــە جێ بڵندە
ئیـــــدریس بـووە ئاشـنا بـە ڕازێ
پیـــرۆزە بە بەخـــتی خـــۆی دەنازێ
ئـــەهـــریمـــەنێ ڕێــزی لـێ نـــرابـــوو
لای تـۆوە بوو هـێــــــزی پێ درابـوو
نـــوێــژی بـــەهـــەزارە دادەبـــەســـتن
ســـــەرێـــچی نەبوو لە تۆ پەرستن
رووی دانـەنـەواند لەبـەر کـــەسـی دی
ئادەم پەرسی کــــەمــــایەسی دی
بێگانە پەرســـتی نەبوو پیـــشـــەی
بەدبەخت و کـڵـۆڵە بۆ هـەمــیـشــەی

کردت بەنەمر لە ئاگری سوور
ویستی کە نزیک ببێ خرا دوور
دەرناچێ سەرم لە کاروبارت
کێی وا بووە بووبێ ئاگەدارت
خواناسی مەزن گوتی بەڕاسی
تۆمان وەکو تۆ هەبووی نەناسی
خانی دەبێ چی لە تۆ بوێژێ
گێژێکە سەری دەخاتە گێژێ
لەو بارە خەریک ببێ بەهەرجوور
ڕێگەی هەڵەیە و لە تۆی دەکا دوور
جا یاری دەری مەگین خوا بێ
پێغەمبەری سایەدا و پەنا بێ
تۆ خوایەکی گەورە و گرانی
پێغەمبەری ئاشناکە خانی

## چۆنیەتی و گەورەیی پێغەمبەر

روون بووەتەوە هەرچی هەس دوولایە
یان هەر هەیە یان لە هاتنایە
ئەویانە کە هەر هەیە خوایە
چی دێت و دەچێ لەدەست ئەوایە
کر گەر بوو دەزانی هەیشە کرگار
بۆ هەر شتێ سازکەرێکە ناچار
بڕوانی دەزانی دەفر و ئامراز
وەستایێ نەبێ چلۆن دەبن ساز
کر رۆچنەیی روونی کردگارە
بڕوانی لە خۆت خوا دیارە
گەنجینەیی گەوهەری وەشێراو
پاش پەردەیی کردە دێتە بەرچاو
چی جوان و بە نرخی ئەم جیهانەن
لە جوانیی خوای مەزن نیشانەن
ئەم چەند کر و کاری بێ بژارە
ویستی لەسەری هەبن ژمارە
پێش هەر شتێ کارسازی زانا
هێنای تەتەڵە و بنووسی دانا
خۆی ئێکەم و ئەو یەکەم گیانە
زانای یەکەمە و نە لێک جیانە
بەڕواڵە کە سێنە هەر یەکێکن
هەرسێ وەکو سێ گرێی لکێکن

دای جوانی نەمر برووسکە یەک لەم
پێغەمبەری ئێمە هاتە بەرهەم
ئەو تیشکی خوایە بۆ هەمیشە
بۆ هەر شتێ بووەتە پنج و ریشە
گیانان لە گیانی ئەو پەیابوون
چەند تیرە و هۆز لە یەک جیابوون
هی بەختەوەر و بەرەی بەخت رەش
چی ماون و هەرچی چوونە ناو لەش
سەرپاکی لە تیشکی روونی ئەو بوون
گش هاتن و بوون لە بوونی ئەو بوون
هێشتا نە زەوی نە عاسمان بوو
ئەو سەروەری هۆزی سەروەران بوو
عاسمان و زەوی لەبەر ئەوی بوون
بۆ وی بوو فرشتە سەرنەوی بوون
پێغەمبەرێ بوو لەلای خوا ئەم
پێ خوێیەکی قوڕ بوو باوە ئادەم
ئەو پەنجەرەیە و خوا دەوێڕا
تیشکی لە دڵی رەشی مە گێڕا
شایێ بوو لە بەرگی بێ نەوایە
پێغەمبەری رۆژگاری دوایە
دیتی لە جیهان نەدین نە باوەڕ
هەر خواری و چەوتییە و هەڵە و گەڕ
خوانی لە رەوشتی چاکی دانا
دڵپاکی و پاک رەوشتیی ڕانا
چی بت پەرستە و چە جوو و چە گەورە
بانگ هێشتنی کردە خوانی گەورە

خـــاقـــان لە پەنای دەهـنـدەیـیی وی
نـاوبـانـگـی دەرچـوو بـە نـان نـەدیـوی
هـیـرقـەڵ نەگـەیی بەتۆز و گـەردی
قـەیسـەر سـەری خـۆی دەدا لـە بەردی
قـبـتـی و حـەبەش و فـەرەنگ و رۆمـان
دایانـە رچـەی قـــەراچ و دۆمـــان
ئـالای دەسـی ئـەو شـــەکـــا لـە بـالا
کـیـســرا سـەر و لاشـی کـەوتـە چالا
چـی دیـن و گــــەلـن لـەنـاوی بـردن
یـان تـەرت و تـونـا و بـڵاوی کـــردن
ئـاورگـی مـــراند و گـــاوری کـــوشـت
جـێگـابـتـی گش بـە ئـاگـری شـوشـت
تـەورات و زەبـوور نـەمـــان لـە نێـوان
ئینجـیل پـەرییـە شکەوت و کـێـوان
عـیـسـا گـوتـبـووی کـە مـابوو هێنگین
پێـغـەمـبـەرێ دێ لە ئێـوە مـزگین
دڵخـوازی دەویسـت بەدەست و بەزمـان
شـیـری لە دەسـا بوو، دەم بە قـورعـان
هـەر لـەو دەوەشـــاوە کـــار و ئـاکـــار
ترسـێنـەر و مـــوژدەدەر بەیـەکـجـار
زۆرزان بـوو لەگـەڵ نـەخـوێنـدەواریش
زۆر نـان بـدە بـوو لـەگــــەڵ هـەژاریـش
شـوانێکی هـەژاری بێ کـەس و کـار
چەند تاجی پەڕاند بە تیـخـی مـووکـار
بێ لەشکر و چەک بوو سـەرزەویی گرت
هەر خـۆزگـە بەوە دەسـی وەویی گـرت

بۆ جەنگێ کە لەشکری دەکێشا
پێشمەرگە فرشتە بوون لەپێشا
بێ خێوەت و بارەگاە و هەیوان
هەوران لەسەری دەبوونە سەیوان
دەیدین چە هەبان لەپاش و پێشێ
کەس نەیدی کە لێی بنیشێ مێشێ
چەند گفتی لە یەک دەما دەبیستن
جیاوازی نەبوو چە سەد چە بیستن
سایەی نەدەکەوتە سەر گڵ و خۆڵ
وەدوای دەکەوت گژ و گیا و گۆڵ
دەیدواند لکەدار و بێ گیانان
دەیپرسییەوە دادی بێ زمانان
گیاندار و ژی یاوی هەر شوێنێ
کێ مابوو کە باوەڕی نەهێنێ
بێجگە لە برێ کوڕانی ئادەم
تا ببنە بزووتی ناو جەحەندەم
ئیتر لە زەوی و لە عاسمانان
لە فرشتە و ئادەمی و گیانان
کەس نایەتە ڕێزی سەروەری مە
بێ ئەو نییە کەس پەنادەری مە
کێ پەیڕەوی ئەو بێ سەرفیرازە
شانازی بەخۆی دەکا و بەنازە
ڕێ و شوێنی ئەوە کە ڕاستەڕێیە
بیبەیتە سەرێ خوا لەوێیە
پێغەمبەری جوولەکان دەزانن
زانای مە هەمووی وەکی ئەوانن

پێنسەد زلە پاڵەوانی گاور
سەرپاکی لە جەنگ و کێشە ئاور
بۆ یارێکی ئەو دەبوون بەرەنگار
مردن بوو دەبوو هەڵێن بە ناچار
لەوبارەوە هەرچی بەدگومانن
کێشەی چ دەکەن! گەلێ نەزانن
قورعان و وتاری ئەو بڕۆنن
هۆشیان هەبێ تێ بگەن کە چۆنن
چواریاری چلۆنی هەڵبژاردوون
فەرمایشی چۆنی راسپاردوون
ئەی شای مەزنی بڵندپایە
عاسمان و زەویت لەبەر دەسایە
چۆن رێم دەکەوێ بدەم پەسەندت
خوای گەورە دەدا پەسەندی رندت
تۆزێ لە پەسەندی تۆیە یاسین
بەو بۆنەوە ئێمە تۆ دەناسین
خۆی سوێندێ بە تۆ بخۆت چ ماوە؟
رێگا لە زمانی من بڕاوە
گەر ئێمە هەمان بێ سەد هەڵە و سووچ
سەد جار بگەڕێین لە دووی پڕوپووچ
هێشتا لە بەزەت هومێدەوارین
بەخشندە ئەتۆی و ئەم هەژارین
خانی کە گەلێ گوناهکارە
ناپاکە نەزانە نالەبارە

هیــوای هـەیە پێت کــە لێی ببــووری
لەو ڕۆژی ژمـــــارە نـەگــــری دووری
ناتوانیّ لە ڕێوە ســــەربەخـــۆ بیّ
با پـەیڕەوی یـارەکـــــانی تـۆ بیّ

## پێغەمبەر دەکاتە تکا کار

ئەی بۆنەیی بوونی دوو جیهانان
میوانی خوا لە عاسمانان
شابازی و پاتەخت مەدینە
شانازیی بە تۆیە ئەم زەمینە
لە وزەی هەموو کەس بەدوورە کردەت
قامک دەنوێنی مانگ دەبێ لەت
ئامادە کراوە ئەسپی باڵدار
داخوازە بەدڵ کە تۆی ببی سوار
تیژتر لە برووسکەیەک بە رەوتە
سەرداری فرشتە پێش جڵەوتە
نۆبەرزی و هەرچی وا لەوێیە
پێشوازن و گشتی چاوەڕێیە
جێ بێڵە بڵندیی عاسمانێ
نێزیکی خوا بەژێ کەوانێ
بەو جێ کە دەچی کەسێ نەگەیوە
بێ پەردە لەگەڵ خوا بپەیوە
بخوازە نیاز رەوا دەبن بۆت
بیدوێنە گەلێ لەمەڕ گەلی خۆت
دەسکاری ئەوین لە خاک و خۆڵین
گەر بەختەوەرین و گەر کڵۆڵین
نیازی ئەوە گەر هەبین و گەربووین
ڕێمان کە نیشان نەدا لەدەست چووین

هێـــزی ئـەوە هێـــز و پێـــزی پـێ داین
هـەر خـــۆی لەبـەرێـوە رێزی لـێ نـایـن
ئـەو بەو پـلـە بـەرزیـیـــەی گـــەیـاندین
خــۆی رازی گــرینگی تـێ گــەیـانـدین
دەیــزانـــی زەبــوون و نــاتـــەوانــین
ئــەم رازە گــــــــــرانــە نــاتـوانــین
بـۆ کـــردەوەمـــان لە رۆژی پـێـــشـــا
هـەر خــۆیـەتـی رێ و شـوێـنی کـێـشـا
دەسـکـردی ئـەون بـەدیـن و گـــــاور
لای چـەشـنی یـەکـن بـەهـەشـت و ئـاور
هـەرچـەن بـە رواڵـە لـێک جـــیـــــایـە
هـەریـەک رەوشـــێـکی ویـی تـیـــایـە
سـوچـمـانـە لـە بـەخـشـش و بـەزەی ئـەو
بـێـــــبـــاوەڕی تـاوی تـووڕەیـیی ئـەو
ئاورگ و بـەهـەشـت لەمـێـژە چـێ بوون
هـەر شـت بـەری ئـێـمـە جـێـبـەجـێ بوون
هـەوری بـەزەیی کـــە بـێـــتـــە رێژن
بـۆ یار و نـەیار دەبـێـــتـــە جـــێـــژن
گـــەر تـووڕەیی بـێـــتـــە روو بـەیـەکـدەم
گڕ دەگـرێ بـەهـەشـت وەکـو جـەحـەنـدەم
گـــەر گـــاور و گـــەر گـــونـاهـبـــارین
گـشـتـمـــان لە بـەزەی هـومـێـدەوارین
دەریـای بـەزەیـی دەبـا بـجــــــۆشـێ
چـەوتـی و هـەڵـەیـیی مـــە دابـپـــۆشـێ
تـۆ شـــوانـی و ئـێـمـــە پـەز لە پـەیـتـــان
وەک گــورگــە ددانـی چـیـڕە شـــەیـتـــان

ڕێگەی مـــەدە کـێس لە ئێـمـــە بێنێ
هـەر دەرفـــەتـی بێ دەمـــانڕفـــێنێ
کـارێ مـەکـە ئەو بە ئێـمـە خـۆش بێ
گـــۆڕی ئەوە بێـــبـــەش و پەرۆش بێ
هەر خـــۆی بکرێتـــە دەســـتـــە چیلە
لـەو ئـاگـــــــری پڕ پـەڕەنـگ و ژیـلـە
ڕزگـــاری ببێ بـەرەی گـــوناهـبـــار
بۆیان لـە خـــوا ببــــە تکاکـــــار

## بەدبەختیی کوردان دەڵێ و

## بەمەردایەتییان هەڵدەڵێ

مەیگێڕ وەرە توخوا دەسا دەی
بۆم تێکە دەجامی جەم قومێ مەی
تا پیاڵە لە من جیهان نوما بێ
دڵخوازی مە گشتی ئاشکرابێ
روون بێتەوە بۆم شتی نهێنی
پرسێکی گرانە بۆم هەڵێنی
رێوشوێنی وەهایە چەرخی گەردوون
نەویایەتییە لە پاش بەرزبوون
بەدبەختی سەری لە ئێمە داوە
تۆزکاڵێ کەمایەسی نەماوە
ئاخۆ دەبێ رووبکاتە کەمبوون
یاخۆ هەر دەبێ بە مانی گەردوون
تۆ بڵێی کە هەڵێ چ زوو چ دێرێک
بۆ ئێمە لە عاسمان ستێرێک
بەختی مە لە خەو هەڵستێ جارێک
جارێک بکەوێتە کاروبارێک
لێن هەڵبکەوێ جیهان پەنایەک
پەیدا ببێ بۆ مە پادشایەک
بۆ نووکی بنووس پەیابێ مایە
شیری هونەری مە بێتە کایە

ئەم بەختە ڕەشەی لەسەر مە ڕاکا
کوردیش لە جیهان بڕەو پەیاکا
بۆ مەش کە ببایە سەربڵندێک
زۆرزان و بە بیر و مەرد و ڕەندێک
نەخشێ لە دراوی مەش درابوو
بێ نرخ و چرووک و باو نەمابوو
بێ سۆیە کە زێڕ و زیوی ساکار
نرخی نییە چەشنی هی نیشاندار
بۆ مەش کە هەبایە پادشایێ
خوا تانجێکی پێ ببەخشیایێ
پەیدا دەبوو ڕێز و گەورەیی و ناو
ڕەنگ و کری مەش دەهاتە بەرچاو
ئێمەی لە کەساسی دەردەهێنا
بێستانی هیوای وەبەر دەهێنا
تورکان نەدەبوون بەسەر مەدا زاڵ
بۆ کووند نەدەبوونە لانە و ماڵ
چۆن بۆ عەجەمان دەبووینە ژێر دەست
ژێر دەستی شتی وەها نەوی و پەست
هەر ڕۆژی بەرێ خوای توانا
ڕۆم و عەجەمی لەسەر مە دانا
بێ شەرمییە ژێردەستیی ئەمانە
ئەم شەرمە لە پیاوە گەورەکانە
شوورەییە لە میر و نامداران
سووچیان چییە هۆنەر و هەژاران
کێ دەستی درێژ بکاتە شیری
هەرچی بیەوێ دەخاتە گیری

ئەم بووکی جیهانە بۆ کوڕێکە
شێرێکی بەدەست و شێردڕێکە
خشڵ و جل و شیرنی و نیشانی
بەخشینە بە بیر و ڕێگەزانی
پرسیم لە جیهان ڕەقی لە بەردی
نەرمیت بە چییە؟ گوتی بە مەردی
دنیا کە وەها بە بەخشش و شیر
بۆ پیاو دەسەمۆ دەبێت و دەسگیر
سا خوایە لە تۆ سەیر دەمێنم
لەو گێژە چلۆن سەرم دەرێنم
کورد چۆن دەبێ دیل و چارەڕەش بن
کەی ڕاستە لە خۆشی دوورەبەش بن
بۆ بەخشش و دڵ بەناو و دەنگن
شێرن لە هەرا پڵنگی جەنگن
دەستڕژدی ئەمانە حاتەمێکە
هەر کوردێ لەوانە ڕۆستەمێکە
بۆ ڕۆم و عەجەم وەکوو دیوارن
ئەم هۆیە کەوا کز و هەژارن
گۆپاڵی دەسی ئەوانە ئێمەین
بۆ تیری بەلا نیشانە ئێمەین
خۆیان لە گەڕ و هەرایە دوورن
کورد بەند و کلیلی سەرسنوورن
یەک هێرشێ بۆ سەر ئیدی بێنێ
هەر کوردە دەبن شەلاڵی خوێنێ
ئازایی و بەخشیشێ بپرسی
مەردایەتیی و دڵ و نەترسی

هەر بۆ کوڕی کوردسان هەیە و بەس
نەدراوە لەبەر ئەوان بەشی کەس
هێندەی کە بەجەرگ و دووڕە ترسن
کەمتر لە بەیەک گەیین دەپرسن
کەس بۆ کەسێ نابێ چاودەبەر بێ
هەر کەس دەیەوێ زل و لەسەر بێ
لەم سەرڕەقییە و دەماری زلیان
بێگانە دەبن سواری ملیان
هەر خۆیەتی زل کەوە و رەش و بۆر
هەر بۆیەیە بوونە هێزی خۆخۆر
کوردیش کە ببایە یەک دڵ و دەست
دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست
رۆم و عەرەب و عەجەم سەروبەر
بۆ ئێمە بەنی دەبوون و نۆکەر
پەیدا دەبوو باو و گەورەیی و ژین
ناومان دەردەکرد بە بیر و زانین
جیاواز دەبوو گفتی پاک و ناپاک
پڕ نرخ و بەڕێز دەبوو شتی چاک

## هۆی ئەم نووسینە و داد لەدەست

## گەردوونی چەپگەڕ

تۆمـــەز لە وڕی و نەزانیـی خـــانی
دەشـــــتی هـونەری بە چۆڵگە زانی
واتـا نـە بـە زیـرەکـی و بـە ژیـری
ســــەربەرزیی هـۆزی هـاتە بیــــری
لاســـــاری هێنایە بەر بەســــەرچوو
با پێـــشی بڵـــێین لە ڕێگە دەرچوو
پـالاوی ڕژاند و تـلــــــــتی نۆشـی
وەک فـــارسی وا زمـــانی خـــۆشی
هـۆنیـــــوەتەوە بە بەند و ســــاڵێک
بۆی مـــاندوو بووە بەهۆی خـــەیاڵێک
بێگانە نەڵێن کـــــە کـــورد نەزانن
بێ نووســــــەر و هـونەر و زمـــــانن
پێـــمــــان نەڵێ وێژەوانی بیـــر ورد
دڵداری نەبوو لەناو گـــەلی کـــورد
کـــوا ئێـــوە نـە دڵتـــەڕن نە دڵبـــەر
لەم ڕێگـە نـە ڕێڕەون نـە ڕێبـــــــەر
بێـبـــەش لە گـڕی لەشی و گیـانی
دڵڕەش لە ئەوینی ڕاســـتـــەقـــانی
کـورد هێندە نە گێل و گێژ و کـاسن
داخـم ئەو بێکەسن کـــەســــاسن

ژیر و بەدڵن گەلێک دەزانن
بێ خێوییە بێ سەر و زمانن
بۆ مەش کە هەبایە خێو و سەردار
بەخشندە و ژیر و زیت و وشیار
ژیری و هونەری بەدڵ کڕیبا
ژەنگی لە دڵی هەژار سڕیبا
من ئێستە لە کۆڕی وێژەوانان
ئاڵام دەشەکا لە عاسمانان
دەم خستەوە ژین مەلای جزیری
پێم زیندوو دەبوو عەلی حەریری
واشاد دەبوو پێم فەقێی تەیران
گیانی بەفڕین دەهاتە سەیران
چ بکەم کە گەلێ کەسادە بازاڕ
کووتاڵەکە باشە نیمە کڕیار
پایەی هونەران بە پارە بەندە
هەر کەس کە هەژارە کاری گەندە
هەر کەس لە ڕێگەی دراو و قۆشە
سەرخۆشە نەخۆشە دڵپەرۆشە
زانستی هەمووی بدەی بە پوولێ
پێت وا نەبێ کەس دەسی بجوولێ
کەس ناکا بە مەیتەری خۆ جامی
ڕاناگرێ بە نۆکەری نیزامی
دیتمان کە جیهان وەها شێواوە
هەرجەنگ و هەرا لەسەر دراوە
ویستم کە ببم بە زێڕ دروستکەر
لێی کەوتمە کار و بۆم نەچۆ سەر

تا بۆم وەگــــەڕێ ژیان لە نیـــــوە
چاوم لـە شـــتــــێکی دی بـڕیوە
چون فـێڵ و فـەرەج نە پیـشـەمـان بوو
بێ نـانی بەشـی هەمـیـشـەمـان بوو
دیـن ڕۆیـی دراو نـەهـاتـە بـەربـار
خــۆم داوەتـە مـسـگەری بە نـاچار
شێراوە بوو خستمە دەر مسی خۆم
وا پەلک و بنووس هەیە و نزاگــۆم
پـاڕانـەوەکـــــــەم رچـێـکـی زانـی
لەو ڕێگەوە گــەیمە کــامـــەرانی
ئەو پوولە ئەگـــەرچی پارە ناکـــا
تـالایـیـی ژیـانـێ چارە نـاکـــــا
بێ فـــێڵ و گـــەڕە ئەگـــەرچی وردە
کـرمـانجـیـیـە خـۆشـەویستی کـوردە
رووسـووره مـسـی مـە خـۆ نە زیوە
یان زێڕە بلێن کــە نیـو بە نیـوە
پـوولـی مـــە بە بـێ نرخ مـــەزانە
هـەر پارەیە ســووکـە بێ نیـشـانە
جـوان بێ کچ و کـەس ئەوی نەخـوازێ
ئەم هـەش بەســــەرە بە چی بنـازێ
نووســـــراوی هـەژار و بێ پەنـایان
بێ باشــــە لە زاری پادشــــایان
بێ نرخــــە لەلای گـــەلێک لە ژیران
هێــژایە لەکن گــەلێک بە بیـــران
مـەزنی مـە کـە ژیر و چاکـە ناسـە
بۆم تێ نـەگـــەیـەندرا چ باســـە

ئەو مـــیـــرە کـــە مـــیـــرزایە ناوی
ســـەرچاوەی ژین و پیـــتـــە چاوی
تیـشکی دڵـی ڕەش وەڕوون دەگـێـڕێ
پوولـێکی چـرووک دەکـــاتـە زێڕێ
سـەد مس بێ کـە چاو بگێـڕێ پێـدا
ســـەرپاکی دەبن بە زێڕ لەجـــێـــدا
گـەر تـوورە بی زل دەخـاتە بـەردەست
دڵخـۆش بی بڵند دەکـا شـتی پەست
وەک دیل دەگـــرێ ئەوانـی پاشـــان
وەک رووت بـەرەڵا دەبن لە پـاشـــان
هـەر ڕۆژێ هـەزار نـەدار و بـێ جـێ
هەر تـاوی سـەتـی گـەدا لـەسـەر رێ
گـیـرفـان هەمـوو داخـن لە بەخـشین
بۆ وانـە نە لـەمـــپـــەرە و نە پـەرژین
چاوێکی خـــشـــاندبا بەمـندا
دەپـســا رەگی بێکەســـیم لە بندا
ئەم گـفـتـە هـەموو دەبـوونە هەڵبـەست
وردەم وەکـو زێڕ دەچوو دەمـودەست
چ بکـەم دڵـی هـێـندی تـێ خــــزاوە
جـــێگایەکی بۆ مـــە لـێ نـەمـــاوە
ئەو خـــۆشـیـیـە بەس بـەشی نـەزانە
خـــوایە تـەمـــەنی بدەی جـــوانە

## پێشدەستەیەک بۆ چیرۆک

مــەیگێــڕ لە دەسی مــەدە هەڵێکە
وەک گـیـانی نەمـر مــەیەکی تێ کـە
تا بەو مـەیی گـیان و دڵ بەخـێـوکـەر
تاوێکی گـــەرم بکەین دڵ و ســــەر
مــەیگێـڕ بکە پیـاڵە ئاوی شــابوون
ئەو ئاوە کـــە چاوی دڵ دەکـــا روون
خــــاوێن بکەوە مــــژی قــــرێژم
ســەرخــۆش کـە دڵی نەزان و گـێـژم
مــەیگێــڕ دە بە گــەوهەرین پیــاڵە
لـەو شـــــیلـە رەوان و پـاک و ئاڵـە
یـاقــــــووتی تـواوە لـەعـلی ئـاوە
خــۆشــاوی دوڕ و دوڕی خــۆشــاوە
رەنگخـۆش و بەچێـژ و خـۆش بەرامـە
دەنکێکی کـەمــە بپـرســە کـامــە
دەنکـێ دوڕی رووتـی تـێ بـهـــــاوێ
خـــوەدانەکی رووتـی وەک گـــوڵاوێ
زووزوو بدە دەسـتی مـەی پەرسـتـان
ئەو کۆڕی کە هێشتە دڵ لە دەستان
تا پیــاڵەیی دڵ بە مــەی بکەن رەنگ
تا ســـاز و بەدڵ بێ بەزم و ئاهەنگ
مــەپسێنەوە بیــاندەرێ لە پەسـتــا
تا بێ بەش دەبن لە هۆش و هەسـتــا

لەو بەخششی زۆر و دوور لە هەژمار
بەشکو لە دڵۆپێ ببمە بەشدار
گەشکەی مەیی شیلەداری بێ گەڕ
خۆشاوی ترێی بەری رەزی تەڕ
کارێکی بکاتە سەر دەروونم
هێزداری بکا دڵی زەبوونم
تیشکێ بکەوێتە گیانی تاریک
دڵ بێتە سەری خەیاڵی باریک
دا تیری هەناسە کاریگەر بێ
بیرکم بشکێنێ سەد چەپەر بێ
چڵک و چەپەڵی لە دڵ دەرێنم
دەرچم وەکو بولبولان بخوێنم
دڵ مردنی بەس بێ هەستێ بفڕێ
با شەرمێ نەهێڵێ پەردە بدڕێ
گۆرانی و لاوکان ببێژێ
چێژێ لە ئەوینی خۆش بچێژێ
هاواری بخاتە مێرگ و باخان
خونچان بدڕن بەرۆک و یاخان
گوڵخونچە بپشکڤن لە چوقلان
بولبول بگرین لە داخی چقلان
جارجار بخەنن لە خۆشی دیمەن
ئاونگ بپژێ لە دەشت و چیمەن
سوێسنە وەزمان بێ بێتە باسان
رزگاربێ لە خەوخەوی و لە تاسان
مەیگێڕ بدە پێم مەیەکی گوڵڕەنگ
سەنتوور چ نەڵێت و دەف نەدا دەنگ

کوێخا و گزیر بەڵان نەزانن
دەرکەین کوڵ و خەم ئەویش لەوانن
دەست رژدی مەکە تژی کە دەفرم
رەنگێکی جیا بە خۆوە بگرم
سەرخۆش ببم و بەخۆم بنازم
نیازم هەموو ئاشکرا بخوازم
مەستم کە نەکەی گەلێک نەنازم
بێ مەی گەڕێ ناگەڕێ زمانم
مەمهێڵە بەهۆش و هیچ نەبێژم
شێتم کە هەتا دوڕان بڕێژم
بێ پەردە وەشاردووان وەسەرخەم
گش راز و نەهێنیان وەدەرخەم
بلوێر بێ دڵم بە داخ و سۆ بێ
وەک تووتی دەمم بە گفتوگۆ بێ
تێ هەڵکەمە لاوک و سێگا و دەشت
حەیران و قەتار و بەست و گوڵگەشت
بێ ورتە دڵم بناڵێ وەک چەنگ
پێ پەنجە و پت دەفم بدا دەنگ
بێ ژێ و کەوان بڵێت روبابم
تۆ بمدەیە مەی دەبێ وەهابم
لەو بەرز و بڵند و لەو هەوایە
زوهرە لە هەوام بکا سەمایە
دڵتەنگە دەدەنگی زیر و بەم بێ
دڵداری لە لانی زین و مەم بێ
دەردی دڵی خۆم بێ لەم وتانە
زین و مەم ئەدی چ بن بەهانە

وا بکەم کــە جــیــانێ بێ و بنۆڕێ
دەژیەنمەوە زین و مــــەم لە گـــۆڕێ
لەو دووی لە ئەوین بەزام و بیــمـــار
با خـۆم بکەمــە بژیشک و زانیـار
با گــەش بنەوە و بەخــەم بڵـێن بەس
ببنە نەمـر و نەچن لە بیـر کــەس
داخی جگەری مــەمی گـرفــتــار
ناخـــۆشـــیی ژینی زینی دڵدار
مــەم لاوی لە پیـسی و گـوناه دوور
زین ئەو کچی وا بە شەرم و رووسوور
دەیکەم بە شــتـێکی وا تەڕ و خــۆش
هەرگیـز لە جیـهان نەبن فـەرامـۆش
دڵبــەر بۆ مــەمێ بکەونە شـینێ
دڵدار بخــــەنن بـە دەردی زینێ
هـاودەردبوون شــتــێکی خـۆشــە
بێ دەرد بگرن کـــەنار و گـــۆشـــە
لام وایــە ئــەوانـی راسـت و پـاکـن
دڵـڕوون و ژیـر و بیـــــرروونـاکـن
هـەڵبـــەســتێ وەها هەچی ببـینێ
بۆ خـــانی دەنێـــرێ ئافـــەرینێ
هەر کـەس کـە خوای بڵند و پەستی
پێی داوە بەشێک لە خۆشـەویستی
با بێن ببیـەن خـۆیان لە بیـر کـەن
کـۆرپەی دڵـی هێندێ پێـوە ژیرکـەن
بیکا بڕێ گـوێی گــیـــانی لێ پڕ
مـــاڵیـــاوا لەدڵ بکەن دوو سێ بڕ

هیوامە لە راست و بێ گرێیان
نەبیەن لە چنۆک و زۆربڵێیان
ئەم نامە کە خاوە یان لە باوە
سەد رەنجی لە رێگەدا دراوە
ساوایە مناڵە شیرنەمشتوو
تازە بەرە تازە پێگەیشتوو
پێش من دەسی هیچ کەسی نەدیوە
میوەی رەزی خۆمە نەمدزیوە
ئەو میوەیە خۆشە یانە تاڵە
دڵبەندی منە وەکوو مناڵە
هیوامە بوێژی هاوزمانم
ئەوسان نەگرێتە رۆڵەکانم
ئەو میوە کە وشکە تفتە تڵخە
خۆ کوردییە زۆر لەلام بەنرخە
ئەو کۆرپە دەڵێی نە نازەنینە
چون نۆبەرەمانە خوێن شیرینە
میوەی منە خۆشە بۆی نەماوم
کۆرپەی منە بووەتە چاوی چاوم
خشڵ وجل و یار و زێڕ و زەنبەر
نەمخواستەوە هی منن سەر و بەر
ناوئاخن و پیت و تیپ بەجارێک
ریزێکی وشێکی یان و وتارێک
هی خۆمە لە کەس نەهاتە چەنگم
خۆم خاوەنی کەسم و خێوی رەنگم
ئەو گفتی شیرین و بیری سەد جوور
پاکی کچە تازەبووک و رووسوور

خوایه مەدە دەستی پیاوی لاسار
ئەو دڵبەری شۆخ و شەنگ و نازدار
پاڕانەوەمە لە خوێندەواران
بێهوودە نەکەومە لێو و زاران
بۆ گاڵتە نەڵێن ئەو و ئەمی بوو
باچاکی بکەن ئەگەر کەمی بوو
چی پاکژ و باشە پەردەپۆشن
هەر دڵ چەپەڵن کە گەڕ فرۆشن
هیوام ئەوەیە لە مەرد و ژیران
بۆ گەپ نەبمە نیشانی تیران
کرمێکم و هەوریشم لیکاوم
خۆڕستم و خۆم لە خۆم رواوم
کوردم لە چیا و کەژ و نزاری
چەند گفت و وشێکی کوردەواری
لێم وەربگرن بە سینەیی روون
لێمی نەگرن چ خۆشە خۆشبوون
دڵپڕ لە رقیش کە گوێ بدێرن
چیان لێ دێ کەمایەسیم وەشێرن
ئابڕووی بوێژی با نەڕێژن
گەر دەکرێ شتێکی باش ببێژن
بۆم پینە بکەن هەڵەی زمانم
بابێننەوە بیر منیش لەوانم

## پەسندی میری بۆتان و جووتە خوشکە جوانەکەی

رەنگرێژی پەرانی مێژووزانی
دەنگبێژی جیهانی خۆشخوانی
وانەخشی دەکرد بە رەنگی چەند جۆر
وای بۆ دەگوتم بە بەند و بالۆر
میرێ هەبوو رۆژگاری پێشوو
دڵخوازی بەچی هەبوو هەمووی بوو
سەرداری گەلێ گەلی زل و ورد
تۆوی عەرەبان و سەروەری کورد
پاتەختی جزیر و بەختی چابوو
زۆر دەستی گوشاد و شاد و شا بوو
رۆم و عەرەب و عەجەم لە فەرمان
ناوبانگی هەبوو بە میری بۆتان
خاڵندی دەگرتەوە لە باپیر
پشت پشتی هەموو زل و جهانگیر
عاسمان لەوی بێ ترس نەمابوو
شێرێکی خوا بوو دەرکشا بوو
زیانی نەدەدین و بێ بەزین بوو
ناویشی ئەمیری زەینەدین بوو
بۆ جەنگێ کە تەختی خوانی زین بوو
ئیتر نە بەزین و نەدابەزین بوو
ئازایەتیی ویت دەوی بناسی
ناوبانگی گەیشتە مانگ و ماسی

خـــواناســـیی ئـەویش بـەدەنگ و نـاوبوو
بۆ هـەردوو جـیـــهــان خـــوا پێــداو بوو
حــــــــاتـەم لە دەهـنـدەیـی بـەزی بـوو
رۆســتــەم هـەرەشـێکی وی بەسـی بوو
ژیـری و هـونـەر و رەکـــــــاری و دیـن
بەردە و بـگرەی بەداد و بـەخــــــشـین
دەتگـوت کـــــە بە بەژنـی ئـەو بڕابوو
تـا ئەو بـوو بەشـی کــەسێ نەمـــابوو
ســەد جـۆرە گـەواهـیـرات و یاقـــووت
ئـەڵمـــاس و پیــرۆزە لاڵ و زمـــرووت
داکـــرابوو بەکــۆ لـە هـەر شـــوێنێک
دارمـاڵ بوو هەمــوو کـەل و کـولێنێک
پێت وابوو کـــە هـندروو بەهـەشــتــە
کـیـــژۆڵە تژی هـەمـــوو فـــرشـــتــە
هـێند ســادە و لووسکە نۆکـەری بوو
ژوور و دەری هــــەر پـــڕی پـــەری بـــوو
لەو بـاغــــە دوو نەونـەمــــام ڕوا بوون
بێ وێنە لەناو بەهـەشـــتی خـــوا بـوون
ســوورگــوڵ دوو لە پـنجی شــا ڕوا بوو
دوو خـوشکی خـوشـیک و یەک برا بوو
دەتڕوانـی ئەگــــەر لـەســــەر روانگا
دوو رۆژت دەدی بـە دەوری مـــــــانگا
یەک پیـاوی دەکوشت بەچاوی مـەستی
ئـەو نـاوی نرابـوو خـــاتـوون ئەســـتی
ئـیـــدی لە دڵ و هـەنـاوی مـــیـــر بـوو
ئـەو ناوی لـە نێـــوی ناوی مـــیـــر بـوو

خۆت رەنگە بزانی ناوی زین بوو
بەس دیتنی زینێ دڵتەزین بوو
یەک ناوی جوانی کەوتە شاران
گیانێ بوو ئیتر لە کۆڕی یاران
یەک گەندەمی و یەکێ زەری بوو
یەک چەشنی فرشتە یەک پەری بوو
هەرگیز کەسێ جوانی وای نەدیبوو
نەمزانی هەوێنی وان لە چی بوو
لاجانگ وەکو زیو چەناگە وەک سێو
ئاونگی لە ئاوی ژین لەسەر لێو
سەر کولمە وەکی پەڕی گوڵی ئاڵ
چێنرابوو تیا دەنک دەنک خاڵ
تەنگیی دەم و دەنگی پێکەنینێ
بردیان برەوی بتانی چینێ
رەشماری کەزی لە بەژن و بالا
وەک هەورە رەشێ لە رۆژ دەهالا
چاوێنی پەڕێن بوو دێری سەر ڕوو
چاڵی چەنەگە پڕی لە جادوو
بۆ خۆشی وەنەوشە و گوڵی ئاڵ
پشکوو بوو لە جوقڵی سەوڵ و شمشاڵ
سوورگوڵ لە سەری لکان روا بوو
تاتای موو بەسەر یەکا رژا بوو
رەشخاڵ وەکو بەردی حاجیان بوو
ئەو کۆشکە حەجی ئەوان دەما بوو
ئەبرۆ چ کەوانی بێ گرێ و رێک
پەیکانی بژانگ چ تیری دڵپێک

نـازک بـه لـەش و هـەلـۆ بـه چـاوان
تۆقــیــبــوو دڵی دڵان له تـاوان
دایـان نـا ئەوانـی مــوو قــەڵیــشـن
هەر گـۆشـەیی چاوە گـیـان دەکـێـشن
توێڵی سـپی پەرچەمی رەش و کـۆ
وەک باڵی پەری له سـووچی ئاسـۆ
رۆژ کــارەکــەرێکی ناوچەوان بوو
له جـوانی به پاس و دەرکـەوان بوو
کێ کــوڵمی دەدیـتن و بنـانگوێ
مـردن بوو پەنای دەبردە بەر کـوێ
گـەردوون وەکـو قـومـقـومـۆکی بادە
پڕ بێ له گــوڵاوی روون و ســادە
هـەر کـەس کـه ببـینێ پێی دەزانـێ
ســەرچاوەی ئاوەکــەی ژیـانـێ
ســەرپەنجــه و نـینووکی خــەناوی
خـــوێنیـــان دەڕژا دڵان لـه تاوی
دینی بەر و کــەمــبــەری شل و مـل
چاوی گـەش و روون دەکـرد به بێ کل
هـەڵیــان کــه دەمــاڵی قــۆڵ و بازن
جـێـدار بوو لەسـەر جـیـهـان بنازن
ئەو دوو گـوڵه شـۆخ و شـەنگ و جـوانه
هـاتبـوونه جـیـهـان هەواڵ دووانـه
هـەرچەنده کــه ئەسـتی نازەنین بوو
زین زۆرتری خـوشکی خوێن شیرین بوو
هی وان بوو جوانی گشتی شەشدانگ
ئەستێره بوو ئەستی زین وەکی مـانگ

ئەستی وەکو مانگ و زین وەکو خۆر
چاوپیس و چنۆکی پێ دەبوو کوێر
ئەو هەردوو وەکو دوو شەوچراخان
کاتێ کە دەچوونە سەیری باخان
گیاندار دەچوو گیانیان بە تالآن
گیا و گژ و دار و بەرد دەنالآن
پەرچەم شەوەرەش لە دەوری لاجانگ
شمشێری برۆ لەسەر لەتی مانگ
پەرچوو کە لەسەر هەنی بنەخشێ
کێ بێ دڵ و گیانی پێ نەبەخشێ
رازانەوەیان بە زێڕ و گەوهەر
لەرزانە و گۆبەرۆک و کەمبەر
ئەو لەنجەیی کۆتری بە سەد ناز
لەو جووتی بەژن نەمامی چاوباز
پۆل پۆل کچی شۆخ لە دەور و بەریان
پیر بۆ دڵ و دینی خۆ دەگریان
خوانناس و مەلا و بەناو و بێ ناو
خونکارە هەزارە پیرە یان لاو
کوانێ کە دڵی نەچێتە جوانی
نرخی کە نەزانی زۆر نەزانی
هێندێک دڵ و بیر دەدەن بەتێکوڵ
هێندێ بەخوای چڵ و گوڵ و دڵ
دۆست هەریەکە بەردەشیوی شێوان
وەکو تێکوڵ و کاکڵێکە نێوان

## دیمان رانانی جوانی ئەو دوو چاوبازانەیە

هێندەی کــە خــوای بەتاق و تـەنیــا
پـوول و شــمـــەکی رژاندە دنیــا
قـەیســەر هەچی بووی لە زێڕ و زێوان
زۆرتـر لـە بژاردن و لـە پـێـــوان
هەڵمــاس و گــەواهێــراتی قــاقــان
تادەچێتــە نقـێـمــەکـەی سلێـمــان
چـی نـرخـی گــــرانە پـێی دەزانــی
نـاهێنێ کـــەمــووسکەیەک جــوانی
ئەو جــوانی لە رووی ســتـی و زینێ
دەریـا بـوو لە ئـاگـــــری ئەوینـێ
کــاتێ کــە دەکــەوتە ســەر شــەپۆلان
ســەرڕێژی دەکــرد لە گــرد و گــۆلان
بۆ هــەرچی پریشکی خــۆی دەپڕژاند
سەد گیانی دەمەو لە حاست دەبرژاند
دارا و نـەدار و کــۆک و رەشــــورووت
ئەو دووانە کــــە هـاتبـــان دەیانگوت
جـوان گەیونە یەکدی مـانگ و خـۆرن
کـــــــڕیار ئـەوە بـۆیە هـێندە زۆرن
راوکــــــەر لە رێگـەی ئەم ئاسکـانە
دڵبـــەســــتــەیی ئەم دوو نـاسکانە
گــەر بەور و پڵنگ و نێـرەشــێــر بوو
هــەر رۆژی بەرێ بە نـاڵە فــێـــر بـوو

گریان بوو هەرا بوو رۆژ ئەگەر شەو
هەرگیز نەدەهاتە خەونەوە خەو
هەر جوانییە بێ بن و کەنارە
دڵداری گەلێکە بێ ژمارە
دڵدار هەیە مەردە گیان دەبازێ
ئی واش هەیە وردە ماچ دەخوازێ
یەک یاریی دەوێ لە بەزم و یاری
یەک گیانی شیرین دەدا بە یاری
لێومشتنە بۆ ستی و تاژدین
خۆکوشتنە دێتە رێی مەم و زین

## ئازایەتیی تاژدین و برایانی و دۆستایەتیی مەم و تاژدین

با بێـــینەوە ســـەر وتـارەکـــەی پێش
ســـەوداســـــەری دڵبـــرینی پرئێش
هـەرچەنـدە کـــە زۆر و بێ ژمــــاربوون
گـچکە و زل و خـوێـڕی و بـەکـاربوون
لەو کـۆشک و سـەرایەدا بوو سـەد لاو
خـوێن شـیـرین و ڕێکوپێک و بەرچاو
هـەریـەک بـەجـــوانـیـی ڕۆژی ڕوونـاک
ڕووخــۆش و لـەبار و دەست و دڵپــاک
وەک مـانگی لە چاردە، بێـیـە ڕاسـتی
مـانگ زەرد بوو کە یەک دەهـاتە حاسـتی
سـەوداسـەری پیشـەیان بوو گـشـتی
بەسـتـبـوونی ئەوین بەداوی گـشـتی
یـــەک ڕازی دڵـــی یـــەکـــی دەزانـــی
گـشـتی دڵی چووبـووە سـەر زمـانی
ســــــــەودا لـە دڵا نـەوەک بـەدیـتن
ئەم جـــــۆرە ئەوینە کــــەم بە پیتن
تێـــــیـــــدا بـوو لـەوانـە تـازە لاوێک
سـەردەسـتـەی گـشت و خـێـوی ناوێک
تـاژدین بـوو، بـەڵام چـتـــۆ جـــوانێک!
گــــۆدەرزی جـــیـــهـــان و پاڵەوانێک

میر کامە رەگەز بوو ئەو لەوان بوو
سەر کۆمەڵ و گەورە و گران بوو
ئەسکەندەری ناو بوو بابی جوامێر
بیستوومە عەرەب پێیان دەگوت شێر
چون رۆژی هەرا بەتاقە سواری
دەیتوانی بەرێ سەری هەزاری
تاژدین دوو برای بوو کوا وەکی وان
پێمیردی خوا دەگەڵ چەکی وان
ئازایی لە پاش ئەوان درۆ بوو
یەک عارفی ناو بوو یەک چەکۆ بوو
تاژدین لەسەر ئەو هەموو نەمامان
لە برای و لە خزم و خاڵ و مامان
لاوێکی تری کەس و برا بوو
چم وت؟ نەبرا بوو شەوچرا بوو
هەر رۆژێ کە ئەو برای نەدیبوو
وا بزانە بەشەو چرای نەدیبوو
دنیا بوو لەبەر دووچاوی تاریک
تای کرژی دڵی پساو و باریک
هاوالی دەمانی خۆش و خەم بوو
دڵبەندی خەمان و ناوی مەم بوو
ئەو چۆن بوو مەمیش لە ڕاستی وابوو
تاژدین نەبێ چی لە بیر نەما بوو
مەم رۆڵەی نووسەرێکی میر بوو
تاژدین کوڕی گەورەتر وەزیر بوو
هەڵیان نەدەکرد بەبێ یەک و دوو

جـــيـــاوازی بـەدڵ نەبوو بـە لەش بـوو
ئەم جـووتـە بەجـۆرێ دڵ لە یـەک بوون
دەتوت کـە بووبوونە لـەیل و مـەجـنوون
زۆر پێکـەوە هـۆگــــرێکی پـاک بـوون
جووت بوون و لە خۆشـەویستی تاک بوون
بۆ یـەکدی بـووبوونە دۆسـتی گـیـانی
دەرچـوو لـە زمــــــــانی و لـە نـانـی
بـــا وابـــێ هـــەواڵــەتـــی و بـــرایـــی
بێـــهـــوودەیە دەمـــدەمی و هـەوایی
هـاســـان نیـــیـــە دۆســـتی گـــرانـە
دۆســــتـــــایـەتی و ئـەمــــەگ برانـە
گـەر دڵ بە گومان دەبەی خـۆت
دۆسـتی مــەکـە زۆر گـران دەبێ بۆت

## جێژنی نەورۆز

بڕوانە خـــــوای بڵند و زانا
چی کردووە لە هەردوو عـاسـمـانا
بێ مـشـتـەو و رەندە بێ گـەز و گـاز
وەسـتـایەکـە ناگـەرەکـیـە ئامـراز
یەک گـەورە و یەک درێژ و یەک خـڕ
والا و بەنێـــو و نیـــوە پڕ
دەرکـەوتووە گش لە کـارگـای ئەو
سـەرسووڕە جیهان لە بارەگای ئەو
سـەیریش ئەوە گشـتـیـان لە کـارن
هێندێکی پیـادە هێند سـوارن
هێندێ بە هـەران و هێندێ وسـتن
دەسـتێک پەلەکار و هێندێک سستن
یەک دێت و یەکێ دەچێت و دەسـتێ
هەروا لە گـەڕە و هەشـە دەوەسـتێ
هێندێکی دەنووسێ و هێندێ وەستان
یەک سـەربڕە یەک بوێژی بەسـتان
یەک خـەم دەڕەوێنێ یەک کـزووڵکەو
یەک ڕۆژ دەپەرستێ یەک چرای شەو
هێندێکی بەچەشنی زینی نازار
هێندێ وەکـو مـەم دەبن گـرفـتار
سـەرپاکی بەرۆشنی و جـوانن
هێند شـاهن و هێند وەزیری وانن

ئەستێرەی هێندێ بۆیە ناردوون
هێنانی بەهاری پێ سپاردوون
ساڵ تازە دەبێتەوە کە هاتن
سەرما دەکەوێتە سەر هەڵاتن
گێڕایەوە بۆم پیاوەکی پیر
پیرێکی بە بیر و زیت و دڵژیر
گۆیا کە لە ڕۆژگاری پێشین
جەنگە و هەڕەتی کە دەر دەبێ شین
واتا کە دەبوو بەرۆژی سەرساڵ
هەرکەس دەردەچوونە دەشت و بەرپاڵ

کیژ و کوڕ و لاو و کۆنە ساڵان
باپیر و نەنک لەگەڵ منالان
جێژنی هەرە زل بوو جێژنی نەورۆز
تا پێوە بنووسێ جێژنی پیرۆز
تاکی نەدەمایەوە لەناو ماڵ
دەیدا لەدەر و لە چۆڵگە بای باڵ
نەخوازە کوڕ و کچی گەیشتوو
چی هێشتە لە یەکدی چێژ نەچێشتوو

ڕازاوە لە خشڵ و بەرگی باشا
چاو تێر بوو هەمووی لەبەر تەماشا
هەر لاوێ لە بیری خواستنایە
با کیژێ ببینێ چی تیایە
ڕۆژێ کە دەچوونە گەشتی دەشتێ
دەشت مشت بوو لە میوەی بەهەشتێ

هەر جوان بوو لەیەک دەبوونە کڕیار
سەودا بەدڵ و بەچاوە بڕیار
هەر تاک بوو لە جووتی چاو دەگێڕا
تاک بۆی دەچوو جووت دەهات لەوێڕا

## سەیرانی جێژن و دەزگیران گرتن

دیسان کە نواندی جێژنی نەورۆز
لە گوێرەی ڕێ و شوێنی پیرۆز
گش ورد و درشتی ناو جزیرێ
بیگرە لە شوانێ تا وەزیرێ
شاری و ڕەمەکی و گزیر و هەرچی
تێیدا بوو شڕە و گەڕۆک و چەرچی
پۆل پۆل دەگەڕان لە کێو و دەشتێ
خەمیان دەپەڕاند لە سەیر و گەشتێ
هێندێک بە پەیا دەچوونە باخان
سواران دەگەڕان لە کێو و شاخان
هێندێکی بە یەک یەک و جودایی
دەستێکی بە گەل بە دڵ تەبایی
هێند هاتبوو خانم و ژنی جوان
دنیا پڕی گوڵ بووبوو لە بەر وان
تێی هاتبوو هێند پەری و فرشتە
تا وابێ بەهەشتی گەورە دەشتە
کیژۆڵە و لاو ڕوو بەخالان
لێوقەند و مەمک دوو لیمۆ کالان
خونچەدەم و ڕووبەخاڵ و خوێن سووک
لاوی تەڕ و تازە لووس و بێ تووک
کڕیار و فرۆش هەموو جوان بوو
نرخ و بەنرخ لەسەر ڕوان بوو

نــازداری دەهــاتــە بـاری ســــــــەودا
نـەک کــۆنـە پـەڕۆ و کــەڵاف و هـەودا
جـــوانـچـــاکـی دەهـاتـە نـاو تـەرازوو
چاو کـــاری دەکـــرد نـە زۆری بـازوو
ئەو رۆژە کە دەبووە جێژنی سـەر ساڵ
منداڵی دە سـاڵ و پیـری سـەد سـاڵ
خـــۆیان نـەدەهـاتـە بیـــر چـە جــارێ
ئـاهـەنـگ و بـەزم بـوو تـا ئـێـــــوارێ

## خۆ گۆڕینی تاژدین و مەم لە بەرگی کیژاندا

پرشنگی چرای لە گومبەزی شین

کردی دەمێ خاکەلێوە رەنگین

رێ و شوێنی گەلێک لەمێژ و زوو بوو

ئەو رۆژەیی جێژنە بۆ پشوو بوو

هەر رێگە درا بە کیژ و لاوان

دانێکی نەمان لەماڵی باوان

کچ دەچووە دەرێ دڵێکی ببرێ

کوڕ دەچووە بەرێ گوڵێکی بکرێ

تاژدین و مەم ئەو دوو شێردڕانە

پۆشییان شمەک و جلی کچانە

هەوری لە ملان بە ئۆیە دەسماڵ

تافتە کوڵەجە کراس و لێوئاڵ

کاکۆڵ بوو بووبوو بە بسک و پەرچەم

هەردوو کچی قۆز ئەگەر ببا مەم

هەر بۆیە بوو کەس ئەوان نەناسێ

باش گوێ دەنە بەزم و دەنگوباسێ

بیانهێڵە بە بەرگی نازەنینان

با بچینەوە لای ستی و زینان

## گرفتاربوونی مەم و زین و ستی و تاژدین

### بەداوی ئەوین

هەردووک دەگــەڕان بە بەرگی گــۆڕاو

رامــان لە شــتــێکی ســەیری ناکــاو

دیتـــــیــــــان لە پڕێ لە هەر دەرێکا

هەر کــووچە و کــۆشک و پەنجــەرێکا

چەند تازەجــوان لە چەشنی ســەروان

پارچەی هەمــوو جــۆر و رەنگ لەبەر وان

پۆل پـۆل کچ و لاو بەدەســتــە دەســتــە

هێندەش ئەوە پیــری دار بە دەســتــە

هــێند زگ زل و هــێندێ لات و لــووتــن

هێندە پۆشتــە و هێندی رووت و قــووتن

هــێندێکی گـــران و هێندێ ســــووکن

هــێــندێکــی زەلام و هــێــندێ چــووکــن

یەک کــاڵە لە پێ یەکــێکە پێ خــواس

یەک قــیــژە دەکــا یەکێ وڕ و کــاس

یەک ســـەرقــژنە یەکــێک بە کــاکــۆڵ

یەک خـۆڵ وەســەرە یەکێ لەســەر خـۆڵ

پیــتــۆڵە یەکــێک یەکــێک بە تیــتــۆڵ

یـەک بۆڵـە دەکـــــات و یـەک رووەو چـۆڵ

مــرکــیــوە یەکێ یەکێ لەســەر جــۆش

هێندێکی خەواڵوو هێندێ ســەرخـۆش

هێندێ لە بڵند و هێند لە چاڵن
هەریەک لە هەوایەکی دەناڵن
گوێ پڕ بوو لە ناڵەیی بە زامان
هەرتک بە وڕی سەرێکی ڕامان
تاژدین لە یەکێکی پیری پرسی
لالۆ چییە ئەو هەرا و مەترسی
پێی وت کچەکەم دوو نۆنەمام کوڕ
ئەمڕۆ لەمە بوونە میری سەربڕ
هەر کەس کە ببینێ ئەم دوولاوە
ئیتر ئەمە هۆشی نا بەلاوە
وتیان ئەتۆ دیتن ئەو چڕەنگن؟
فەرمووی بەڵێ دوو کوڕی چەلەنگن
گوتیان کە هەیانە تیر و خەنجەر!
یان شیری شەتەکدراو لە کەمبەر!
فەرمووی کە بەسیلە چاو و ئاوڕ
لەم کۆمەڵە بوونە جەرگ و دڵبڕ
لەو پرس و وەرامەدا لە ناکاو
دڵ ترسی لە چی بوو هاتە بەر چاو
بێ وێنە دوو کوڕ دوو تازە لاون
سێبەنگی برۆن و مەستە چاون
یەک ڕەنگ و شمەک گەلێ تەیارن
بێگانە و ڕەنگ نەناس دیارن
بالا کەڵەگەت نیان و نەرمن
تا چاو دەیەوێ بە ناز و شەرمن
هەر لەو جێ کە چاو کەوت بە چاوان
یەکجێ فڕی هۆش و دڵ لە تاوان

فــرمــێــسک دەڕژان لە چاوی تاژدین
مـــــەم بوو بە بـەفـــر لە تاوی هـاوین
بەو تاوی جــوانی تاس و گــێـــژبوون
بـێ هۆش لـە چەقـی ڕێگا درێژ بـوون

ئەو هەردوو کــوڕی بەناز و نیـــمـــاز
دیتن دوو پەری شــــــەهێنی چاوباز
ڕۆژن وەکـــــو مـــــانگی رەنگ زەردن
دڵـــدار و شــکـــاوی بـــەردی دەردن
وەک تازە کـــوژراو بەهەڵبـــڵـــۆقن
بـەو تـیـنـی ئـەویـنـە هـەڵدەچـۆقـن
دوو ســواره بەزینە ســەر نێـچـیـران
دیتـــیـــانن و کـــەوتنە چاڵی بیـــران
زانییـان کـە نێچیـرەکـان قـەڵەو بوون
بـازگــــیـــــرە لە داو نەزەرەکــــەو بـوون
وێســـتـــان و روانـیـــیـــان بە گــەرمـی
دڵیـــان کـــوڵی کـــەوتە باری نەرمـی
لەو جـــوانیـــیــــە بەم دوو ئاسکانە
ســــــــووتـا دڵـی ئـەم دوو نـاسـکـانـە
دڵیـــــــان بە دڵـی یـەک ئـاشـنـا بـوون
دڵ ئاوێـنـە بـوون و ڕوونـومــــــا بـوون
دڵ بوونە هـەواڵ لە ســــــووچی چاوا
کــــۆچ کــــــردبوو دوو دڵی لـە نـاوا
خـوا هێندی لە خـۆشـەویستی پێ دان
دڵداری وەهـای لـەیـەک گــــــرێ دان

دەتگوت کە چوار گیانە یەک لەش
گیانێکە لە چوار لەشان بووە بەش
راستت دەوێ هەر یەکن لەش و گیان
رۆژی بەرێ یەکیەتی بوو بەشیان
گیانان هەموو پێکەوە تەبا بوون
کاتێ کە لە بارەگای خوا بوون
ناردوونیەتە گرتووخانەکەی لەش
ئەو رۆژە جیاوەبوون بە دوو بەش
هێشتا برێ مرچ و مۆڕ و گرژن
ئەو تیرەیە ناو نران بە دوژمن
دەستێکی لە یەکدی بوونە دڵدار
ئەو دەستی کەوت ژیانی رزگار
وێ رۆژی لە گوێری ئەم سرشتە
تێکەڵ بوو دڵی دوو جووت فرشتە
کاتێ کە گەیینە سەر دوو زامار
ئەو دوو کوڕی دیدەمەستی نازار
دوو گوڵ دڵی دایە دووی وەکو گوڵ
پشکووت گوڵی دڵ رژا گوڵی دڵ
بوو رانی ستێ سەنیری تاژدین
جێی گرت سەری مەم لە باوەشی زین
لێویان دەخشاند بە کوڵم و خاڵا
چاو تێر نەدەبوون لە بەژن و باڵا
وتیان دەبێ ئەم کچانە چی بن
تۆ بڵێی کە فرشتە یان پەری بن
ئەو میوە لە باخی کێ چناون
ئەو گوڵ لە چ گوڵبنێ رواون

دوو تازە نەمامی کام دەراون
رەگیان بەگوڵاوێ ئاو دراون

فرمێسکی لە چاو و خوە لەسەرسنگ
لەو دوو گوڵە سیسە بوونە ئاونگ
سەرخۆشی ئەوین بە بۆنی وا خۆش
پێم سەیرە کە هیچ نەهاتنەوە هۆش
تاببنە هەواڵی دیدەمەستان
ئەنگوستیلە دەرخران لە دەستان
گۆڕیاننەوە کلکەوانەیی خۆ
نایانەوە داو دانەیی خۆ

هەڵماسی نقێم دران بە شووشە
کار هەر بە دڵە شتی دی پووشە
شیرنایەتیی جێژنە بوو بە تاڵی
قاڵ بوون بە ئەوین بەسە مناڵی
تاوپەڕ بوو و بەجێ نەما لەوێمان
خۆش رۆین و دووی نەخۆش بەجێمان
تاژدین و مەمی بەدڵ بریندار
پێوەندی دوو ئاسکی ناسک و نازار
وشیارەوبوون شەوە شەوەزەنگ
بەس ناڵەیی دڵ نەبێ نییە دەنگ
دوو رۆژی بە رۆژ ون و نەدیون
وەک مانگەشەوێکی رەنگ پەڕیون
بێ هێز و کز و سڕ و کڕ و تاس
بێ تین و توان هڕ و وڕ و کاس

لاواز و زەبوون و نیــــوە مـــــردوو
بەشلێک و دڵێکی جــــەردەبردوو
تـاگـــــەینـەوە مــــاڵ بـە لارەلارە
لێی بوونە تخــێڵ بە جـــەرگی پارە
نە زمـان و نە سـەر نە خـواردن و خـەو
لایان وەکـو یەک بـوو رۆژ لەگـەڵ شـــەو

## تاژدین و مەم بە دەردی خۆیان دەزانن

ئەو باز و شـــــەهێنی پەڕ پرووزاو
تـاژدیـن و مـــــــەمـی دوو دیدە درواو
بـۆ پۆڕ و کـــــەوان دەچوونـە راوێ
چۆن راوێ بە جـــووتە کـــەوتنە داوێ
لێی دان لە پڕ و ناکـــــاو بریسکێ
ســووتان نـەبوو هەڵبـدەن هەنیـسکێ
حەورۆژەیی جێژنە هات و چوو خۆش
ئەم جووتە لە جێ نەخۆش و بێ هۆش

چەند رۆژی تریشـی هات بە شـــوێنا
ســەریان کـە لەســەر ســەرین هەڵێنا
لێــــڵایی لە چاو و ڕەنگ بزڕکــــاو
تـارمـــــــایی نـەبێ نـەهاتە بـەرچاو
تاژدین بە مـــەمی دەگـوت ئـەتۆ کـێی
مـەم سڵ بوو پتـر لە راسـتی هاوڕێی
دەرمـــان و بژیشک و نوشت و یاسین
تـا هـاتـنـە ســــــەر یـەک و دووناسـین
خـــۆیان دی لە پێـــچی پاچە بەندان
پێچراو لەش و گیان بە چەند کەمەندان
بـــێ چـاو و بـــێ دان و ئـاو و بـێ تـاو
بێ باڵ و لە دڵ برین و لـەش خــــاو
وەک چاوی جوان نەخۆش و سەرخۆش
وەک خـاڵی لەســەر رووان ســیـاپۆش

وەک خـــونچـــەیی زاری یار دڵتـــەنگ

نـاڵین لـە رەگـی دڵان وەکــــــو چـەنگ

وتیـــان دەبێ بـۆچـی ئێـــمــــە وابـین

کـەی جــەنگ بووە ئـێـمــە هەنگوابین

یان بۆ چـی وەها کــــز و زەبوونـین

پــڕ دەرد و بـــریــن دەر و دەروونـــین

بەو گـێـژییـە لە گێژی بیر و خـەمـدا

تاژدین دی لە دەسـتی کـاکـە مـەمـدا

ئەنگوسـتـیلەیەک نقـێم لە گـەوهەر

دەرناکــا لـە نرخی کـەس سـەرەودەر

وەک دەنکی هەنار و ئاگـری ســوور

شـــەوبـایە دەڕۆیـی تیـشکی بۆ دوور

نووســـراوە لـەســـەر وی نـاوی زینـێ

کـێـشــای دەسی باشــتـری ببـینـێ

مــــەم دی لـەدەسـی ئـەویـش نگینـێ

هێـژای هـەمـوو گـەنجی سـەر زەمـینێ

بێ هـەسـتێ کـە سـەیری کردە دەسـتی

رەنگیــوە بەنـاوی خــاتوون ئـەســتی

دوڕناسـی جـیــهــان لە راست ئەوانە

هـێــــڕ و وڕ و گـــێل و هـیـچ نـەزانـە

سەد هێندە بە سـەنگی گەنجی قاروون

هـەر زێڕی هـەیـە و هـەچـی لە نـاوچوون

ناهێنێ لەوانە هێـشـتـە هەشت یەک

هیـچیــان بۆ نەمـا جیـا لە یەک یەک

یەک یەک کـە چ باشن ئەو نقـێـمـە

ناسـیـیــان بەمــە یاری دڵڕەقی مــە

هەرچییان بەمە کرد ستی و زین بوون
وەدیارە کە فێری دڵ دزین بوون

گۆڕییان لەمە خۆ بەبەرگی گۆڕاو
لاولاو بە دوولاو دەهاتە بەرچاو
ئەو بوون کە لە رۆژی جێژنە هاتن
وتمان ئەوە مانگ و رۆژ هەڵاتن
ئەو دوو پەرییانە دەستوەشێن بوون
ئەو خوێن شیرینانە خوێنرژێن بوون

ئەو بوون کە لە ئێمە بوونە دڵبڕ
ئەو مامزە بوون کە بوونە شێردڕ
ئەو هۆشی سەری مەیان رفاندن
هەرزان بوو لە نرخی چاو چراندن
تاژدین کەمێ هۆش و بیری لابوو
مەم نابێ بپرسی هەر نەما بوو
تێی راخوڕی مەم دە هەستە بەس بێ
تاکەنگێ تخێڵ دەبی لەناو جێ
شێرین ئەمە ئەو دوو ئاسکی ماڵین
شوورەییە لە دەست ئەوان بناڵین
مەم هاتە وەڵام بە ناڵە ناڵی
تاژدین وەدیارە هێشتا کاڵی
زۆرتر لە تە خۆم شلۆق دەبینم
زۆر کاریگەرن هەموو برینم
مەمبینە کەوا لەسەر زەمینم
کوژراوی ئەوینی چاوی زینم

سـینەم هـەمـوو هـەنجنە بە برژانگ
گـیانم بووە گـیر لە مـاهی لاجـانگ
بێ شـوێنە دڵم لە پرچی رەشـدا
وەک نەشتەرە هەرچی موون لە لەشدا
بەو شـیـری برۆی کـە تازە سـاون
بەنـدبەنـدی دڵ و جگەر پـسـاون
ئارا لە چە جـێـیـەکم نەمـاوە
تۆ ئەو مـەمی دیت نەمـا تواوە
دڵداری بە راسـتی دای بەسـەرمـا
لەو هێـرشـەدا نەدڵ نەسـەر مـا
گـیـان و جگەر و دڵ و هەناوم
دەست و سـەر و پێ و پشت و چاوم
سـوێندم بە خـوا نیـانە ئارام
شـێتن هـەمـوولا لەلام نەمـا رام
تا مـن بەدەمم دەمێ دەکـەم شین
ئەو هەریەکە بۆ خۆ بانگ دەکا زین
وا دڵـرەقـی بـەو ژیـانە تـاڵـە
تووش بووم و دەڵێی بەسـە و مـەناڵە
وان بێـڵـە بە ئاخ و داخ و ناڵان
بابێـینەوە سـەیری چاوکـەژاڵان

## زین و ئەستی بە چ دەردێ چووبوون؟

هەر چوونەوە ماڵێ بەو جلانە
رووت بوونەوە ئەو کەمەر شلانە
هەرچەندە جل و شمەک کە گۆڕان
چۆن دێنەوە رەنگ و دڵ کە دۆڕان
دڵداری لەناو دڵان خزیبوو
گوڵ رەنگی لە کوڵم و لێو دزی بوو
کەس نەیدەگوت ئەو ستی و زینن
پێت وابوو کە خەڵکی ژێر زەمینن
پیرێژنی دێوی ئەم جیهانە
تایەن بوو لە کۆشکی ئەم کچانە
فەرهادکوژەکەی لەلا تکێک ئاو
گەڕبازی بەناو و حەیزەبوون ناو
ئەو هات بەسەرا لەوان دەماندا
چاوێکی خشاند بە رووی کچاندا
دیتی چە ببینێ دووی کز و لات
ئەی خوایە ئەمانە چییان بەسەر هات
وا ماتی خەیاڵ و دوورە ئاگان
بەرچێڵە ونی دەکا چەناگان
رووی رۆژ چییە بوونە مانگی یەکشەو
چاوباز کڕن ئەمڕۆ بوونە مێکەو
خوێن بوونەتە بەفری تازە باریو
یاقوتی دوولێو سپین وەکو زیو

کوا کاتە کە زەرد بن گوڵی سوور
دەک ڕۆڵە لە چاوی پیس و بەد دوور
ئەی هێزی دڵ و کزەی هەناوم
هەریەک لەوە ڕۆشنایی چاوم
پارێزەری ئێوە هەر خوا بێ
بالآ و هەموو کاتێ بێ بەلآ بێ
وا ئێوە ئەوەند لە بەند و بەرچاو
چۆن چوونە دەرێ بە جووتە بۆ ڕاو
چۆن وا زوو گەڕانەوە بەرەو ماڵ
چۆن سەیرو نەکرد لە جێژنی سەرساڵ
بێژن شتەکە چییە و چە ڕەنگە
سەرگێژییە یان خەیاڵی بەنگە
گیران بە چە داوێ چۆن تەڵێکە
هۆی ئاگرە هەرچی دووکەڵێکە
دەنگێ بکەن و نەکەن کچانم
من بۆ خۆ هەموو شتێک دەزانم
قومێکی دەپێژم و دەڕێژم
چو دیوە لەڕێوە پێو دەبێژم
شیشۆقە و مورووی تێکەڵاو کەم
چیتان لە دڵایە لێو بڵاو کەم
گوتیان بەدزی بە پیرە زاڵی
لەو کاتەوە چووینە دەر لە ماڵی
هەر کەس کە دووچاری ئێمە بوو زوو
شێت بوو و دڵ و هۆشیان لە دەس چوو

ئەم زۆرییە زۆرە هاتە ڕێمان
پێوەندی ئەوینێ هاتە پێمان

شێت بوون بەمە زۆر و دای لە سەریان
ئێمەش ئەوە بووینە شێتی پەریان

هەر بستێ لەمان ئەمانە دایە
لووسایی زمانی کەوتە کایە
چاومەس دەسەرو گەڕێم هەزار جار
ئێوەی کچی پاتشان و خونکار
کێ بێ کە ببێ لە ئێوە بێباک
کێ بێ کە نەدات بە ئێوە پێتاک
دەستان کە بەدەستی هەر کەسێ دا
دەیدا سەر و گیان و دڵ لە رێدا
نەخوازە کە ئێرەیی بێ دڵدار
من بیگەمێ ئێستە دێتە بەر بار
کام داری بڵندە دای دەهێنم
هەر شێتی دەکەم دڵی دەسێنم
وتیان هەموو وایە هەرچی دەیڵێی
ناسراوی لە لای ئێمە تۆ کێی
دەرمانی برینی مەت لە دەس دێت
شەرمێکە دەمانگرێ بڵێین پێت
دەردی مە گەلێک بە ئێش و ئۆیە
رێ کوێرە بە دڕکە پڕ کڵۆیە
چەندەی هەیە کیژ و کوڕ لە بۆتان
چەند هێندە کە ناو براوە بۆتان
هەرکەس بەجوانی ناوی داخەن
نووسراو لە سیایی ئێمەدا هەن
لەم شارە هەچێکی مەستە چاون

دیومانن و گشتی ناسراون
ئیمرۆکە دوو کچ بە ئاڵ و واڵا
وەک یەک بەشمەک بە ساڵ و باڵا
دوو رۆژ کە هەڵێن بزانە هەو بوون
هەنییان وەکو مانگی چاردەشەو بوون
تووشیان بوو بە تووشمان لە ناکاو
چۆن دڵ نەپەڕێت و ئاو نەکا چاو
هەر چووینە نزیکی وان بەدیمەن
دیمان نە لە ئاو و گڵ وەکی مەن
وەدیارە فرشتە یان پەری بوون
دوو سێوی بەهەشتی داوەری بوون
ئەو بۆ مە بە جووتە کەتنە داوان
ئێمەش ئەوە شێت دەبین لە تاوان
روومان وەکو مانگ و رۆژێ وا بوون
ئەو ئاوێنەیەکی روونوما بوون
ئەو شووشە ئەمیش چرای بەرانبەر
تیشکی مە گەڕاوە بۆ مە لەو سەر
شۆقێ کە گەڕاوە دای لە ئێمە
تاواندی دڵی مە های لە ئێمە
سەر کوڵمی مە ئاگری بە گڕ بوون
ئەو وەک دوو چرای لە رۆنێ پڕ بوون
گڕ گرتی و کەوتە هەردوو لامان
دڵ بووەتە مەکۆی برین و زامان
سووتاین گش و ئێستە کۆی زوخاڵین
لات وایە کە نوقمی ناو خەیاڵین

## تایەن لەم وتانە سەرگەردانە

دایەن سەری سوور بوو لەم وتانە
رووی کردە کچان وتی: چتانە
چۆن ئێوە نەچوون بە تیلی چاوان
کوڕ راوکەن و دڵ بەرن لە لاوان
بۆ خۆ و کچ و کچ دەبن بە یارو
لام وایە شەڵۆقە کاروبارو
دڵداریی کچان لە ئێوە نایە
کەس ناچێتە سەمایە بەو هەوایە
پێویستە کچان بە کوڕ بنازن
لاویش گەرەکە کچان بخوازن
بێهودەیە کچ لە کچ کە جووتە
لاو لاوی بوێ لە هۆزی لووتە
کچ سوورگوڵی دەسچنی خوایە
کوڕ ئاوی ژیان و ژینی لایە
کوڕ خوێن و کچیش لەشن هەتا جوێن
بێ خوێن لەشن و لەشانی بێ خوێن
تا بێ کچە کوڕ شەوە بەبێ مانگ
تا بێ کوڕە کچ نوێژە بەبێ بانگ
کچ بۆ کچێ چۆن بە هاوسەری بێ
جا با کچی پاتشای پەری بێ
خوسرەو کە نەبا سواری شەودێز
شیرن لە شەکر دەبوو بە پەروێز

فـەرهاد و شـیـرین ئەگـەر نەبوونا
رووشـێک نەدەهات بە بێـسـتـوونا
ئەو گش کـوڕ و کـاڵە هەن لە شـارا
بەگـزادە و سـادە سـاز و دارا
چوونو دڵ و دا بە دوو کـچـۆڵان
چڵکاو چڵـەپێنی دەرک و کـۆڵان
بێ ناو و نیـشـان و کـەس نەناسـان
کـارێکە نەهێندە سـووک و هاسـان
من دیمەوە هـیـچ مـەبن هـەراسـان
خـەودیتەن و هێشتـە هەر لە تاسـان
ئەو چەڵتە چەڵت کە کەییە گوێی زین
تێی راخـوڕی بەسـیـە پیری سـەرشین
نازانی دەڵێی چی کـۆنە فـەرتووت
هۆشت نیـیـە چی دەڵێی و چت گـوت
نەتگوت کـە قـوم و گـڵی بە باکـەی
پێت دەکـرێ نهـێنی ئاشکراکـەی
ئێـسـتـا کـە دەڵێی خـەیاڵ و خـەونە
بیـرت وەکـو خـۆت رزیو و کـەونە
ئەو جـووتە فـرشـتـە یان پەری بوون
کچ یان کـوڕ و کێ و کـێندەری بوون
دیومـانن و دەشـتـەوێ نیـشـانە
ئەنگوسـتـیلەیان لە پەنجـەمـانە
گـەر جـادووگـەریت نەهەر زمـانە
بیـانبـینەوە خـێـوی کلکەوانە
پیـرێژنی زمـانـدرێژ و جـادوو
دەرخـەن لە دەسـو کـوتی دەجـا زوو

تا رۆژ ئەوە دەست بە دەسنوێژم

خەو ناچەژم و قومێ دەپێژم

خێویان چە پەری و چە دێو و خێوە

دەیناسم و پێو دەڵێم لە رێوە

گورجێ ستی دایە هەنگولیسک

زین دادی دەدا دەگەڵ هەنیسک

پاڕاوە لە تایەنێ بە گریان

لێم دووربێ جگەر دەبێتە بریان

گۆمێکە لە خوێن دڵی هەژارم

هەرچەندە بڵێی ئەوەندە پەژارم

ئەو کاتە کە گێژی دڵ دەجۆشێ

گیانم بەرەو چوونەدەر دەکۆشێ

فێنکی کوڵی دڵمە ئەو نقێمە

لێم ون بێ جگەر دەبێتە قیمە

سوێندت بە خوا دەدەم گەلێ زووم

بۆ بێنەوە تاکو بۆی نەمردووم

## تایەن دەچێتە کن نوشتەنووس

پیرێژنی سەلکە تەپڵە گوێنی
بوولێڵە کە دەرکەوت نهێنی
خۆی کرد بە کوڵیتی جادووێکدا
تۆرتۆی دەمی سەلم و تووری لێک دا
من بێوەژنێکی بێ پەسیوم
بێ خانە و لانە و بێ بژیوم
پەرژینی بە گوڵ بێ دوو کوڕم هەن
دووی بێکەسی زۆر شڕ و وڕم هەن
چووبوونە گەڕانی چۆڵ و دەشتێ
تووش بوون بە رمۆزنان لە گەشتێ
هاتوونەوە شێت و رەنگ بزرکاو
نە شتێکی دەخۆن نە لێک دەنێن چاو
بێ هۆش و زمان لە جێوە کەوتن
نەمماوە حەسانەوە و سرەوتن
دوومێنەکەیان لە دەستی ناون
دەسیان لێوەشاوە هەنگاون
بڕوانە چییە بڵێ بزانم
دەردت لە کزەی دڵ و گیانم
فێدارییە شێتییە دڵئێشە
چارەم بە چییە و چ ڕێم لە پێشە
هەرچی هەیە لەم دووانەڕایە
ئاڵە و شەوە دەستیان تیایە

خێویان چ مرۆ و چ خێو و دێون
پێمی بڵێ کێن چن و چ نێون
جادووگەری ژیر و سووک لە شانان
زانا بە گەڵێ وشەو و زمانان
ئامڕاز و پسوولە کۆنی رانان
دەیڕوانی لە سووڕی عاسمانان
"جووتەی کەو"ی گەش نزیکی یەک دین
دەرچوون ئەوە بوون ستی و تاژدین
سووڕاندی گەیشتە "لەیل و مەجنون"
بەریان تەمی خەم بوو زین و مەم بوون
جادوو گوتی بەسیە پیرە دایە
هێند زۆرە درۆت دوایی نایە
لێم بووی بە گوریسی ناو هەمانە
راستی بکە پیشە بەس لەمانە
کوانێ کوڕی چی هەڵی دەبەستی
هاتووی لەدوو کاری زین و ئەستی
لەو دەشتە لە رۆژی جێژنی نەورۆز
تووشیان بوو بە تووشی دوو کوڕی قۆز

دوو مانگ و دوو رۆژ بەیەک گەیشتن
یەکدەم دەم و دڵ دەیەک گەیشتن
ئەم جێژنە کە دێ لە کوردەواری
زۆر پیشە و باوە کۆسەکاری
بوو بەرگی کوڕان لە ئەستی و زین
لە کوڕان بوو جلی کچانە پەرژین

ئەو بوون لە گڕەی ئەوینی بێهۆش
ئەم بوون لە مەیی جوانی سەرخۆش
ئەو سووتەڵی گڕمەلای ئەوین
ئەم تینووی کەربەلای ئەوین
گۆڕییانەوە کلکەوانە دوو جووت
شیشۆقەیی شین بە نرخی یاقووت
تایەن وتی تۆم گەشەی دڵانی
پسپۆڕی هەموو شتێک دەزانی
ئەو جووتە کوڕەی ئەوەندە قۆزن
کێهە ڕەگەزن لە کامە هۆزن
بەگزادە و خانەدانی شارن
یان بۆرەپیاگ و باب هەژارن
فەرمووی لە ڕەوشتی دڵتەڕیدا
سەودایە هەیە دەڵێن لەویدا
دوو دڵ کە بەیەکتری گەیشتن
پێغەمبەر و خواشیان لە پشتن
نەخوازە ئەوانە دوون شرین کوڕ
مرواریيە یەک یەکی وەکو دوڕ
یەک ڕۆڵەی نووسەرێکی میرە
یەک خزمی نزیک و باب وەزیرە
ئەو تایەنی پڕ بڕ و بەهانە
پێی گوت کە نیشانە نین ئەمانە
دڵداری ستی و زین هەزارە
هەی هو چ هەزارە بێ ژمارە
کاروانکوژی چاوی ئەو دووانە
پیریش دەکوژێ چە جای جوانە

لێت روونه کــــه چەندە لەم چزیرە
بەگــزادە و خـــان و مـــەزن و مـــیـــرە
چاکـــــــەی بکە پەردەپۆشی لادە
کــێن ئەم دووە ســـادە گـــەورە زادە
بڕیاربـێ بزانم و بیـــــــاندوێنم
چل زێڕی بســــــێنم و بۆتی بێنم
جــادوو گــوتی خـۆت وەبینە شــوێنێ
بیــپــشکنە گش کـــەل و کــولێنێ
هەرکەس کە دەڵێن کزە و نەخۆشە
بۆ دیتنی گــــورجـێ تێ بکۆشـــــە
گـــەرخــۆت بکەیە بژیشک و زانیـــار
چاوت دەکـــــەوێ بە هەردوو دڵدار
ئەم جــووتە فـــرشــتـــە بۆ جــوانی
بیـانبـینی دەمـە و لە حـاست دەزانی
نەخــوازە لە دەست نقـێـمی رەنگین
رەنگینە بەناوی ئەســــــتی و زین
لەو کـاتەوە پیـــرە بوو بە لوقـــمـــان
تووربێن پڕی شـــووشـــە ئاو و هەتوان
دەرمـــان هەمـــەرەنگە تۆز و نەشـــتـــەر
کـــــۆلانی دەپشکنین ســـــەرانســـــەر
هێدی و مـڕومـۆچ و کـوور و چاوزیت
پێی وابوو بژیشکە هەرچی دەیدیت
گـورجێکی گـەیشـتـە پیشـە کـاران
زووی دیتــــەوە جێ تەمـــاڵی یاران
پرسـیـیـان چە کـەسی ئەرێ پیرێژن
فـــەرمـــووی ژنی چی بژیشکی بێــژن

چاری هـەمـــــــوو دەردێ باش دەزانم
پســـــپـــۆڕی دوو ژانی زۆر گـــــرانم
چی ئێـــشی دڵان و ژانی گــیـــانە
دەســـــــتی منە چارەســـــازی وانە
گوتیـان چییە ژانی گیـان چە جـۆرە
ژانێکە وتـی نیــــــشـــــــانی زۆرە

دەردێکی گـــەلێ گـــران و ســـەخـــتـــە
چابوونی گــــرێدراوی بـەخـــتـــــە
ئەو ئێـشـە لە ئێـوە دوور گـەلی گـوڕ
تیـــشـکێکە لە ڕووی کـــچـــا جگەربڕ
کـــاتێ دەردەچێ وەکـــــو برووسکە
بێ گــــڵپ و گــــڕ و بەبێ ترووسکە
بـــێ زام و شــکـــســـت و بـــێ بـــریـــنــە
ئـــەو ژانــە ئــەویـنــە زۆر بــەتــیــنــە
دەیـکـا بـە خــــــەڵووز دڵ و هـەنـاوان
خـوێن فـیـچـقـە دەکـا لە دڵ لە چاوان
وتیـــان وەرە ســـەر دوو چاوی ئێـــمـــە
بەو ژانە دەژین دوو لاوی ئێــــمـــــە
دەی بیـــخـــەرە روو هەچێکی پێـــتـــە
چاوی مـــە لە پیـــتی دەست و پێـــتـــە
هەر چیت بوێ گـورجێ دێتـە بەردەس
هێند زێڕ ببـــەوە هـەتا دەڵێی بەس
تایەن کـە گـەیشـتـە ســەر نەخـۆشـان
زانی بە نیـــاز گـــەیی نەپۆشـــان

فەرمووی بەتەنێو دەبێ ببینم

وا باشترە شارەزای ئەوینم

جارێ دەبێ تێو بگەم لە پاشی

دەرمانو بکەم بکەونە باشی

هاوڕێ هەموو چوونە دەر لەلایان

تایەن تەکی دا بە تەک برایان

## درکاندنی رازی دڵ لەلای تایەن

دوو لاوە کـــــە چاویان هەڵێنا
چاوی مـــەلەوان لە گـۆمی خـوێنا
دیتـیان یەکی پیـرە هەڵتـرووشکاو
وەک لانکی شرۆڵ شەق و شڕ و شکاو
وا ورتەورت شـتـێک دەبێـژێ
فـرمـێـسکی لە چاوی کـز دەرێژێ
گـوتیان چ کـەسـێکی پیـرە دایە
بۆ دەگـری وە دەرخـە چت لەلایە
فـەرمـووی بەسـەری سـتی و زینێ
بۆ ئێـوە دەکـەم گـرین و شـینێ
نەخـوازە لە کن سـتی و زینان
دێم پێم هەیە شـەڵتـە بۆ برینان
ئەنگوسـتـیلەکـانو ئەم دووانەن
باوەڕ کـە نەکـەن ئەوەم نیـشـانەن
کـوا بمدەنێ هی ئەوان بەمـەردی
ئابرووی دوو کـچان مەدەن لە بەردی
راسـپـاردەم و تایەنی ئەوانم
نامنێـرنەوە ناهومـێـد دەزانم
کـاتێکی کـە پیـرەیان وەها دی
هەسـتانەوە گـەشکە بوون لە شـادی
یەک ماچی دەدان لە دەسـتی چرچی
یەک بۆنی دەکـرد لە تیـسکی پرچی

یەک دەستی لە بەژنی کووڕ وەرێنا و
یەک کەوشی دەخستە سەر سەر و چاو
تایەن بەمە جەرگی بوو بە بریان
دەیگوت بە دوو چاوی پڕ لە گریان
رۆڵەم بە خوای لە ژووری سەرمان
بۆ دەردی دڵو دەبم بە دەرمان
باڵداری هومێد بە داوێ دەگرم
دڵخۆشو دەکەم بژیم و نەمرم
هەرچوارو وەکۆ دەکەم وەکو کۆ
کار پێک دێ بە ئارەزووی دڵی نگۆ
ئەنگوستیلە بۆ بەژن نەمامان
هەر بەرمەوە دێنمەوە وەلامان
تاژدین لە دەسی دەرانی هی خۆی
پێی وت وەرە فەرموو بیبەوە بۆی
مەم روانی بەبێ نقێمی زینێ
نازی بە ژیان لەسەر زەمینێ
بمبەخشە گوتی سەرم لەبەر پێت
هەر دامەوە پێت لە جێ دەبم شێت
ئەوناوە کە چووەتە ئەو نەقیمە
پێوەندی لە بەندی جەرگ و سیمە
گەر بتدەمێ بەندی دڵ پساوە
بێ ئەو لە ژیان بەشم بڕاوە
ئەی دایە لە ڕێی جوانیی زینێ
با بێت بەزەییت بەدڵبرینێ
گەر چوویەوە زین دەبینی هەردەم
پرسی کە لە من بڵێ دەڵێ مەم

ئەو شـــايە ئەگـــەر چى من گـــەدا بم
لێم روونە كـــە ناهومـــێـــدی نابم
بـا خـــــــواستن و ديـتـنـی نـەوێـرم
دڵخـــۆش بە خـــەياڵی رادەبوێرم
ئاخ خـۆزگـە لە پێش ئەوەی دەمـردم
دەمگوت ئەوە زینە يادی كـــــردم
زۆر جـــوانە لە ئاهـی دڵ بتـــرسێ
جـــار جـــارە چلۆنەيەك بپــرسێ

## گەڕانەوەی پیرێژن بۆ لای چاومەستان

ئەو هەردوو بەژن نەمامی وا شەنگ
دانیشتو لە چەشنی خونچە دڵتەنگ
خاوی مەیی خەوبەڕێنی دوێنن
بە هومێدی مەیەکی خەمڕەوێنن
چاویان دەگەڕاند دییان لە ناکاو
وا تایەنە دێ بەوردە هەنگاو
سەیری بوو کە پیرە هاتە ژوورێ
پوورەی بوو پەری لە دەوری پوورێ
پیرۆزە گەیشتە دیدەمەستان
ماچ گەییە هەزار لە لاق و دەستان
وتیان بڵێ ئەو فرشتە کامن
دوورن لە وزەی تۆ یانە رامن
ئەم دوو پەرییەت لە تەپکە هالآ
یان هاتیەوە هەر بەدەستی والآ
ئەو تیری لە جەرگی ئێمە راچوون
هاوێژەری وان دەزانی کێ بوون
سوێندم بە دووچاوی مەستی ئێوە
وا دێم وتی لای ئەوان لە رێوە
چەندم بەزەیی بەوانەدا دێ
چو کردووە بەژنو بێ بەلابێ
هەر جارێ ستی و زین دەبێژن
چاویان دوو پلووسکە خوێن دەڕێژن

تایەن دەبەرو مـــرێ کـــچـــانم

چەند ساڵە ئەوێستـە پێـو دەزانم

ئەو جـووتە کـوڕەو چڵـۆن بژاردن

چۆنتـان بە خـوای ئەوین سـپـاردن

بەو خـوایە کە کەس نییە لە رەنگی

ئەو جـووتە لە باری شـۆخ و شـەنگی

سـەرتۆپی کـوڕانی ئەم جـیـهـانەن

تای ئێـوە ئەگـەر بکەن ئەوانەن

دوو سـێـوی بەهەشـتی لەت کـراون

دوو لـەت ئـەوەتـا دوو ئـەو دوو لاون

وای گـــرتنەبەر بە چـاو و راوان

هەر هێندە بوو شێت نەبوون لە تاوان

ئاوری دەگـەیاندە نەوت و پووشـوو

هەر خـۆشی دەکـرد و گـڕ بڵند بوو

دڵ تورە ئەوین گـــڕێکە داگـــر

دڵ چەند تەڕە هێندە دەگـرێ ئاگـر

وەک تاقـــە لەش و ئەوین چـرایە

گـــیـــان رۆنە پڵـــێت نە ئاشکرایە

گـەر رۆن و پڵـیـتـە گـەر چرایە

بەســراوە هـەمـــووی بە تاقـــە تایە

بەم ئاگـرە گـشـتـیـان سـەروبەر

سـووتان و یەکێ دەری نەکـرد سـەر

گـوتیـان دەبێ ببـیـە چارەسـازمـان

کـارێکی بکەی نەشـێـوێ نازمـان

ئاودێری و ئێـمـە هێـشـتـە کـاڵین

تۆ زمـــان نەبی ئێـمـــە لاڵ و پاڵین

تۆمان نەبێ وشک دەبین و بێ بەر
هۆشمان نەدەیەی دەکەین خەزەڵوەر
تۆی بۆمە بەڕاستی سەرپەرشتی
هەر تۆ کەس و کار و گشت لە گشتی
نەتوت وەکو دوو پەپوولە ئەو لاو
بۆمەن پڕووکاو و هەڵپڕووزاو
دەیسا دەبێ چەندە چاوەڕێت بن
زو نەچیەوە زۆر نزیکە شێت بن
هەڕاکە بەلەز بڵێ بە تاژدین
ئەو ئەستی ئەگەر دەوێت و مەم زین
مزگێنی لەوان بێ ئێمە سازین
ئاواتی مەشە و بەدڵ دەخوازین
بۆ وان دڵی ئێمە گەرم و نەرمە
درکانی گرانە کچ بەشەرمە
ئەو پەردە لە رووی کوڕان نەماوە
شەرمێونی دنبەگی دراوە
خوازبێنیکەران بنێرنە پێشی
هیوا هەیە کەس پڕی نەکێشێ
توخوا بڵێ بەو دوولاوی دڵبەند
چەندیان هەیە دۆست و دەستوپێوەند
هەرچی کە دەڵێن نزای رەوایە
گشتی لە خوا بکەن تکایە
ئەم دووریەمان لەناو وەلابات
پێکمان ببڕێ و بگەینە ئاوات

## خوازبێنیی ئەستی بۆ تاژدین

چەند خـۆشە نەخـۆش نەخـۆشی دڵ بێ

کـــەم مـــابێ نزیکی گـــۆڕ و گڵ بـێ

لـەو کــــــاتە بـژیشکی بۆ پـەیابـێ

دەرمــــــــانی دڵـی بـکـات و چـابـێ

چـەند خـــۆشــــە وەڵام بگاتە دڵدار

مــــزگــێنی بداتـێ ســـاز بـووە یـار

دیســـان وەرە ســـەیری پیـــرە تایەن

فـێـــڵاوییـەکــە فـێـڵـی لە بنە نایەن

بۆی کــــەوتەوە ناو جلـی بژیشکان

چاویلکە لە چاو و دەس بە پیـشـکان

خـــۆی کـــــردەوە لانـی جـــووتـە لاوا

خــــۆشی و بزە وا لـە لێـــو و چاوا

مــزگــێنی لە چەشنی ئاگــری گــەش

رووناکی دەکـــرد لەوان شـــەوی رەش

فــێنکاییی دەدا دڵـی بە کـــوڵیـــان

ســـارێژ بوو هەمــوو برینی دڵیـــان

کـــۆبوونەوە هـەر یـەکــــەی لەلایە

چەند پیـــر و ردێنســـپی و مـــەلایە

هەرچـی کـــە لە پێش و کـــەیخـــوا بوو

گــشـــتی بەرورووی لە مـاڵی شـا بوو

گـوتیـان دەســەرت گـەڕێ ســەر و مـاڵ

پێـــشکەشـــتـــە ژیان و زیچ و منداڵ

مەزنی گەلی کوردی مەرد و ڕەندی
خاوەن دەسەڵات و گیروبەندی
سەرمان هەموو پردەبازی سەر ڕێت
چی سارد و گەرم نەیێتە بەر پێت
تۆی سایە چەور لەسەر سەری مە
تۆی هاندەری بۆ پەنابەری مە
ڕووت نا لە کەسێک گەلێ بە بەختە
کێ تۆ نەتەوێ ژیانی سەختە
تاژدین کە نزیکە خزمی تۆیە
بەندەی هەرە چووک و نزمی تۆیە
ساوا بوو لە کۆشی دایک و باوا
زاوا بووە ئێستە بیکە زاوا
هیوا ئەوەیە ڕەوای ببینی
ئەستی بدەیەی بە هاوسەرینی
فەرمووی چ دەڵێن دەبا وەها بێ
جێ گیرە شتێکی پێو ڕەوابێ
دەمڕاست و مەلا بلا نەوەستن
تاژدین و ستی لەیەک ببەستن
زۆر شادە دڵم بە کاری ئاوا
پیرۆزبێ ژیانی بووک و زاوا
هەستا دەم و دەس چەکۆی بەدڵ ژیر
بەسپاسەوە کەوتە دەست و پێی میر
خوازبێنیکەران لە بەگ لە میران
دارا و نەدار و لاو و پیران
پاڕانەوە مەزنی کوردەواری
زیندوو بێ بە کام و پایەداری

فەرمووی بکوتن دەهۆڵی شادی
وەک ئەو هەلە کێیە بێتە یادی
مەیگێڕ نە دەمی تنۆک - تنۆکە
مەی کۆنە لەزاری کوویە رۆکە
هەل هاتووە خەم بدەین بەبادا
هەڵکەوتووە کەس لەدەستی نادا
کێ زانی وچانی با نەخەینێ
شەو ئاوسە چی دەبێ سبەینێ
دڵشادی و شین بەرەی زگێکن
گریان و کەنین بەرەی لکێکن
پێکهاتی گەڕی ئەم ئاسمانە
جارێکی ژیانە دووی نەمانە
رووناکە بەرێک سەرێک تەپومژ
کچ بەخشە چەلێک هەلێکی کوڕ کوژ
دنیا وەکو شێرە لێی بترسێ
گەر هاتە برین لە کێ دەپرسێ
هەل هاتووە خۆشە چاوەڕێی چین
بڕیاربێ سەبارەتی بە تاژدین
مەزنایی لەوێ بووەستێ ئێوە
دامنێن وەکو خۆ لە ئێستە پێوە
زۆر هاتووە ئەو بەدەوری مندا
دەستپاک و بەکار بوو هەر لەبندا
شێرێکە لەجەنگ گوڵە لە ئاهەنگ
دەنگ داوەوەێکە ژیر و بێدەنگ
پێویستە لە رێی کوڕێکی ئاوا
ئەمنیش ئەمەگم هەبێ لە چاوا

نۆرەی منە جا لەسەرمە هەستم
بۆ کۆمەگی ئەو کەمەر ببەستم
کێ بێ و کەسی وای هەبێ گیانی
نابەخشێ لە رێی بەکامەرانی
گەر بمبێ نە هەر سەرێک هەزار سەر
گەنجینەی سەرزەوی سەروبەر
نەیدەم لە رێگای کەسێکی وا دا
مەردایەتی من بچێ بە بادا
تاژدین کە لەوێ دەسەو کەمەر بوو
بەروانکەی کارکەریی لەبەر بوو
ئەو خێوی شکۆیە هەر لەجێدا
لێی کردەوە خۆی لە خۆی گرێدا
رازاندیەوە جۆرە نان و خوانێک
خوان هەر مەڵێ بووبووە عاسمانێک
پێت وا بوو لەسەر سەلان لە جێی نان
کولێرەی مانگ و رۆژی هێنان
ئەو لەنگەرییەی لە زیو و زێڕان
عاسمانی لەسەر دەسان دەگێڕان
تا کاوڕ و گیسکی عاسمانان
برژان و نرایە بەر میوانان
هەر قاپی زەلام لە رەنگی بورجێ
سەرپۆشی فرێ درابوو گورجێ
کۆجیلە و پیاڵەکانی فەغفور
ئەستێرە و رۆشنی دەدا دوور
شاکاشی هەمووی لە چەشنی عەنبار
سەررێژ وەکو نەوسی پیاوی بەدکار

خـواردن هەمـــەڕەنگە چەور و شـــیـرن
نـەرمـــیش بۆ بەشی ئەوانی پـیـــرن
ئاوخـــۆرە و قـــومـــقـــومـــۆکی چینی
ناو ژوور دەگــــــەڕان بە نازەنـیـنـی

ئەســـتـــێـــرە گـــەڕیدە بوون ئەوانـە
دەتـدین هـەمـــوو دەم نە هەر شــــەوانە
هـەرمێ و هـوڵو شــــەڵانی و ســـێـــو
دەتوانەوە هـەر دەگـــەینە ســـەر لێـــو
نـارنج و بـەهـێ و هـەنـار و لیـــــمـــــۆ
چەرخـیـان بوو لەبەر شـەقـا وەکـو گـۆ
مـاسـتـاو و گـوڵاو خـۆشـاو و قـەنداو
فـــێنکاییی دڵان و جـــوان لەبەر چاو
ئەســـپـــەندەر و داری بۆن دەســـووتان
بـۆنـێـکـی بـەهـەشـت دەهـاتـە لـووتـان
دەنگخـۆشی بەناو و دەنگ سەمـاکـەر
دنبـــەگـــژەن و تەپڵ و دەفــــە لێـــدەر
دەترِوانی هەمـووی بەشـێوە هاوڕەنگ
لەو بەزمـە هەمـووی بووبوونە هاودەنگ
شـمـشـاڵ و کـەوان و تار و تەنبـوور
زورنا و کـەرەنا و سـاز و سـەمـتـوور
حـــەیران و نقـــام و خـــاڵی رێبـــوار
پایزە و نیـــــوەشــــــەو ئەرێ یار
وێـکـرا دەردەچـوو بـەرێـکـوپـێـکـی
بێ قـــۆرت و گـــرێ بە لووس و لێکی

بلوێر کە دەسی دەکرد بەناڵان
دەیبرد دڵ و هۆش و بیر بە تاڵان
مەیگێڕ بە بەرامە گێژ و وڕ بوو
مەیخۆر وەکو کووپە ورگی پڕ بوو
بانگی بوو لە کووپە خوڕ خوڕی مەی
سەرخۆش بە خەم و کەسەر هەتا کەی
شت هێند هەبوو کێ لە چی دەپرسی
کێ بیری دەکردەوە لە برسی
سەرنووسەری عاسمان لەوێدا
رامابوو بنووسێ خۆی فڕێ دا
دیتی کە هەزار یەکی بنووسێ
نابڕێتەوە تا بنووس دەخووسێ
زوهرە لە سەما کەوت شکاوباڵ
خۆی شاردەوە مانگ لە کونجی قرژاڵ
کەیوان چووە دۆڵچە رێی نەناسی
کڕیار سەری بردە ورگی ماسی
کۆمەڵ هەموو دوور لە دەرد و ئاخان
پیرێژنی عاسمان لە داخان
کۆم بوویووەوە رەنگ پەڕیو و جاڕز
هیچ کاری نەمابوو بووبووە کادز
شاری و رەمەکی و نەناس و گەڕناس
دارا و نەدار بەکەوش پێخواس
گشتی دڵی خۆش لە بەزم و ئاهەنگ
پەیدا نەدەبوو بەتیت و دڵتەنگ
کاتێکی لە کۆڕی چوونە دەر پیر
لاو هاتنە جێگە بانگی کرد میر

تۆی لاوی بژاردەمەم لە ناوا

هەر خۆت ببە ئاریکاری زاوا

رازاوە لە چەشنی یەک لە بەرگا

یەک بەبزەیە یەک کزەی لە جەرگا

دەرچوونە دەرێ کە رابوێرن

گوێ تاوێ لە رازی یەک بدێرن

## رازاندنەوەی کچان و گواستنەوەی ستی

ئەو کـاتە کـە تازە بووکی رووسـوور
سـەرپۆشی رەشی فـڕێ دەدا دوور
رازاوە وەسـەر کـەوت لە ئاسـۆ
رازاندییـەوە دەشت و دەر کـەژ و کـۆ
بووک جـوانکەر و تایەن و پەرسـتـار
سـەرگـەرم و خـەریک لەبار و پڕکـار
چون سـازی بکەن سـتی و زینان
چـۆن نـاز دەدرێ بـە نـازەنـیـنـان
روانیـیـان لە رەشـایی بسک و خـاڵان
دیـیـانن کـە دڵان دەبەن بە تاڵان
هەر گـەینە نزیک برۆی کـەوانی
گـێـژ بوون لە کـری خـوای جـوانی
سـەر رووومـەتی سـوور چ هاتە بەر چاو
سـوور بووەوە لە شـەرمی وانە سـووراو
تـوانـای نـەبـوو کـل بـگـاتـە چـاوان
هـەر بوو بەخـەڵووزی رەش لە تاوان
سـەرتاپێ گـەڕان لە چەشنی شـانە
دەسـتـیـان کـەوێ مـوویێ بۆ نیشـانە
شـێـوان وەکـو پرچیـان و نەشـبـوو
چم وت تـەنێ گـەینە تاقـە یەک مـوو
ئەو مـووش نەپەڕیوی پرچی سـەر بوو
تای ژین و ژیان و مـووی کـەمـەر بوو

پشتێن نەدەبەسترا لەسەر موو
گیان ترسی پساندنی لەبەر بوو
کێ توانی کە تێوەڕا بمێنێ
ترسی بوو لە دینی بیشکێنێ
سەرپەنجە لە ڕەنگی گوڵ دەڕەنجان
ڕەنگ و خەنە چۆن لەوێ دەگونجان
ڕەنگێکی خوا هەڵی بژێرێ
گۆڕاندنی کێ هەیە بوێرێ
وان و خەنە پاشی ناهومێدی
چاریان بە تەنێ لە ماچی پێ دی
ئەو خشڵی کە بوو لە دوو گوڵی شەنگ
تیشکەی لە زەوی دەدا بەحەوت ڕەنگ
پیرۆزە کڵاوی گەییە سەر سەر
ڕووناکی درا بە تانجی گەوهەر
سەردێری لە ڕووپەڕی خوا کرد
ئەو ڕەنگی بەخشڵ و زێڕ پەیا کرد
ڕازانەوەیەک لەوان کرابوو
خەرمانە بوو دەوری مانگی دابوو
لیزگەی دوڕ و لاڵ و بەندی گەوهەر
بسک و خەت و خاڵی رندی دڵبەر
نەخش و خەت و تیپ و پیتی قورعان
نیشانە بەخاڵ کرابوو نیشان
ڕەنگێ لە خواوە یەک لە دەستان
چاو ڕوونکەرەوەی خوا پەرستان
بێ باوەڕێ ئەم دووەی بدیبا
بێچارە دەبوو بە باوەڕی با

رازایەوە شـــار لە چەشنـی بووكـــان
بازاڕ و شـــەقـــام و مـــاڵ و دووكـــان
پۆشـــرابوو هـەمـــووی بە ئاڵ و واڵا
ســـەر خـــوانچـــە بە لالە بان بە ئاڵا
چەند ســەد كـوڕ و كـیـژی نازپەروەر
خوانچەی دوڕ و گەوهەری لەسەر سەر
بـار بـەربـووە ڕێـز و زێـڕ بـەبـاران
هـەرچی بـە نرخ هـەبوو لـە شــــاران
جـیـازێكی بەدەر لە ســەنگ و هەژمـار
هـەر لۆك بـوو نكەی دەهـات لە بن بار
قـورسـایـی ئەوەندە گـەیـیـە عـەرزی
بـوولـەرزە بـوو دار و بـەرد دەلـەرزی
دنیـــایێ وەكـــۆ بـوو بۆ تەمـــاشـــا
دەریایێ لە مــرۆ بوو حـــەوشی پاشـا
جـــارێك بە شـــەپۆڵ و گـــا بە پەنگاو
جـــێی دەرزی نـەمـــا هـەڵێنی هـەنگاو
دەروازەیـی خـــۆشـــیـــان كـــراوە
لـە پـڕێكـەوە هـاتـە دەر كــــــەژاوە
گـێـــژاوە كـــەژاوەكـــەی ســـتی هـات
كـۆشكی پەریـیـان بـە ڕاســـتی هـات
پێشـڕەو كوڕ و كیژی دەس لە كەمبەر
ســـەرتـا بـە پێ زێـو و زێڕ و زەمـــبـــەر
تەخـتێ وەكـو بـەخـتی ئێـمـە ڕەش بوو
بەس ئەو نـەوەكـــو مـــە دوورەبەش بـوو
لاڵ و دوڕی بـــەنـــدی دەور و بـــەر بـــوو
بەڵكیـسی لەســـەر بـوو بەخـتـەوەر بوو

سەد ئاسەفی بەرخیات بدیبا

تەختی دەرفاند بەشان وەکی با

ئەو تەختی رەوانە وەک گەمی بوو

دەریاکەشی گشتی ئادەمی بوو

دەریای ئەوینێ تێک بهاڵێ

ناچارە دەگاڵێ یان دناڵێ

وەک پۆلی پەپوولە لە دەوری شەمدا

سووتانی دەوی بەدڵ لە دەمدا

پێت وابوو گیانە ئەو کەژاوە

گش ئەو لەشە هێندە دەوری داوە

دەروێش و مەلا و هەژار و پاشا

کەس هۆشی نەما لەبەر تەماشا

ئەو رۆژە کە سەر ببا بە دەرمان

دیاری نەبوو ون بووبوو لە شەرمان

هێند ئەسپ و پیادە تێ کشا و هات

بێچارە پەژارە کەوتە شامات

کێی وابوو بمایە هۆش نەبردوو

هێنایە سەمایە کۆنە مردوو

شمشاڵ و گەواڵ و تەپڵ و شەیپوور

ئاوازی بلوور و ساز و سەمتوور

گۆرانی و بەزم و چەپڵەرێزان

قاقا و هەرای مناڵ و خێزان

لەرزانە و خشڵی هەوری لاران

رمبازی و هەوهەوی سواران

لەو رۆژەوە سەر زەوی زەوی بوو

تا وێستە شتێکی وای نەدیبوو

دەریا و گەمی و پەری لە ناوا
بەو زەمزەمە گەینەماڵی زاوا
تاژدین لە بەرێک و مەم لە لایێ
مانگێ لە تەنیشتی پادشایێ
چەند میر و مەزن بە چوستی هەستا
گش سینی و یاڵ تەبەک لە دەستا

هەر سینییەکی لە زێڕ و یاقووت
هەر یاڵ تەبەکێ لە زێو و زەمڕووت
سەرپاکی لە زێڕ و لیرە دارماڵ
داباری لەسەر کز و نەدار ماڵ
رێژنەی بە تەوژمی ئەو دراوە
لێزمەی وەتەکانی خست کەژاوە
زۆرتر لە چڵێسی نەوسی بەدکار
جێی هێشتبوو دەستەڵاتی زۆردار
رابرد لە دەهەندەییی دەهەندان
دەرچوو بوو لە فیزی خۆپەسندان
رووت و رەبەنی دراو وەکو کەر
گیرفانی دەئاخنین لە دوو سەر
بێ جووت دەیەویست کە تۆ بچێنێ
دەمڕووت دەگەڕا ژنێکی بێنێ
پڕکار و نەدار و رووت و تەڕپۆش
دارا و هەژار و مات و دڵخۆش
دەتدین ئەوی رۆژێ رێکوپێکن
پێت وابوو هەمووی برا و بەشێکن
جیایی نە بەدڵ هەبوو نە بە شمەک
دڵخۆش و بەدڵ هەمووی وەکو یەک

گـچکە و زلی مـەسـتی بادەیە و مـەی
گوێ پڕ بوو لە هەی هەی و لە ئۆخـەی
دار و دەوەنیش دەهاتە سـەرجـۆش
داروغـە و پیـر بووبوونە سـەرخـۆش
هێند مـەستی دەبەنگ هەناسـە تەنگن
هێندێک بە گەشە و کەن و جەفـەنگن
هـاتبـایەتە سـەیری لات و لووتان
خـۆیان دەنواند بە شـات و شـووتان
مـەقـلاتی دەدا یەک و یەکێ باز
زۆرانی دەگـرت یەک و یەکێ گـاز
لەولاشـەوە نەونەمـامی دڵبـەند
شـیرین و بە زەردەخـەند و دەمـقـەند
روومەت گوڵ و لەش گوڵ و کراس گوڵ
پاکی گـوڵی سـەرچڵ و لەبەر دڵ
زێڕ کـەمبـەر و لار کـڵاو و مـوو ڕەش
مانگ هەنیە و مەستەچاو و رووگەش
هێند توێڵی گوشاد و هێندێ دەم تەنگ
خۆشدەنگە گەلێک و گشتی خۆشڕەنگ
لاجـانگ وەکـو زیو بژانگ وەکی تیـر
پرچی ڕەشـەمـار برۆ وەکی شـیـر
مـەمکۆڵە هەنار چەناگـە سـێـوان
سـەرچاوەی ئاوی ژین لە لێـوان
کـێل گـەردن و بەرز و روو بەخـاڵان
کـەم تێ دەپەڕین لە چاردە سـاڵان
هێندێ گـەلێ لووسـترن لە گـۆی زێو
هێندێ کـەمێ گـەندەموو لەسـەر لێـو

به کـوێری جـهـانـی پیـری پشـت کـووڕ
گـشـتـی بە سـەمـاوە بۆی دەدا ســووڕ
کــچگەل وەکــو کــۆ و حــەوتەوانـان
کـوڕگــەل خــولی پـێ دەدا بە شــانان
کــــــــۆزیـلـکـە لـەلایـێ رەو لـە لایـێ
ریــز دوور و درێــژ دوایـیــی نــایــێ
حەو رۆژ و شـەوان کـە رۆژ ئەگەر شەو
گــۆوەند و بەزم بـوو تـار بووبـوو خــەو
ئـاهـەنـگـی وەهـا لـە کــــــــوردەواری
نایێـتــەوە رووی جــهــان چە جــاری

## زاوا دەچێتە پەردە بۆ لای بووک

زاوای بە شـــــــــۆقی رۆژ بەیانی
مـــیوان بوو لە بووکی عـاسـمـانی
بـێـگـانـە بـەدەر بـە رۆشـنـایـی
کش بوو کـــشـــومـــاتی تاریکایی
ئەو رۆژی دەکـــەوتە پاشی حـــەوتوو
ئەستێ گڕی خۆی گەیاندە پووشوو
لێک دووری و لێک نزیکی ئاوا
وەک ئاگـــرێ کـــەوتە بووک و زاوا
زوو پێک نەگـــەیین هەناســـە دێنێ
گـلـــپـــەی لە ئەوینێ هەڵدەسـێنێ
هـیـــوا و ئەوین کـــە بوونە هاورێ
فـــریای نەکـــەون هەناوێ دەبڕێ
ســـووتاوی بەیەک نەگـەینی ساڵان
ســـووتان لە پەلەی لە یەکـدی هاڵان
دەریای ئەوینێ هاتە جــــــۆشین
ئارامی و هۆش و خــــۆشی پۆشین
چەندی لە کچ و ژن و لە بەربووک
چەند لاوی لەبار و قۆز و خوێن سووک
دیتـیـان بەسـە دووری ئێش و دەردە
هەل هاتووە زاوا بچـــــتـــە پەردە
بەگـــوێرەی رێ و شـــوێنی جـاران
رێک کـــــەوتنە کــــاروباری یاران

رازایەوە پەردوو و چەشنی بووکـــان
پەردووی چی بڵێ بووبوو بە دووکـــان
پڕ بۆن و بەرامی خـۆش سـەرانســەر
مــەی کـۆن و مــەزەی نوێ بەرانبــەر
دەفـــر و هـەور و پیـــاڵە ســـەرڕێژ
پڕ شیرن و ترش و چەور و خۆش چێژ
هەرچی دڵ و زار و سەر دەکەن خـۆش
هەرچی خـەم و کوڵ دەکـەن فـەرامـۆش
ئـامــــادە و ریـز کــــراو لە نـاوا
چاویـانە لـە دەســــتـی بووک و زاوا
چەند دۆست و برادەرێک هەڵســتـــا
مـۆمـدانی لە زێڕی سـوور لە دەسـتـا
مـــۆمــێک لە بەری لە دوور شـــەوانە
هـۆنبـــاتەوە لیـــزگـــە زەنگیـــانە
دایان نا لە کـــۆڕ لە بانی ســـینی
دەیگوت بە زمـــانـی ئاگـــرینـی
زاوا بەســە هێندە شـەرمـە شـەرمـە
تۆش رەنگ و دڵت پەڕیو و گـــەرمـــە
بولبـول چتـە خـۆت لەگـوڵ دەکەی سڵ
بفـڕە و بگە سـوورگـوڵی لەسـەر چڵ
پەروانە ببـینە مـۆمـەکـەی خــۆت
فـرمـێسکی دەڕێژێ وا ئەویش بۆت
تاکەی وەکـە من سـووتان و ســاچان
راکـــە و بگە دەمــدەمـــان و مـــاچان
وا رووگـــــە و کــــابە لێت نزیکە
حـەج کـەوتە سـەرت دەهەسـتـە بیکە

حـــەو جـــار بگەڕێ لە دەوری یارێ
خـاڵ مـاچ کـە هـەزار چەلان نە جـارێ
چاوتێر کـە لە سـەیری شـەکرە سێوان
تێـــر هـەڵمـــژە ئاوی ژین لە لێـــوان
دەس بـگـرە بـە بـسـکـی لـوولـدراوی
بـخـــــوازە نـیـــــاز بـە ڕاشـکـاوی
تاژدین لە نیـــاز گـــەیی بەبێ دەنگ
دی بەسـیـــەتی کـات و دڵ بکا تەنگ
دەرکەوت و مـەمیش لەگەڵ وی هـەسـتـا
دڵ بە دڵەوە چەسپ و دەس لە دەسـتـا
ئەو چوو لە سـتی ببـێـتـە هاودەم
بۆ پاسـدەری دەرکـە مـا لەوێ مـەم
هەرچەندە کـە خـۆشـەویستی خـەڵکە
پیـاو هۆشـی لەخـۆ بێ زۆر بەکـەڵکە
داخـــوازی پەری لە دێو بتـــرســـە
دڕکـیش هەیە هەر لە گـوڵ مـەپرسـە
ئـی وا هـەیە چقڵ و هـەن گـڵـــووکن
هـەن پیـــاوی بـەنرخ و هـەن چرووکن

## پێک گەیشتنی زاوا و بووک

زاوا کـــە وەژوور کـــەوت لە پەردوو
بووە جـێـژنی بە راسـتی لە هەر دوو
بووک بۆ ئەم و ئەم بەرانبـــەری بووک
بۆ یەکـــدی چرا و پەپوولە هەردووک
لەولاوە ســــــتی بەبـاوەشـی واز
پێـشــوازی دەهات بەناز و نیــمناز
مـــافـــوورەیە زوور لە لاقی دڵخـــواز
پرچی رەشی رادەخـــا لە رێبـــاز
دوو چاوی کـــزی شــــەوانی دووری
گـەش بوونەوە خـەو بەجـارێ بووری
پێشان وەکو رێ و شوێنی چەند ساڵ
بۆ شـیــرنی دەم بە مــەی کـرا تاڵ
قـوم قـوم مـەیی قـومـقـمۆکی بادە
دەیگوت کـــە بە بادە خـــەم بە با دە
هەریەک بەپیـــاڵـەیەکی ســــەرڕێژ
سەرخۆش و بەگەشکە بوون نە سەرگێژ
شـــەرمـــێــونی دەرکـــەوت بە بادە
بەربوونە گــیـــانی یەک دوو ســـادە
باوی گـــــەشـــــەکـــردنی دڵانە
بۆنکردنی خــــەرمـــەنی گـــوڵانە
مـــێـــلاقـــەیی کـــوڵم و لێـــوی تێـــراو
شەوبۆی سەر و بسک و نەرگسی چاو

سێوی چەنە مەمکی زەردە لیمۆ
هەر یەک یەکی بانگ دەکردە لای خۆ
ئی وا هەبوو تێکیان دەبەستن
هێندێکی دەگەستران بە گەستن
ماچ گەییە هەزار بلێی نەزۆرە
بۆ ماچ نەژمارە ما نەنۆرە
دەیخستنە جێوە بێ گوڕ و هێز
دەستە و مل و هەڵگوشین لە ئامێز
دەتلانەوە یەک بەسەر یەکێدا
بازاڕی گەرم بوو ماچ لەوێدا
کوڵمی گوڵ و لێوی قەندی دڵبەند
تێکەڵ دەبوو دەم بەدەم گوڵ و قەند
وێک کەوتن و لێو لە لێو خشاندن
دوو ئاگری دوو لەشی گەشاندن
چەسپان بە یەکا نەوەک پسووتن
خۆش ئێستەیە جووت و ڕووت و قووتن
پێچیان بوو لەیەک وەکو دوو لاولاو
جووت بوون و بەتاق دەهاتنە بەرچاو
وەک شیر و شەکر لە یەکدی هاڵان
دز ویستی گەنج ببات بەتاڵان
پۆلووی گەش و سوور بەجۆش و پڕ تین
دامرکێ بەلوولە ئاوی زێوین
کلچۆکی سپی و ستوور و سەر سوور
ڕێ تەنگ بوو بە گێر گەییە کولتوور
لەم تەنگیە کوێرەمار بەسەد ڕەنج
زۆری سمی تا گەیشتە سەر گەنج

دەردی دی هەتا گەیشتە ناوی
خەستاوی رژان لە تاقە چاوی
تیری لە گوری کوڕێکی کرمانج
بێ رێ هەڵەبوون گەیشتە ئامانج
یەک خۆی دەچکا لە گەرمیی رێگە
یەک خوێنی تکا لە تەنگی جێگە
جەنگێ بۆ دژی تیا شکا بوو
لەو ناوە دڵۆپی خوێن رژابوو
حەو رۆژێ لە دەرهێنان و تێنان
بەولاوە شتی وەبیر نەدێنان
نەپشوو نەوچان نەخواردن و خەو
چەسپین بوو لەیەک کە رۆژ بوو گەر شەو
جارجارە بەهێمنی و لەسەرخۆ
دەبزووتەوە بەینی ناوک و ئەژنۆ
دەتوت کە دوو زێڕگەری هونەروەر
لێکیان گرێ داوە جووتێ گەوهەر
زاوا لە بەیانی رۆژی هەشتێ
ناچار چووەدەر لەناو بەهەشتێ
دیتی ئەوە مەم هەتا ئەوێستا
وێستاوە لە دەرکە شیر لە دەستا
پاسداری دەر و دەروونە هەر گا
گیانی لە دەسایە چاو لە دەرگا
مەم دیتی برای لە پەردە دەرهات
وا شاد بوو مەپرسە چی بەسەرهات
گەش بووەوە گرێی دڵی کراوە
پێی وابوو جیهانی پێ دراوە

یـارت کــــــــه هـەبـێ دەبـێ وەهـا بـێ
گــەر وانـەبـێ کــەڵک و ســـوودی نابـێ
یـارێکی بەڕاســتی گــەر هـەبێ پیــاو
ســـــەد خـــــزمی بەدی دەنـێ لەپـێناو

## تێچاندنی بەکر مەرگەوەڕی شۆفار و دووزمان

داناوە خــوا کــە ئەم جــیــهــانە

بێ گــیــانی تیــایە یان بە گــیـانە

ســەرپاکی بەڕەنگ بەکــار و ئاکــار

جیــاوازە لە چەشنی نەخش و ســاکار

عــاســمــان و زەوی گــەڕیدە و ســست

هێندێکی بە زێڕە هێند کــرٍ وست

تاریکی و روونــی کــــفــــر و باوەڕ

یان گــەرمی و ســەردی و وشکی و تەڕ

بڕوانە بەهەشت لە تەک جــەهەنەم

رەش لای سپی جووتە شادی و خەم

لێک دوورەوە بوون و پێک گــەیشتن

زیندوو لە نەبوو کـــران و کـــوشتن

رۆژ و شـــەوەزەنگ و ســێـــبـــەر و تاو

با و بژ و خــــاک و ئاگـــــر و ئاو

مــــاڵدار و هەژار و تاڵ و شـــیـــرین

گـــریان و کـــەنین و شــادی و شین

پیاو هەن گوڵی سەر سەوەی جیهانن

ئی واش هەیە پیس و دووزمـــــانن

ئی وا هەیە راست و چاکـــە خـــوایە

ئی وا هەیە خـــوار و رووســـیـــایە

گـشــتی دژی یەک لە یەک خــەریکن

لــێـک دوور و بــەدەم لــەیــەک نــزیــکــن

کـاکڵ چیـیـه لێک جـوێن ئەمـانە
شـاراوە چیـیـە لەناو هەمـانە
تـا یـەک بـە یـەکـێ بـدا دیـاری
یـار دیاری دەکـا لـە کن نـەیاری
هۆی دەردە دەزانـی نرخی سـاغی
هۆی بەفـرە کـە دۆسـتی مێرگ و باغی
دەس بـەردە درێژ دەکـێـشێ بۆمـان
بابێـینەوە سـەر وتاری خـۆمـان
مـیـر لای هەبوو یەک بە دەرکـەوانی
نـاوبانگی هـەبـوو بـە دووزمـانـی
لـە پیـاوەتیـیـا چرووک و رووڕەش
دڵپـیس و لە شـەرم و شـوورە بێ بەش
فـێـڵـبـاز و بەراز و رق لە سـینە
بەدخـواز و نـەسـاز و دڵ بـەکـینە
شـەیتـان و شـۆفـار و دەم دڕاو بوو
سـەگ بێـزی دەهـات ئەوەند گـڵاو بوو
رووزەرد بـوو درۆ لـە راسـت وتـاری
سـەرتاپێ گـەمـاریی لێ دەباری
خـوێنتـاڵ و دزێو گـەمـاڵ و سـەرڕەق
گـۆڕی بوو نەچێـتە دەر لەبەر شـەق
دەسـتـرژد و چنۆک و گـونەکـەر بوو
بێ دۆست و قـزە و نەزان و کـەر بوو
رووترش و گـزۆک و گـوێ نەبیـسـتـوو
گـرژ و مـڕ و مۆچ و کـەس نەویسـتـوو
بەدفـەڕ بوو بەگـەڕ بوو دەم گـەوەڕ بوو
ئەم بیـژووە بەکـری مـەرگـەوەڕ بوو

تاژدین گـــەلێ دەیگەیاند لە مــیـــری
تـۆ خـــــــاوەنـی نـاو و دەنگ و ژیـری
کێ بخـوازێ کـە خـێـوی نێـوی چابێ
زۆر شـــەرمـــە ســەگـــێکی وای لەلابێ
چم وت ســـەگی پاسـدەری ئەمــەگـدار
بەدفـــەڕ دەبەری مـــرن هـەزار جـــار
هـەر جـــار لە وەرامـی پەنـدی تـاژدین
دەیگوت ئەمــــە باشـــــتـــری دەزانـین
ئێـــمـــە وەکــو خـــێـوی ئاشی باشین
بـەرداشـی لـە بــەردی رەق دەتـاشــین
ئاشی مــە هەمــیــشـــە ســەربەخــۆیە
بانیـــــژە پڕی لە گـــــاڵ و جــــۆیـە
پیــــسم دەوێ ئاشـی وا بگـێـــــڕێ
هەر زەمـــهـــەرێ بێـتــە بەر بـهـێـرێ
گـوڵ چقـڵی دەوێ کـە پـاسـدەری بێ
گـــەنج مـــاری دەوێ لەبەر دەری بێ
ئێـــمـــە کـــە بە دەســـتــەڵات و زۆرین
جـارێک ســپــیــواش و زۆری بۆرین
هـەر نـەرمی بەکـــاری ئێـــمـــە نـایـە
مـــــــەزنـایـەتـی بـانـی دوو هـەوایـە
جـــــارجـــــارە یەکێ دەبـەینە بـاڵا
زۆر جـــار گـەلێ ون دەکـــەین لە چاڵا
جـــارێکی دروست و راست کـــارین
ســەد جـــاری بەپێچ و لار و خـــوارین
تـا یـەک دەکـرێ بـەخــــانی خـــانـان
زۆر کـــــەس دەبـێ ببـنە تـۆزی بانان

نەتبیستووە پیس بە پیسی دەڕوا
کارێکی نەبا درۆ نەدەڕوا
دارۆغە ئەگەر نەزۆڵ و زاڵ بن
خونکار هەیە تووشی ڕۆژی تاڵ بن
ئەم کارە نەکاری ئێمەیە و بەس
سەی پاسێ هەیە لە دەرکی هەر کەس
بڕوانە تەنانەتی خواوەند
ئەم دەور و دووکانە چۆن دەکا بەند
تا پاکێ دەخاتە سەر زەمینێ
پیاو چاوی هەزاری پیس دەبینێ
بێ هوودە بوو گفت و پەندی تاژدین
نەیتوانی لە میر وەکا پەڕۆی شین
ئەو یا نیگرەی بەکین و بەدبین
زۆر ترسی بەدڵ هەبوو لە تاژدین
نەخوازە کە جێ بڵند بوو ئاوا
میر کردی بە یار و خزم و زاوا
وەک ئاگری گرتبێ وەهابوو
هەر مردبوو ڕەنگ و رووی نەمابوو
مەردی لە دڵا نەماوی بێ پیر
دیتی هەل و خۆی گەیاندە کن میر
دەرچوو لە دەست بەهیچێ ئەستی
تۆ چۆن دەبوو تۆزێ ڕانەوەستی
ئەو گەوهەری تانج و تانجی گەوهەر
ئەو شۆخی بەناز و نازپەروەر
جوانتر لە پەڕەی گوڵی بەهاری
سەرتۆپی کچانی کوردەواری

چووی داوته به نۆکــــەرێک بە تاڵان
چۆن ناودەبرێی لە گــەورە مـــاڵان
ســوڵتــان دەبوو خــوشکی تۆ بخـوازێ
شـــا بایە دەبوو بەخـــۆی بنازێ
پێی گـوت سـەگی پیـسی زۆڵی پرکێن
دوو چاوی مـن مــەمـــۆ و تاژدین

ڕۆژی شــەڕەکـەم لەگـەڵ عـەجـەمـدا
کـــاتێ کـــە ســـەرنجی ئەو دووەم دا
تـاژدین لـە بـەرێـک و مـــــەم لەلایـە
دوژمـن هـەمـــوو کـــەوتە هـەلوەلایـە
دووسـەد عــەجـەمی بە تیــر و پەیکان
بە کـلاو زرێ و بـە شـیــر و قـەڵغـان
دیل بـوون بەدەس ئەم دووە بە تـەنیـــا
ئەم دووانـە چلـۆن دەدەم بە دنـیـــــا
شـــا کـام سـەگـە تا ببێ بە خـــزمم
پێـت وا نـەبێ هـێنـدە پـووچ و نـزمم
ســوڵتــان ڕەگـەز و بنیـچـە حـیـزە
ڕێی ناکـــەوێ خــۆمی بێنمـــە ڕیزە
ئـەم ڕێـویـیـــــــە دی بـەلا نـزیـکـە
ڕووی گـــفــتی گـــەڕانـدە باری دیکە
گـــەورەم بژی هـەر بەکـــامــــرانی
هـەر خـــۆتی لە گـــەورەیی دەزانی
ژێردەســتێ کــە خــۆت دەنێی لەپێناو
چاکــــەی دەبێ ون نـەبێ لـەبـەر چاو

پێویستە ئەمەگ ببێ لە گۆڕا
کەس نەبووەتە یاری کەس لە خۆڕا
بۆ تۆ کەسێ تاڵ و سوێری نۆشی
شیرن کە دەمی لە ڕۆژی خۆشی
چووکەش دەبێ شوێنی خۆ نەگۆڕن
وەک پێشوو لەخۆ و لە تۆ بنۆڕن
با بادی هەوا نەبن بە جێگە
بۆ فیکەیە دەرنەچن لە ڕێگە
دژوارە نەدی و بدی نەگۆڕێ
سەر ئاو دەکەون بەتاقە چۆڕێ
تاژدین کە ئەمەی لەگەڵ کراوە
لەو ڕۆژەوە شۆی لێ هەڵکێشاوە
گرتوویەتە دەم لەلای ئەو و ئەم
زین هی منە دەیکەمە ژنی مەم
ئەی بۆچی گوتی لە مەی نەپرسی
وادیارە لە من نەماوە ترسی
گەورەم وتی لاوە نۆجەوانە
میرزادەیە شێرە پاڵەوانە
هەرچی بڵێ دەسبەجێ ڕەوایە
ترست پێ بمێنێ لەو هەوایە
هیوای بەشە تاج و تەخت لە تۆ کا
میر لەو وتەدا شڵەژا پەشۆکا
نیازم بوو گوتی کە زینی مەم بێ
پێم خۆش نەبوو بەخشیشی وی کەم بێ

وا سوێندێ دەخۆم بەگۆڕی بابم

تا من لەسەر ئەم زەمینە مابم

نێرینە لە ڕێچەڵاکی ئادەم

کێ لێمی بوێ بەمێردی نادەم

هەر کەس لەسەر و گیانە بێزار

وا زین و دەبا ببێتە کڕیار

کێ قەڵس و وەڕەز بووە لە ژینێ

بخوازێ لە ئێمە دەستی زینێ

خونکار وەکو ئاگرن دەر و ژۆر

وا باشە توخن نەبین بەهیچ جۆر

ڕەنگیان گەشە وەک پەڕەنگ و پۆلوون

دڵیان ڕەشە و وەک خەڵووز و کوڵوون

زۆردار کەبرا و کوڕ و کەست بێ

چیت لێ نەوێ دووریی ئەو بەست بێ

نەخوازە کە پیسی لێ وەکۆ بن

وەک بزنی بەدەم لەناو چرۆ بن

بۆ خواردن و بۆ کرووسنەوەی خۆ

بەر سم دەدرێ هەزاری وەک تۆ

## گریان و شیوەنی زینێ لە تاو و توێی ئەوینێ

تاژدین و ستی بەیەکدی شابوون
لەو بەندی جودایەتی جودا بوون
بێ یار و هەواڵ لە گۆشەی خەم
بۆ دەردی جودایی مایەوە مەم
دڵسۆزێ نەبێ ببێتە هاودەم
هەر رۆژێ بە ساڵ دەچێ دەمی خەم
زین تا ستی لابوو هەیبوو ئارام
ئەو شێتی ئەوینە بەو دەبوو رام
تاژدینێ هەبوو مەمی دەلاواند
چوونی گڕی گرت و جەرگی تاواند
دابەش بووبوو خەم لەناو هەماندا
دووی خۆش بەشی خۆشیان بەمان دا
ئەو شاد و ئەمان مەکۆی خەمان بوون
دامان دوو کە ئەو دوو دەمدەمان بوون
وەک هەوری بەهاری چاوی زینێ
فرمێسکی دەرشت لە رێی ئەوینێ
گریان بوو بە رۆژ و ناڵە بوو شەو
چل رۆژی برا لە خواردن و خەو
خوێنی دڵی مایەی ژیان بوو
ئاو بۆ چییە ئاوی چاو رەوان بوو
دڵتەنگ بوو لە چەشنی زاری تەنگی
رەنگی مەمی زەردی پەڕییە رەنگی

وەک مووی کەمەری لەشی بوو باریک
ڕۆژی وەکوو پرچەکانی تاریک
چەند تایەن و دۆست و هاونشینان
هاوڕاز و نیاز و نازەنینان
دڵیان بوو بەئاهی سەردی بریان
ویستیان بەسی کا لە شین و گریان
گوتیان کە بە ئاه و نالەناڵت
ڕۆژی مە ڕەشە لە ڕەنگی خاڵت
بەس بگری بە ئاوی چاوی کاڵت
کاڵ بوونەوە کولم و لێوی ئاڵت
جا چ بووە لە تۆ بڕاوە ئەستی
داخوازی دڵی گەیشتە دەستی
ئەو وایە خەریکی بەزم و خۆشی
تۆ بۆ کەسەر و زووخاو دەنۆشی
تۆش خۆش بە بەوەی کە خۆش و شادە
وەک پرچی بڵاو خەمان بە با دە
ها شەو شەوی پرچی سەر وەبەر خە
لاجانگی هەواڵی مانگ وەدەر خە
کێشیان بدەوە بڕۆی کەوانت
هەڵبێتەوە مانگی ناوچەوانت
هەڵیان بڕەوە مژۆڵی دڵبڕ
سەد دڵ ببڕە بە نیوە ئاوڕ
نازان بدەوە بە چاوی مەستت
زەردەی بە دوو لێوی کەس نەگەستت
بەو خەندە کە خونچە پێی دەپشکووت
تێراو بکەوە پەڕەی گوڵی ڕووت

دەوری دە بە بسک و پرچی پڕ چین
شەوبۆیە لەگوڵ بکە بە پەرژین
هەر بسکێ سەری گەیاندە گۆنە
کەرتی بکە لێی مەپرسە چۆنە
بسپێرە بە تیپی وردە خاڵان
با گیانی کوڕان ببەن بە تاڵان
با بێ بەزەییت بە بولبولانت
هەڵبێنە تەرەی لەسەر گوڵانت
خۆش پێ کەنە با هەزار دەستان
دەست پێ کەنەوە بە بەند و بەستان
با هاڕە بگاتە گوێ لە گواران
پیتێ بدە تیپی شێت و هاران
سەرخۆش کە هەزار مەلا بە نازان
سەد پیری بنێرە بەر بەرازان
تێیان بگەینە گێژ و کاسن
بیانهێنەوە رێچکە رێ نەناسن
چاوبەستو چلۆن دەبینێ روونی
بونیان بەخەیاڵ چییە نەبوونی
تا دوور لە جوانی و ئەوین
با تێ بگەن ئەو نەدینە دین
گومڕان لە جوانی بەشبڕاون
دڵیان کەڕ و کوێر و دەمدڕاون
وەک گوێرەکە پەت پساو لە دەشتا
بێهۆش دەگەڕێن بە شوێن بەهەشتا
بتبین و رێ لەخۆ نەگۆڕن
بۆ نەخشی خوا لە رووت بنۆڕن

بێهوودە بوو پەندی وان لە زینێ
هەر نەیشیدەبیست لەبەر گرینێ
دڵداری لە ریزی ئاگرایە
سەرکۆنەی باوەشێن و بایە
هەر چەندی بەسەر ئەوا دەهاتن
ئەم بیری دەکرد لە ڕێی هەڵاتن
فرمێسکی هەلی نەدان بەچاوان
رێ بینێ لەناو بچێ لە تاوان
هێند زۆر بوو هەنیسک و ئاهی سەردی
نەیتوانی شتێ بڵێت لە دەردی
وایان دی ئەوانی پەندگۆ بوون
بێهوودەیە لەم هەژارە کۆبوون
بیریان بۆ ببات لە تاوی ئەستی
دەگری، چووە هاودەمی لە دەستی
روون بووەوە کە ئەم گرین و شینە
پنج و رەگەزی لەسەر ئەوینە
وا دەردی دەروونە گێژی داوە
ناچار هەموو کردیان بڵاوە
زین مایەوە خۆی تەنێ لەگەڵ خەم
هەر خەم دەمی وا دەبێتە هاودەم

## زین لەگەڵ پەژارەدا داخێوێ

دەیوت بە خەم ئەی هەواڵی ژاریم
فریارەسی زام و دەردی کاریم
پۆشاکی نەدار و خاکەساران
خۆراک و بژێوەکەی هەژاران
هاوڕاز و نیازی دەردەداران
هاودەنگی نەخۆش و لەشبەباران
پێخوڕی لە بەردەمی گەدایان
هاوپیاڵەی کۆڕی بێ نەوایان
دڵدارە بە تۆ دەگاتە دڵبەند
دەروێش دەبەیە نزیک خواوەند
تۆی لێ نەبی دڵ وێرانەماڵە
بیابانەکی قاقڕ و کڕاڵە
لێی دەر مەکەوە دەری ببەستە
هی خۆتە کلیلەکەت بەدەستە
خەم بۆیە بەنرخە بۆ هەواڵی
جێت نایەڵێ یارە ڕۆژی تاڵی
شادی چییە یاری جاری خۆشە
خەم دۆستی دڵی کز و پەرۆشە
خەمخۆری کە نەکرێ لەم جیهانە
تێکچوون بەشی هەردوو عاسمانە
دڵ هۆگری تۆیە ئەی خەمی دڵ
بێ گەنجی تۆ دڵ چییە کەمێ گڵ
جارەجارە کە زۆر دەکەوتە پەستی
بەگلەییەوە رووی دەکردە ئەستی

## سکاڵای دوور بەدوور لەگەڵ خوشکیا

ئەی هێزی گیان و تیشکی چاوم
فێنکاییدەری گڕەی هەناوم
هاوهێلکە و هاوهێلان و هاونوێن
هاوباڵ و پەڕ و ڕەگ و دڵ و خوێن
هاوشادی و هاونیاز و هاوناز
هاوکاڵتە و بازی یار و هاوڕاز
ئاکاری مە وەک یەکە بەڵان بەخت
بۆ تۆ شلی گرتووە لە من سەخت
بۆ تۆ دەسەمۆ لە من چەمووشە
بۆ تۆ گوڵە بۆ مە دڕک و پووشە
ئەستێرەی تۆ هەڵاتووە گەش
بۆ بەختەوەریت نەبوومە هاوبەش
لەو خوایە گەلێک سوپاسگوزارم
لەو بەختە ڕەشەم نەبووی بەیارم
چارم چییە خوایە بۆم دەنێرێ
کێی وایە بەبەختی ڕەش بوێرێ
تاژدین بەشی تۆیە شادی هەردەم
ئەمنیش بەشی خۆم هەیە خەم و مەم
چوون مەم بەهەواڵی خەم دەزانم
پێم خۆشە کە هاودەمی خەمانم

## زین بوخچەی دڵی

## لای مۆمی داگیرساو دەکاتەوە

جـــارێکی بە زاری مـــۆمی دەدواند

دەردی دڵـــی زاری ژاری دەنـــوانـــد

ئـەی هـاوەم و راز و هـاونـشـــــینـم

من تـۆش وەکـو خـۆم بەسـۆز دەبینم

فـــرمـــێـــسک لەگـــەڵ مندا دەڕێژی

چۆن وا دەبێ هیچ شـــتێ نەبێـــژی

نازانـی دڵم بـەخــــۆم دەمـــــێـنێ

یـەک بگری لەگـــەڵم و نـەمـــدوێـنێ

دەردی مـن و تـۆ لەیـەک جـــــودایـە

وەک خـــــــاوەر و زەردەپـەڕ وەهـایـە

تۆ خـــاوەر و شـــۆق دەدەیتـــە چاوم

مـن رۆژپـەڕ و ئـاگـــــــرین هـەنـاوم

ناســـووتێ لە تۆ مـــەگـــەر زمـــانت

وەک مـن نـی بـســــــووتێ تـای ژیـانـت

شـــۆقت کـــە لە ســـەر ســـەری دیارە

ســـەوداگـــەری ســـەرســـەری دیارە

من گـیـان بە بڵـێسـە دڵ بە پشکۆم

ســـووتاو جگەر و هەناســـە بۆســـۆم

تـیـــشـکی ســـەری تۆ لە تۆ زمـــانە

گـــــڕیەی دڵـی مـن بە ئـێش و ژانـە

هـی من بـه لـه‌هـی و بـه‌گـــێــــژه‌لووکـــه

ناکـوژێتـه‌وه هــی تۆ بچـووک و ســووکـه

شــــه‌و ده‌بیـــه هه‌واڵی شــه‌و بێــداران

ڕۆژانـه ده‌نـووی هــه‌تـا ئـێــــــــواران

مـن ڕۆژ و شــــه‌و ســـبـــه و ئـێـــوارم

یـه‌ک لانیـــیـــه ئایســـانه کــــارم

جــــارجــــاره لـه ده‌ست دڵی برینـدار

جــــــــــاڕز لـه ژیـان ده‌بـوو بـه‌نـاچـار

پـه‌روا نـه‌ده‌مــــا لـه ئاگـــــری خـــــه‌م

پـه‌روانـه ده‌مــــا ببـــێـــتـــــه هـاوده‌م

## زین رووی گفتوگۆی دەکاتە پەروانە

باڵداری هەزاری شـــۆخ و رەنگین
دڵداری بە دەرد و ئێش و خەمگین
ئەی سەروەری هۆزی سینە داغان
ڕێشاندەری مەرگی راست و ساغان
مەردانە دەبەخشی گیان لە رێی دڵ
هەر تۆی لە مردنێ ناکەی سڵ
لەو رێگەیە خێوی نێوی بەرزی
داخم کە دەچیتە بەر دەلەرزی
ناوێستی گەلێک لە رووی ئەوینێ
هەر کاڵی دەڕۆی لە رۆی زەمینێ
زۆر شەرمە پەلەی دەکەی ئەوەندە
لەرزینە کە تۆزێ ناپەسەندە
خۆ رانەگری لە کاتی تاڵی
مەرگت بوێ پوختەنیت و کاڵی
دڵدار نەمرە لە رووی زەمینێ
کەی سووتن و مردنێ دەبینێ
گەر پوختە بن لە رێی ئەوینێ
کاتێ دەمرن دەکەونە ژینێ
لەشیان کە نەما یانی پاکن
بەم بۆنەوە بێگومان و باکن
هەرچی کە دەدی دڵی دەبزواند
دەتدی کە هەموو شتێکی دەدواند

تەنیا لە کەسانی پیس و ناڕاست

نێوانی دەگرت و خۆی دەپاراست

لەزمانشڕی دووڕوو و بەدگومان بوو

هاوڕازی هەمیشە بێ زمان بوو

سەرتا بەپێ نوقمی گۆمی خەم بوو

ژینی هەموو بۆ خەیاڵی مەم بوو

## سووتانی مەم لە دەردی دووری زینێ

مـــــــەم زۆرتـری زیـنـێ دەردەدار بـوو
خـەم لەم کـە یەکێ بوو لەو هـەزار بوو
ڕەنگ زەرد و بەدەرد و بار لە لێـــوان
دێوانـە و شـــێت و دایە کـــێـــوان
پەتیـــارەیی وای لـەســـەر بووبوو زاڵ
ئارامی نەمـــا لە شـــار و ناو مـــاڵ
وای گـــرتبـــوو ئاگـــری کـــڵـی دڵ
چاوی بـە یەکی دەدیـن گـــــوڵ و گڵ
دووی تـینوو لە دەشت و دەر لـەبەر تاو
بێ هێـــز بکەون لە تاو قـــومـێک ئاو
لـە پـڕێکـی بـە تـاوی ئـاوی ژیـانـێ
داباریێ لە هـەوری عـــاســـمـــانێ
یەک چۆنی بوێ هـەڵێنجێ بۆ خـــۆی
یەک تـاقـــــە دڵۆپەیەک نەچێ بۆی
یەک ژینی نـەمـــر بخـــاتە بن دەست
یەک بمریێ هـەتـا هـەتایە بێ هـەست
تاژدین کــــە نیـــازی هاتە بەر دەست
ئەو ڕۆژە گـــیـــانی مـــەم گـڕی بەست
بـرژابـوو بـە ئـاگـــــــــری ئـەویـنـی
گـــریان بوو بە دۆست و هـاونشـــینی
دڵخـۆشـیی لە بیر نـەمـا کـە چۆن بوو
لاوێنی لـەلا شـــتـــێکی کـــۆن بـوو

کــاتێ کـــە دەهاتە بەردەمی مـــیـــر

وەک بەندیـــەکی بە کــۆت و زنجـــیـــر

دڵگەرم و هەناســـەســـەرد و بێ ڕەنگ

دیوان هـەمـــوو لە ســـوێیـــانی دڵتـــەنگ

جــارەجــارە کـــە دەچووە مــاڵی تاژدین

بێـــــچـــــارە لەبەر گــــرین و ناڵین

مـــــەودای نەبوو دەردی دڵ ببـــێـــژێ

بــاری دڵـی ژاری هــەڵبــــــــــــڕێـژێ

ناچار دەبوو دەرکـــەوێتـــە دەم چەم

دەیدواند و لە خـــۆی دەکـــردە هـاودەم

## پەیوینی مەم لەگەڵ چەمی دەجلەدا

دەجلە چتـــــه هێنده بێ وچانی
وەک ئـاوی دوو چـاوی مــن رەوانـــی
تۆش وەک دڵی ئێـمـــه پڕ شــەپۆلی
تۆش هۆگـری دەشــتی چۆڵ و هۆڵی
شـێـتی وەکـو من بە پێچ و گـێـژی
هـەر ناڵەتـه هـاتـەران دەبێـــــژی
وەک من نەپشـووت هەیە نەوەسـتـان
تۆش داوتە دڵت بە دیدەمـــەســتـان
کـێت هێنده لە ناو خـــەیاڵ و بیـــره
گـرتووتـه هەمـێـزی خـۆت جـزیره
ئەم شـارەیه گـەر نیـاز و دڵخـوات
خۆش بەختی گەیشـتوویت بە ئاوات
جـەرگـەی دڵی تۆیه نیـشـتـمـانی
هەردەم لەگـــەڵی دەســـەومـــلانی
دڵخـــۆش بکه بەســیـــە داد و زاری
لەو خـــوایە بکە ســـوپاسگوزاری
شـێـتی کـە دەمێ بەجـێی بهـێـڵی
بەغـدا چیـیـه تۆ لە شـوێن چ وێڵی
بەهرەی منـه گــــریه و هەنـاســــه
درواوە بە بەژنم ئەو کــــراســــه
جــــارێک بە دڵی منا ببـــووره
بابزانی کـــه دۆژەهیش چە جـــووره

سـەرچاوەی چاوی مـن ببـینـە
خـوێناو دەڕژێ لە گـوڵە شـینە
بـۆ دەردی دڵـم کـە دوورە چـارە
چاو بۆچی لە چی هـومـێدەوارە
وەسـتـانە و نێـرگـزان و سـەقـڵان
دەروازە و هـۆمـەران و مـەیدان
سـەیرانگەی تۆن و لێـی دەکەی گـەشت
مـن مـاوم و هۆگـری چیـا و دەشت

## رووی وتاری دەکاتە شنەبا

هیــچی نەدەگــوت کــەسی دەگــەڵ با
ئاخــافــتنی بوو تەنێ دەگـــەڵ با
ئەی ناسکی نادیار وەکـــو گـــیـــان
پەروەردەی تۆن هەچی گــوڵ و گــیـان
ڕێگەت هەیە بچــیــە لای هەمـوو کـەس
هیــوامــە کــە گــیــر نەبی دەمــودەس
نامـــــەم بگەینە کـــــۆشکی یارم
بە گـــــرانـی مـــــەزانە دەردەدارم
کــۆشکی بەڵەکــە و مــەزن نشــینە
شـــازادەی کـــورد ببـــینە زینە
پێـشــان کـــە دەچی بە چاپووکــانە
مـــاچی بکە دەرک و ســـەردەرانە
کــاتێ کــە دەگــەیتــە ڕوبەڕووی یار
ســـەر دابنەوێنە بۆی گـــەلێ جـــار
ڕووی تێ کــە بەهێـمنی و لەســەرخــۆ
تـای بـسکی نـەلـەرزێ بـا لـەبـەر تـۆ
ڕاوەســتــە لە پێــشی دەست بەســینە
خــۆشی لە تۆ تێــر گـــوڵم ببـــینە
کــوڵمی مــەدە بەر گــڕی هەناســان
زۆر نـاسکە بـا نەبێ هـەراســـــان
نووسـراوە کـە بەخـوونـی دڵمـە ڕەنگی
لێکی کـەوە سـووکێ بیـدە چەنگی

گەر خوێندیەوە کەم لە دەم بنۆڕی
راسپاردەی چابە دڵ نەگۆڕی
لە زمان منەوە بڵێ بە زاری
ئەی رۆژی بە تیشکی کوردەواری
سەرچاوەی ئاوی ژینی لاوان
روناکیدەری گلێنە چاوان
جوانتر کر و رەنگی دەستی یەزدان
وێنەی تۆ لە کامە باخ و رەزدان
پەسنت چ بدەم ئەوەندە جوانی
وەک هەرچی بڵێم جوانی وا نی
ئەی شاهی جوانی پادشایان
واباشە لەبیر نەکەن گەدایان
تا دەرچێ بە دادپەرستی ناوت
بیانکوژە بە تیلی مەستی چاوت
لە گوناهی هەژاری خۆت ببوورە
لێم روون نییە گەرچی ئەو چ جورە
هەر هێندە هەیە دڵێکی من بوو
رۆژگارێ لە لام بوو ئیدی ون بوو
گوایە پەری دەستی لێ وەشاندم
تای ژینمی بڕی و دڵی رفاندم
کاتێ لەگەڵم هەواڵ و جووت بوو
زۆر بادی هەوا و بەشات و شووت بوو
لاسار و بزۆز بووە دیارە
گش کەس بەشی خۆی گوناهبارە
بۆ دانەیی خاڵ چوو کەوتە داوا
گیراوە لە بەندی بسکی خاوا

هەرچی لەگەڵی بکەی ڕەوایە

بمبوورە کە بۆی دەکەم تکایە

بیبەخشە گەلێ نەزان و خاوە

بەو پرچە ڕەشەت پەنای هێناوە

بەخشینی گوناه هەرچەند کەمیشە

بەخشەندەیی خۆشترە هەمیشە

ئەی سەروەی نەرم و پاک و خاوێن

بەسپایی هەڵستە ماچ کە داوێن

توخوا شنە کاتێ دەردەچی و دێی

بۆم بێنە کەمێک لە تۆزی بەر پێی

تۆزێ کە لە سۆلی ئەو سواوە

دەرمانی دڵە و سۆمای چاوە

# سەرکۆنەی دڵی خۆی دەکات

جـەنگی بـوو چەڵێک دەگـەڵ دڵـی زار
ئەی نـاکـەسی پێنەزانـی لاسـار
تـۆ دڵـمـی لـەگـەڵ مـنـا نـەیـاری
داد ناگـرێ فـەهـێـد و شـەرمـەزاری
بۆ کـوێ چـوو ئەوەندە سـوێند و پەیمان
خـۆت چووی و هەزار گـوتەت لە پەیمان
هـیـچ بـێ ئـەمـەگ و نمـەک وەکـی تۆ
هـەرگـیـز نـەبووە و نـیـیـە تـەکی تۆ
بـێ گـفـت و بەڵێنی چەوت و چێـڵـی
بڕیار ئەوە بوو بەجـێم نەهێـڵـی
دەتوت کـە لەگـەڵ تۆ راست و پاکم
ئـازام و بـەدوور لـە تـرس و بـاکـم
ئـەی بـۆچـی لـەبـەر ئـەویـن هـەڵاتـی
ئەی بۆچی دەڕۆسـتی خـەم نەهاتی
بۆ خـۆشـی و شـادیـان هـەواڵ بووم
نـامـنـاسـی کـە تووشـی رۆژی تاڵ بـووم
بڕوانە گـیـان چ مـەرد و رەندە
بـێ هـێـز و زەبوون و کـز ئەوەندە
جـێگیـرە لە گـرتووخـانەکـەی لەش
شـایـیـم چ بە تۆ بـێ ئـەی دڵـی رەش
تۆ چۆن دەبوو گـیـان بەجێ بـهـێـڵـی
گـیـانت نەبێ پارچەیەک لە سـێـڵـی

زیندوویەتی تۆ لە پیتی گیانە
رووناکیی زەوی لە عاسمانە
بێ مۆم و چرا چلۆن دەوێری
تاریکییە رێنەزان و کوێری
بۆ یار دەچی یار لەناو گیاندا
هانای ببە بەر کە پێت نیشان دا
تۆ ئاوێنەیەکی روونوێنی
گیانت کە لەبەر نەبێ چ دینی
لێی دوور مەکەوە دەسم بەدامان
هیچ ناکرێ پاشەرۆژ بە دامان
هەر دەرچی لە رێگە نایە سەر رێ
چاری سەری خۆت کە چاری دەبڕێ
پێ مەبڕە لە دەرکی ئەو بەهیچ جۆر
تا باڵ نەشکاوە بفڕە بۆ ژۆر
بۆ کوێ دەچی چیتە بۆچی ون بووی
یادت نییە تۆش بەشێک لەمن بووی
خۆ ون مەکە خۆ نە گێژ و کاسی
خۆ ناس بکە تا خواش بناسی
پێت وایە بەبێ مە چوویە لای گوڵ
گوڵ لای منە تۆ گەییت بە پێکوڵ
بە ژن و کەزییەک لە تۆ دیارە
راکێشت دەکاتە پای قەنارە
چی وێڵی لە شوێنی ئەو خەیاڵە
بۆ یار دەگەڕێیت و یار لە ماڵە
بڕوایی مەکە بەوردە خاڵان
ماڵت مەدە زەنگیان بەتاڵان

پێوەند مەکە خۆت بەداوی بسکان
بەس بۆ دەم و لێو بدە هەنیسکان
زەردەشت دەپەرستی ئەی بەڵاگر
نێزیکی بەسە دەکەویە ئاگر
جۆری تۆ هەزار مەلی بریندار
شینگێڕی بکەن بە داد و هاوار
من جۆری پەپوولە دەبمە قەقنەس
تێ ناگەیەنم لە رازی خۆم کەس
ئەی دڵ دەتەوێ لە خۆشیا بی
تا وابێ هیوات نەبێ کە چابی
پرسیم لە بژیشکی ژیر و چازان
بۆ تۆ وتی: داخ و دەردە دەرمان
پارێزی بکەی لە خۆش و خۆشی
شیرن برژێنی تاڵ بنۆشی
چیت ئارەزووە زیانە بۆ تۆ
خەم چارەتە ژان ژیانە بۆ تۆ
هێند دەردەدڵی لە کن دڵی گوت
بەو خاکە سەرەدڵی دڵی سووت
وەک ئاگرێ بەربدەیتە هەژگەل
دای گرتە چرە چەمان و دووکەڵ
قورمی رەشی خستە بان مەڵاشوو
مێشک و سەری ئاخنی تەپ و دوو
ئاوێنەی روونی هۆش و ژیری
وا لێڵ بوو چشت نەما لە بیری
وەک هەورە رەشێکی سەربەخۆ بوو
هەوراز چوو لە عاسمان وەکو بوو

خـــــوێناوی هـەناو و چاوی پڕ تەم
داباری بەرێژنەیەکی کــــەی کـــەم
تەرزە کوتی و وردی جـەرگ و سی هات
لەم شـەسـتـە رەهێڵـەدا لەهـی هات
لافـــاوێ لە دەردی دڵ هـەڵسـتـــا
مـەم پێی نەدەوەست و پێی نـەوەسـتـا
پێت وابوو کــــە دەجلە و فـــــوراتن
جـەیحـوون چووە پاڵ و هەر سێ هـاتن
هـەرچەندە بە شــــینی ئەو ئەویندار
شین بـوو لەدەم ئەم چەمـە سـپـیندار
ئەو دەشـتــە بووبوو بە بـاخ و گــوڵزار
تا چاو بڕ دەکـا هەمـووی گـوڵ و دار
ئەو بولبــــولی هێندە ئارەزوومــــەند
بەندی لەشی لێ بووبوو بە پێـــوەند
تـوڵـی رکــــــە لێـی وەراند پـەڕ و باڵ
پۆشـرابوو بە مـووی سـپی سـیاخـاڵ
باڵای وەکـــو ســـەوڵی بوو کــــەوانی
ئاوا بــووبوو مــــــــانگی ناوچەوانـی
سـەرکـوڵـمـەیی سـێوی زەردە بێ بوون
شـــوێن داخی لە ئاوی چاوی لێ بـوون
وا بـووبووە شــــەلاڵ لە ئاو و خـــوێنا
ئـاوێــنـەی رەنـگـی ژەنـگـی هـێـنـا
چی تین و توان و هـێــز و بیـــر بـوون
هـەڵیــان نـەدەکـــرد و لێی زویر بـوون
چل رۆژ و شـــەوان کـــەوت لەدەم چەم
زیندوو بوو بـەدەم بەلام بە حــاســتـەم

## دەرچوونی میری بۆتان بۆ راو و نێچیری

نێچیرگری دەنگ و باس و خواسان
وا ریزی وتاری خۆی دەدا سان
رۆژی هەرمتی بەهار کە خۆشی
دار و دەر و بەرد و هەردی پۆشی
بە گیا و گوڵ و چلووکی بە کڵووک
رازاوە جیهانە پیرە وەک بووک
هەر یەک لە نواڵ و کێو و دەشتی
بوویەونە برەو بەری بەهەشتی
هەر باخچەیە وەک بەهەشتی گەورە
سەرچاوەی ئاوی ژین لە دەورە
هەر کێوە لە جۆری کێوی تووریٚ
موسا دەبوو پاپەتی ببووریٚ
هەر چۆمە لە جۆری هەژدیهایەک
هەر داریٚ بەزاری خویٚ خوایەک
هەر سوورەگوڵیٚ گرێکی بیٚ تین
هەر چیمەنیٚ شین و شادی بیٚ شین
چی بولبولە کردبوویە گاڵە
هەرچی مەلە بووبووە هاوپیاڵە
گاکێوی و ئاسک و مامز و گۆر
کەو قاز و قورینگ و کۆتر و پۆڕ
گەلگەل دەچرین لە کێو و شاخان
پۆلپۆل دەفڕینە مێرگ و باخان

ئەو کاتەیە باوی گەشت و راوە
هەر کەس کوڵی دڵ دەنێتە لاوە
فەرمانی سەرۆکی کوردەواری
وابوو کە بەیانی خەڵکی شاری
گش خۆرت و جوان و پیر و لاوێ
بابێن لەگەڵم بچینە راوێ
زوڕنا و کەڕەنا و دەهۆڵ و دنبەک
بێنن هەموو بێن بە چەک چ بێ چەک
نێرینە بمێننەوە لە ماڵان
ماڵ و سەریان دەدەن بە تاڵان
ئامادە بەچەک ئەوانی بوویان
هەر کون دەبەیان نەبوو هەموویان
کۆبوونەوە گشت لە دەوری شارا
رووت و بەشمەک هەژار و دارا
پێخواس و بەکەوش و میر و ئاشێڕ
سەربەرز و نەوی و بە پێ و شەل و گێڕ
هێندێک چەکە چەک بڕێک بە پرتاو
بەو بەزم و هەرایە گەیینە جێڕاو
دابەش بوو شکار لە ماه و زەنوێر
جێ لەق بوو ورچ رەوین گور و شێر
هەوهەو گورەگوڕ لە جۆری هەوران
پێی تۆقی دڵی پڵنگ و بەوران
بەگزادە و پاڵەوان و سەردار
هی گورز گران و سووکەڵە سوار
دەگرن سەری کێو و دەشت و قەدپاڵ
دەکوتن دەچن بە گورز و گۆپاڵ

دەگـــرن دەدڕن وەزیر و مــــیـــران
ئاسک بە کـەمـەند و شـێـر بـە شـیـران
تـاژی و توولە پێش بە پێــشی پێــڕەو
راوپـچکە دەکــەن کــە هەڵفــڕن کــەو
دەگـــرن بـەرەگـــــە بـە بـاز و تـەرلان
کــەروێشـکی وەدەر دەنێـن لەســەر لان
ژێ دەکـشـن و تیــر بـە گــەل دەهـاوێن
بـاڵنـدە دەکــــــەونـە دەشـت و داوێـن
کـێ دێ بـەزەیـیی بـە بـێ زمـــــانـان
دەمــرن دەمێ بـەزمــە بـۆ مــەمــانـان
ئەسـپی رەســەنی حـدوودی گـوێبــەل
گـرتـیـیـە خــەنە کلک و یاڵ و چوار پەل
با کـێـشـەوە کـەن لە گـۆشت هەژاران
ســاغــان بە خــۆڕا بـەرن ســواران
ئێــــوارە کـــــە هـات و راو بـەتـاڵ بـوو
دڵخــۆش هەمــوو لایە روو بەمـــاڵ بوو

## پەسنی باغی میری بۆتان دەدا

میر بووی لە تەنیشتی کۆشکێ باخێک
چۆن باخ لە دڵی بەهەشتێ داخێک
تانجێکی گوڵان لەسەر جیهانێ
دارسووبوو سەری لە عاسمانێ
باڵندە ئەوەند بوو لەو بەهەشتە
راست بووبووە بەهەشتی پڕ فریشتە
کاژ دەستەملان لەگەڵ سنۆبەر
نێوان بوو لەناو چنار و عەرعەر
نارنج و بەهێ لە رەنگی زینێ
زەردی کەسەر و کوڵی ئەوینێ
خورما و هەنار و سێوی داران
لێو و مەم و کوڵمی نازداران
شەوبۆ و وەنەوشی تازە دەرچوو
لای پۆلە گوڵێکی کات بەسەر چوو
گوڵ پیاڵەیی گەوهەری لەسەر چنگ
سەر رێژ لە تنۆک تنۆکی ئاونگ
دێراوە رەزی تەکووزی رێز رێز
گیرابوو لە کەسک و سوور پەراوێز
پێت وابوو ستێرەناسی زانا
ساڵپێوی لەواندەرانە دانا
دەتدی هەموو شوێن و چاوە چاوە
شینایی لەناوە دەوری ئاوە
هێرۆی رەش و سوورگوڵی شەق و گەش
لاسا بوو لە خۆشیی دڵ و بەخت رەش

## ژوانی زین و مەم لە باغی میردا

ئەو ئاسکی نێچیری راوکەری خەم
چاو سوور و تەڕی نەدیتنی مەم
ئەو تازە نەمامی باخی جوانی
سیس و کزی دوور لە باخەوانی
پێوەندی ئەوین بەکۆت و زنجیر
مامزێکی مەمی دەکردە نێچیر
ئەو رۆژە کە دەرچوو کاکی بۆ راو
شوفار و نەیار بڕان لەبەر چاو
نێرینە نەما لە باخ و مالا
خەرمانی خەیاڵ لە دەوری هالا
تا هەل هەیە هەستە ئەم جیهانە
چەپگەرە نەسازە بێ وچانە
تا دەرفەتە سەیری گوڵ کە ئەی دڵ
ترسم هەیە زوو بچیتە بن گڵ
گەشتێکی بکە لە دەم دەراوێ
تاوێ لە مەلان بگێرە چاوێ
بیستوومە هەیە یەکێ بەختڕەش
وەک ئێمە بە ئاخ و داخ و بێبەش
رۆژ ناڵە دەکات و داد و هاوار
بەخوێنی دڵی دەژی بە شەوگار
بێچارە لەدەوری گوڵ دەدا خول
ئاوارە مەلێکە ناوی بولبول

دەرمـــــــــــانـی دڵـی مـنـی لـەلایـە
بیـــــبـــــینم و لێی بکەم تکایە
وا خـــوایە دەڵێم بەگـــفت و پەندێ
رێـم پـێ بـڵـێ دەرکــــــەوم لـە بەنـدێ
خـۆی دزیـیـەوە کـەوتە بـاخ و گـوڵزار
بێ تـایەن و سـەرسـپی و پەرسـتـار
کــەم سـەیری گــوڵان دەهـاتە بیــری
زۆرتـر دڵی دەچووە گــۆشـەگـیــری
بـاخ بۆیە بوو چۆڵ و دووره خـــەڵکە
بۆ گـــریە و داد و شین بە کـــەڵکە
بالای وەکو سەرووی خـستە سـەر گڵ
فـــرمــێـسکی رژاندە بن گـوڵ و چڵ
مـــێـــلاقــە لە تـاوی پەرپەڕی کـــرد
خـــونچـــە لەگـەڵی بەرۆک دڕی کــرد
هــەر داری وەکـــی وی لـەش بــەبــارێ
پشـکۆ بـوو هـەمـــوو گـــوڵی هەنـارێ
لایان کـــە دەسـی دەکـــرد بە باســـان
خـــۆیان دەهەژاند لەگـــەڵ هەناســـان
لە سـووێی وی لەسـەر لک و لە هـەر پەل
گـــاڵەی بـوو گـــەڵا بە ناڵە بۆ مــــەل
فـرمـێـسکی ئەوەندە رشت لە چاوان
ئاڵ و گـــەش و ســوور بوو رەنگی ئاوان
سیس بوو گوڵ و شینکە کەوتە ناو هەش
ئاهـی لە هـەوا بـووە پەڵە و کـــــەش
بولبـول خــەمی خـۆی لە بیـر نـەمـابوو
بۆ ئەو لە پەژارە و و خـــــەمـــا بوو

زۆر چاوی گەڕاند لە دۆست و هاودەرد
دایبەستە وتار لەگەڵ گوڵی زەرد
تۆش وەک منی رەنگ لەڕ و پەڕیوی
تۆش ئاخۆ ئەوین دڵی بڕیوی
تێراوی هەزار پەڕی تەیاری
ئەی چیتە کە زەرد و کز دیاری
تۆش دڵ بە کوڵ و خەمی وەکی من
تۆش دیارە کە بێ مەمی وەکی من
بولبول لە گوڵی گوڵاوە کڕیار
تۆش وەک منی دوور لە دڵبەر و یار
پێم خۆشە کە ببیە هەمدەمی خۆم
دەردی مە یەکە و منیش وەکی تۆم
خوشکێکی منیش وەکو گوڵی سوور
دڵداری گەیشت و ما لە من دوور
من ماوم و بولبولێکی داماو
بۆ یەکدی جگەربڕاو و سووتاو
بێچارەم و چارەڕەش وەکو ئەو
رەنگ زەردم و رۆژ و بەختمان شەو
هەر جارێ کە بمدیایە تەنیا
بڕیارە گلەم نەبێ لە دنیا

## مەمیش بەرەو باغ دەڕوا

چی دێتە سەرت لە راست ئەگەر چەوت
هۆیەک هەیە دێتە رێ بە هەڵکەوت
دوو یار هەیە دڵسووتاون بۆ یەک
لە پڕێکی بۆیان دەرەخسێ هۆیەک
رێکەوتی دەبێ و دەگەن بە دڵخواز
نیازیان چییە تووشی دێن لە رێباز
مەم هێندە لەشی گرانی ئازار
رۆژێ کە نەمابوو کەس لەناو شار
کەوتە سەری بیری دینی زینێ
بیماری نەهێشت گرەی ئەوینێ
هەستی نەدەکرد بە لەش بەباری
چاک بوو بە هەوای دیداری یاری
شێواویێ کەوتە ناو دەروونی
دەرچوو بوو لە دەستی دەرنەچوونی
ئاواتی دڵی دەچوو لە پێشا
وەک خدری نەمر دەسی دەکێشا
سەرکێش بوو دڵی پساندی هەوسار
هێدی نەبوو تا گەیشتە گوڵزار
زینێک کە بەرۆژ و شەو دەم و ژەم
گیرابووە ناو تەمی خەمی مەم
دەیویست هەر ئەوەند بژی بە ژینێ
جارێک بەتەنێ مەمی ببینێ
روانی لە نەکاو مەمە و لەدەر هات
وا داری هومێدی بۆ وەبەر هات

عیسا گەیی بۆ نەخۆشی حەستەم
بووراپەوە دڵ گـــــــــری درا دەم
تاساو تلی دا دڵی و سەری خول
پێسیری دڕی لە تاوی بولبول
بێ هێز و توان کەوت بە بێ هۆش
سەرچیمەنی کرد بەبەژنی گوڵپۆش
مەم هات و لەگوڵ خشاندی چاوێ
وێستا لە پەنای ومنەوشە تاوێ
ئەی گوڵ وتی گەرچی نازەنینی
کوا وەک پەڕی کوڵمی سووری زینی
لاوچاکی هەرچەند ومنەوشی پەرگەش
ڕێت ناکەوێ بچیە پاڵ کەزیی رەش
هۆ بولبول ئەگەرچی دەردەداری
سووتاوی گڕی گوڵی بەهاری
تاقە گوڵەکەم لە گوڵتە گەشتر
خۆشم لە تۆ بەخت و چارە رەشتر
دڵداری بەڕاستی منم من
بێهوودە ژیانی خۆت دەکەی ون
گوڵ هەر نە یەکێکە سەد هەزاران
دەڕوێن لە زەوی هەموو بەهاران
هەر دڵبەرێ چەشن و جۆری زۆرە
بێ نرخە هەچێکی زۆرە بۆرە
هەر جێیە دەچی گوڵ و گوڵۆکە
هەر جاییە گوڵ گەڕۆکە سووکە
ئەو سوورە گوڵەی کە من بژاردم
دامێ دڵ ئەوینی پێ سپاردم

وێنەی لە جـیـهـان نـیـیـە یەکی تر
نـایبـێ زەوی چـەشـنـی زیـنـێ چی تـر
دڵداری گـولێکی وا کـە نەمـرێ
چ بکا و بـە چ بارێ چاری دەکـرێ
سـەرگـێـژ دەگـەڕا بەدەم گـرینێ
لە پرێکی گـەیشـتـە بەژنی زینێ
ئەو زینە کە بووی دوو سەد پەرستـار
ئەو بەژنی لە پەلکی گـوڵ بە ئازار
خـۆی داوەتە سـەر گـیـاوە بێ هۆش
تومـەز لە مـەی ئەوینە سـەرخـۆش
ئەو گـەوهەری بێ هەواڵە لەو شـوێن
بەرچاوی کـەوت مـەمی جگەرخـوێن
لەرزی وەکـو ئاو و چوو لە سـەر هۆش
پێـڵـووی چەمی بوون لە زینی پاپۆش
فـرمـێـسکی پەڕینە لاقی زینێ
دارگـوڵ وەگـەشـا بە ئاوی ژینێ
ئاونگی تکاند و خـونچـە پشکووت
زین ژیایەوە مـەم بە تیـری ئەنگووت
بڕوای نەبوو چاوی مـەسـتی زینێ
پێی وابوو مـەمی بەخـەو دەبینێ
هەر تاکـو مـژی گـومـانی لاچێ
ویسـتی دەمی تەڕ بکا بە ماچێ
خـۆی هێشـتـە گەلێک نزیک نەکردوو
بۆی ژیاوە نێـچـیـری نیـوە مـردوو
چۆن ژینێ گەیشتـە مەم کە هەستا
زینـ لە تەنیـشت و دەست لە دەسـتـا

لەو خۆشییە هەردوو گێژ و وڕ مان
بێ ورتە و لاڵ و پاڵ و کڕ مان
داخوازی بە دڵە و بەڵێن بە چاوە
تا کاتێ گرێی زمان کراوە
ئەم جارە بە گازنان و نازان
بەربوونە گلە و نیاز و رازان
دیتیان گلەیی لە دەردی دووری
بێ بەهرە بوو کاتی پێ دەبووری
با دەستێ دەبەژنی یەک وەرێنن
ریشەی کوڵ و کۆ لە رەگ دەرێنن
دووی تازە نەمام لە یەکدی هالان
تالانە مژینی لێو و خالان
نۆشیان مەی دڵتەڕی لە لێوان
نە ژمارە لەوێ هەبوو نە پێوان
کولم و چەن و لێو و سنگ و گەردن
هەریەک دەم و دەستی بۆ دەبردن
سەر بوونە گران لە سووکە ماچان
هەر دەرد و کەسەر بۆ دادە پاچان
زین بووبووە گڕ ئاگرێکی حەستەم
پڕ تین و دەئایسا لەبەر مەم
مەم بووبووە پەپوولەیەک مەرگ کڕ
پەروانە بوو خۆی دەخستە سەر گڕ
بیگوێزنەوە ئاشکرایە جێ و شوێن
زۆر خۆشە تلانەوەی لەسەر نوێن
لەو باخە هەبوو چ سەرسەرایەک
ئاوێنەی جەم جیهان نومایەک

مـــەم پیـــادە و زین لە باوەشــی مـــەم
وا دەســـــتـــــەمـــــلان و دەم لەناو دەم
ســـەرکـــەوتن و گـــەینە شـــانشـــینان
هـەڵچـــــوو گـــڕی دڵ لە دڵ بە تـینان

زین وا دەمــی مـــــەم دەبمژە لێـــــوان
مـەم وا مـەمی زین دەبوگشـە سێـوان
با چاو بەبەفــر کـــەوێ لەســـەر سنگ
با پڕ ببـێ قـــــوڵکی مـل بەئـاونگ
خـــۆی گـــەردنی یەکـــتـــری بنۆشن
مـەست بن و لە شـەرمێ چاو بپۆشن
تـۆڵـەی دەمـی دووری ســـــــــێندراوە
هـەر نوێژێ کـــە رۆیـــبـــوو گـــەڕاوە
ئەو نوێژە کـە مـاچ دەچێـتـە جـێگەی
هـەڵدەگـــرێ ســـەرت بچێ لە رێگەی
ئازاد بووبوو لەش لە پێ هەتا ســـەر
بێـجگە لە نێـوانی چۆک و کـەمـبـەر
پـاوان بوو نـێـــــوانـی رانی هـەردوو
پاســـداری لە پاکـــژی لەســـەر بوو
دڵداری بـە راست و پاک و خـــــاوێن
چاوی تەڕ و ســـــوور دەبێ نە داوێن
ژەنگ ناگـــرێ هەرچی زێڕی چاکـــە
پیس نابێ کـــەسێ بنیـــچـــە پاکـــە
نەخــــوازە ئەوین وەها ببــــێت زاڵ
رۆژێک هـەلێ هـەڵکەوێ بە چەند ســاڵ
چۆن پـەسنی بدەم دەبێ چ بێـــــژم
تێ مــاوم و کـــاس و گـــێـــژ و وێژم

## میر و راوکەر بەسەریاندا دێن

مەیگێڕ نەچی دەست لە ئێمە بەردەی
سەرخۆشم و مەست بەڵان بەبێ مەی
مەستی کە گەیشتە نازەنینان
ورتاندی لە من دەمی بریnan
هەرچەند بە رواڵەت مەی پەرستین
راستی بە مەی ئەوینە مەستین
سەوداگەر و مەستی دەستی تۆ نین
مەستی مەیەکی لەمێژ و کۆنین
ئەو مەی نە بە رەنگ و بۆ دیارە
ئەو مەی لە جوانیی کردگارە
دڵمان بە خواوە بەستراوە
هێشووی مە لە باغی ئەو چناوە
مەیگێڕ دەوەرە لە ڕێی خوادا
بۆم تێ کە پەژارە دەین بە بادا
لەو بادە کە دەتگەڕاند دوێنێ
سەرخۆشی هەتاهەتا دەمێنێ
بێهۆشی تیا سەرەونخوونە
بەپریشکێ دەروون هەمیشە روونە
هەر تاقە قومێکی لێ بچێژم
یەکجاری خەم و خەیاڵ بنێژم
لادەم لە سەرم سەرئێشی دوێشەو
وشیاربمەوە لە گێژی و خەو

هۆشم لە دەسم نەچێ وەکــو مـــەم
مـــەرگم بەســـەرا نەیە وەکـــو هەم
ڕۆژی تەمـــەنم گــەیشــتــە ئێــوار
ئاگــام نەبڕێ لە خــۆم بەیەکــجــار
هیـــــوای دڵـی ژار و هەرزەکـــــارم
جــێگایە هەبێ کــە لێی وەشـــارم
ئێــوارە کــە مــیـــر لە راو گـــەڕاوە
لەو باخــــە بە لەشکر و ســــوپاوە
فـــەرمـــووی بەهەواڵی دیوەخـــانێ
با دابــــــــەزین بدەین وچـانێ
لێ دەن کــەڕەنا و دەهـۆڵ و شـەیپــوور
ئاهەنگ بگەڕێ بە ساز و سـەمتـوور
بەریان دەنە مێــشــە ئاسک و گــۆران
بریـان ببێ بــۆ مـــــە سنگی پۆڕان
هاوپیــاڵە و بادەگــێــڕ نەکــەن رەو
بەزمی مــە لە کۆشکی باخــە ئەمشـەو
دیتیـان دەر و پەنجـەرەی لەسـەرپشت
پرسـیـارێ دەهاتە سـەر دەمی گـشت
کــێــیـــە لە ســـەر و ژیان بووە زویر
پێی ناوەتە کۆشک و سەر سەرای میر
ئەو دڵتـــەڕ و دڵســـووتاوی یەکــتــر
گـــیــــرۆدەی بەند و داوی یەکـــتـــر
لــەو بــگــرە و بـــەردە لــەو هـــەرایــە
لـەو زرم و کــــــوت و زەنـازەنـایـە
وشـــیـــار نەبووبوون پێـــیـــان نەزانی
گـوێبـیس نیـیـە مـەسـتی کـامـەرانی

میر راستەخۆ کەوتە شانشینێ
جێژوانی مەمی هەژار و زینێ
گۆڕاندی کە کێ لە ژین بووە تێر
وێراویەتی پێ بنێتە جێی شێر
تاریک بوو نەکاری کەس ببینێ
کوژایەوە تیشکی کوڵمی زینێ
مەم چوو لە نوێنی پاڵی داوە
زینیشی وەشارت لە ژێر عەباوە
بەچرا دەر و ژوور کە روون کراوە
بەکزێکەوە مەم وەرامی داوە
بمبەخشە نەخۆش و بێ بڕەستم
هیچ هێزی ئەوەم نییە کە هەستم
گەورەم تۆ دەزانی چەند نەخۆش بووم
تا دوێنێ بە دوور لە بیر و هۆش بووم
ئەمڕۆ کە ئەتۆ دەچوویتە راوێ
من خۆم نەدەگرت لە جێگە تاوێ
مەم شۆڕەسواری پێشڕەوی میر
بێبەش بێ لە گەشت و راو و نێچیر
سووتا جگەرم نەما سەرەوتم
پەتیارە و شێت وەچۆڵی کەوتم
شل بوو لە پرێکی هێزی ئەژنۆم
خۆم دیتەوە وا لە باغەکەی تۆم
بێ ئەرکە نەخۆش وتی بە مەم میر
تووشت نەبوو هیچ بە تووشی نێچیر
میرم وتی تووشی مامزێک بووم
چۆن مامزێ تووشی دڵدزێک بووم

سـەرمـێگەلی پۆلی چاو کـەژالان
رەوتـی دڵ و هـۆش دەبـا بـە تـالان
بۆی خـۆشی دەدا بە ئاسکی چینێ
چم دی وەکـو من چ کـەس نەبینێ
دەیڕوانی هـەرچەند بە نیـوە ئاوڕ
جـەرگم دەتوا دڵم دەبوو سـڕ
پێم وابوو فـریشـتـە بوو نەئاسک
لە کـوێ هـەیە ئاسکی هێندە ناسک
پێش پێی تۆ لەناو هەمـێـزی من بوو
تۆ هاتی و ئەو فـریشـتـە ون بوو
تـاژدین لـە وڕێنـەکـانـی زانـی
زین گـەیـوەتە ئێـرە بۆ ژوانی
مـەم شـێـتـە وتی هەڵەی بپـۆشـە
نازانێ دەڵێ چی زۆر نەخـۆشـە
با لەو بگەڕێین ببـێـتـە ئاهەنگ
با مـەی بگەڕێت و دەنگ بدا چەنگ
با تاوێ بەبادە سـەرگـەرم بین
بـۆ دەردی ئـەویـنـێ دڵـنـەرم بـین

## برای چاک بۆ رۆژی تەنگانە بەکارە

ئەو جۆش و خرۆش و بەزم و ئاهەنگ
زۆرتر مەمی کرد زەبوون و دڵتەنگ
تاژدین دی کە مەم گەلێ کەساسە
لێی پرسی بە چاو برا چ باسە
مەم دەستی لە ژێر شمەک دەرانی
بسکی رەشی زینی دا نیشانی
پاپوکەیەتی لە پشت مەمی ژار
جووتێ کەزی رەش وەکو دوو شامار
دی کارەکە گەند و نالەبارە
بۆ رۆژی وەها برا بەکارە
هەر لاق و دەستێکی بوو بەباڵێ
هەرچی زووە خۆی گەیاندە ماڵێ
ئەستی وتی رەنگ لە روو نەماوی
کێت دوژمنە چیتە داشڵەژاوی
تاژدین وتی ماڵە دوژمنی من
کۆتێکە لە پیل و گەردنی من
سەرمایەی گەورە و گرانم
بیبیلەی هەردوو چاوەکانم
مەم بوو ئەو و زین لە گێژی کەوتوون
سامانی مە گەر نەچێ ئەوان چوون
گەر ئاگرێ بەرنەدەینە خانوو
بۆ چاری ئەوان نەما بیانوو

مــاڵ بۆ من و بۆ تۆ کــۆرپە ســاوات
ئەم پیــاوەتیــیــەم دەویست بە ئاوات
بیســتوومــە کــەسانی خــانە سووتاو
ئاگـــــر دەکـــــوژێننـەوە بەهۆی ئاو
مــن ئـاوی بــەڵا دەری بــراگـــــــــر
ئەم شـــەو دەکـــوژێنمـــەوە بەئاگـــر
مــاڵ ئاگری گــرت لەســەر هەتا خــوار
تــاژدیــن مــلــی نــا لــە داد و هــاوار
خــزم و کـــەس و کــار و هۆز و هــاواڵ
یەک جێ هەمــوو بازی دا رووەو مــاڵ
هەرکەس کە لە باغ و سەرسەرا بوون
تاقـــێکی نەمـــا بەرەو هەرا چوون
مـــەم مــوژدە دەدا بە زین کــە تاژدین
بڕوانــە کـــــە چی لەبارە کـــــردین
دەریای خـــــەمی لێ وشک هەڵێنایـن
بە گـــــڕێکی لە دۆژەهــی دەرێنـایـن
تۆ هــەســتــە بچــۆرە کۆشکی شــایی
من توورڕ بدە ئاگـــــری جـــــودایی
تاژدین هەچی بووی هەمووی سەروبەر
لە شــمــەک لە بەرگ لە خشڵ و زەنبــەر
لە پیــاوەتیــیــا کـــە گـشــتی دانا
مــا ناوی نــەمــر لە رووی جــیــهــانا
لە دڵی خـــــۆدراو دەراوێ کـــاکـــــە
کـــارت کـــە هـەیە بەناوی چاکـــە
قـــالۆچە وەکــۆ دەکــەن شــیــاکــە
گــەر پاکی نەپاک لە خــۆت جــیــاکــە

بەختی کە دراو بیبەخشە بیخۆ

دەیبەن کەلەپوورکران بە فیرۆ

ئەو کاتە گیان دەچێتە بالا

نەدراو نەشمەک بە دەستی والا

بازاڕی ئەوێش وەک ئێرە وایە

هیچت نەبێ چت لە دەستی نایە

کەی نرخی بەهەشتە دوو وتەی رووت

کەی رێ هەیە بچتە پێشێ نابووت

خۆشیت گەرەکە لە رۆژی داوی

پێشباری بەرێ کە تاکو ماوی

یان بەختی بکە لە رێی هەوالان

پاش مردنی خۆت دەچێ بەتالان

تاژدینێ چ خۆشە هەڵکەوێ بۆت

ناوێکی نەمر بسێنی بۆ خۆت

دەستت کەوێ دۆستی راستەقینە

هێژای هەموو گەنجی سەرزەمینە

## رازی دڵداریی زین و مەم بە گوێی میر دەگا

شــای پایە بڵندی خــۆشــەویســتی
خــونکاری جــیــهــانی دڵپــەرســتی
ئەو ســەروەرەی خێوی تەخت و بەخــتە
ونبــوونــی لە چاو شــتێکی ســەخــتە
وەک رۆژ کــە لە عــاســمــانی چوارەم
لەم جـــــێگە و رێگە دوورە هــەردەم
بێ بەرگـــر و پەردە تیـــشکی داوێ
کـــام چاوە نەبینێ تیـــشکی تاوێ
دڵداری و خـــــۆر وەکـــــو برانــە
شــــێـــرانەومیان گـــەلێ گـــرانە
تیـــژباڵ دەفـــڕن نێـــوانی دەبڕن
لەمـــپـــەر دەپەڕێنن و پەردە دەدڕن
رازی دڵی زین نـهـــێنـی یی مـــەم
هـەر هێندە ژیا کـــە هاتە ســـەر دەم
بلوێری شــــڕی زمــــانی نــاســــاز
ئـاوازی دەدا لــە چۆڵ و رێبــــــاز
لەو جـــووتە وەها بڵاو بووبوو دەنگ
بەو بوو گــەڕی کـۆڕی بەزم و ئاهـەنگ
لەو مـــــۆم و پەپوولە بێ برەو بوون
بــەر هــەر وتـوێـرەیـەک هــەر ئەو بوون
وەک شـــەوچەرە بوو لە دیوەخـــانان
دڵخـــۆشکەرە بوو لە نێـــو جـــوانان

دووی دوور له هەموو گوناھ و سووچێک

ناویان چووە هەر کەلێن و سووچێک

هەر زارێ وەکو بنێشتە خۆشە

دەیجوو لە هەموو کەنار و گۆشە

هەر رازێ کە جارێ کەوتە زارێ

وا بزانە کە کەوتە زاری شارێ

وشتر نە بەسی بوو بارگرانی

وا زەنگولەشی خرا ملانی

بێکار و زمانشڕ و نەزانان

منداڵ و ژنان لە دەرک و بانان

گفتیان گر و ور کە زۆر و کەم بوو

دڵ پێکەوەبوونی زین و مەم بوو

بووبووە سەروین لە بەند و بەیتان

تا تەنییەوە گەییە بەکری شەیتان

دەستەوبەجێ رێ و رێ نەبوو گیر

نووک و بەدی نایە بەردەمی میر

میر پرسی کە چۆن دەزانی وایە

بۆم دەربخە لەم گلۆلە تایە

بۆم روون کەوە بیخە بناوان

چۆنی بگرین بە سووچ و تاوان

هاسانە وتی بنێرە مەم بێ

تاق ببنەوە خۆت و ئەم لەیەک جێ

شەترنجێ بکەن لە مەرجێ دڵخواز

لێم روونە کە دێنە روو نیوڕاز

دۆڕاندت و بردتەوە لەجێوە

لێی پرسە بڵێ دڵت بەکێوە

ئازایە نەترسە پاڵەوانە
سینە و دڵی پاکژە و جوانە
دڵدارەکی راست و بێ درۆیە
دەیڵێ کە دڵی لە خوشکی تۆیە
خۆت ئەو دەمە خێوی بیر و ژیری
خاوەن دەسەڵات و بەند و شیری
خونکار وەکو ماری ژەهردارن
جوان دیاری دەدەن لە بن نەیارن
ماچت کە دەکەن بترسە ژەهرە
زیانیان پترە لە سوود و بەهرە
خۆت توخنی مار نەکەی کەم و زۆر
مار مارە چووزە و سپی و رەش و بۆر
هەرچەندە لەلای بەنرخ و نازی
پێک بێنێ هەچیکی لێ بخوازی
تۆزێک لەگەڵت دڵی کە گۆڕا
جێت چا دەکرێ لە تەنگی گۆڕا
نەخوازە کە پیس و دووزمانیش
لای بن چ دەکەی لە چنگ ئەمانیش
ئەی خوایە نەکەی نزیکی سەردار
نەپیاوی هەژار و پاک نەبەدکار

## میر و مەم شەترەنج دەلەیزن

شـــاســـواری بناری خـــاوەرســـتـــان

خـــوای بەرز و بڵندی رۆژپەرســـتـــان

رۆشنکەرەوەی بەژ و کـــەژ و کـــۆ

کـــاتێ کـــە وەســـەر کـــەوت لە ئاســـۆ

تیـــرێژی کـــە رشت و دابەشی کـــرد

دەوری شـــەوەزەنگی دا و کـشی کـرد

مـانگ بەو کشـەماتە کۆی ستێران

وەک پیـــادە لە گـــۆڕێ هەڵوەژێران

میر ئەو شەوە چەشنی شێری زامار

هەر جـــینگڵ و پێـــچی دا وەکـو مـار

شـــەوگـــاری گـــەیاندە رۆژ بەبێ خـــەو

خـــەم کـــەوتە دڵێکی خـــەو دەکـا رەو

شـای تاوێ کـــە هاتە ســـەر زەمـــینێ

شـای ئێمە گـەیشتـە شانشـینێ

فـــەرمـــووی ئەوی نۆکـــەری بەکـارن

هەرچی لە چەک و شـــمـــەک تەیارن

کـێ دەس کـــــــەرەوەن هەڵی بژێرن

دەورەم دەن و پـاسـی مـن بـدێرن

ئەمـــڕۆ دەمـــەوێ بەســـەر مـــەمـا بێم

با بزانێ کـــە ئەو چییـــە و ئەمن کـێم

بۆم بـانگ کـــــەن و نابێ پێ بـزانن

تاژدین و ئەوانی ســـــــەر بەوانن

مـەم دی لـە تەلاری مـیـری دوو رەنگ
رازایـەوە کـــــۆڕی بـەزم و ئـاهـەنـگ
هـەر جـێ پڕی خـۆش و بۆنی خـۆشـە
مـەیگێڕ دەڵـێ خـۆش بە مـەی بنۆشـە
پاش تاوێ بە مـەی کە سـەر گـەرم بوون
شـەرمن کـە بـەبادە بـێ شـەرم بوون
هـیـچ دوانـێ نـەمـــا لـە دێو و لـە درنج
کـێـشـای وتـە تا گـەیشـتـە شـەترنج
رووی کـردە مـەمێ ئـەگـەر بخـوازی
ویسـتم لەگــەڵم بکـەویـە بـازی
ئـامـرازی لـەیسـتـنت لەپێـشـە
کـێـشـەی من و تۆیە دەست بکێشـە
کێ بردیەوە مـەرجی ئێـمـە وابێ
هـەرچـی بـیـەوێ دەبێ رەوابێ
لاوێکی لـەلا بـوو مـیـر چ لاوێک
ئـازا و بـەکـار و خـێـوی نـاوێک
رۆسـتـەم دەسـی بـەسـترابوو لای ئەو
بۆ جـوانی نەبوو یەکـێکی تای ئەو
سـەرتۆپی کـوڕان و ناوی گـورگین
مـەرد و بـەئەمـەگ گـران و سـەنگین
هـاوبازی و هـاودەمی مـەمێ بـوو
هـاوشـادی هاوخـەمی مـەمێ بوو
زانی چـیـیـە خـۆی گـەیانده تاژدین
تـاژدیـنی وەکـو پڵـنگی بە بـرین
ئـاگـایی بە عـارف و چەکـۆ دا
هـەر شـێرە چەکی هەرای لـە خـۆدا

رازاوە کەمەر بەخەنجەر و شیر
دڵگیری برا گەهانە کن میر
لەم هاتنە مەم دووبارە بوو گەش
مۆرەی لە دووبارە بوونە دووشەش
ئەسپ و روخ و فیل لە دەرکە هاتن
دییان میر و وەزیر شاش و ماتن
مەم دیارە لە وازی کاری سازە
میر بۆیە دەڵێ دوودەستی تازە
ئەم دەستەشی بردەوە دەمەو جار
دیتی لە روانگە بەکری شوفار
وا زینە لە پەنجەران دیارە
چاو و دڵی چاوەنۆڕی یارە
رۆژێکە لە مانگ دەگیرێ چاوی
بڕوانە چ داوێ کەوتە داوی
کایە وتی میری من بەجێیە
نابەیتەوە تاکو مەم لەوێیە
با جێگەی خۆی بەتۆ وەگۆڕێ
لێم روونە دەدەستی مەم دەدۆڕێ
میر گۆڕییەوە جێ بەجێی مەمی ژار
جێگەی مەمێ کەوتە رووبەڕووی یار
هەر چاوی مەمێ کەوت بەڕووی زین
گورجێ لە دەسی چوو فیل و فەرزین
چاوبڕکە بەجۆرێ هۆشی گۆڕاند
ئەسپی بە پیادەیەک دەدۆڕاند
لەو دیمەنە مەم وەها بووبوو مەست
هۆشی نەبوو دای لە دەستی شەشدەست

ها مەم وتی میر دەبێنە دڵخوام
فەرمووو چ دەڵێی وتی لە ڕێدام
فەرمووی نە شتێکی وایە دڵخواز
ویستم لەگەڵت ببم بە هاوڕاز
رازی دڵی خۆت کە ئاشکراکەی
لای ئێمە گرێی دڵت رەهاکەی
کێت دڵبەرە کێ دڵت لەسەریە
هەرکێ بێ فریشتە یانە پەریە
هەر ناوی بهێنی بۆتی دێنم
گەر خواهیش و زۆرە بۆت دەسێنم
هەل هاتووە دیتی بەکری بەدفەڕ
قەل هاتە قڕین و کەوتە سەر گەڕ
هەر کەس وتی یاری مەم بناسێ
واقی وڕ دەبێ و سەری دەماسێ
زۆر بۆ مەمی چارەڕەش کەساسم
لەو ڕۆژەوە دیومە هێڕ و کاسم
بێچووە قەرەجێکە لێو کوتاوە
کرمە و لە قورم دروست کراوە
بەژنی وەکو داری ژەقنەبووتە
وەک سەلکە بزووتە رووتە پووتە
ڕێی ناکەوێ تۆی ببی بەداخواز
تووشم دێ هەزاری وا لە ڕێباز
ئەو تەوسە شتێکی وای لەم مەم کرد
تاس وڕی کرد لە هۆشی دەربرد
گەورەم وتی راست نیە درۆیە
هەڵبەستەیە گفتی سەربەخۆیە

ئەو شـۆخـە کـە بوومـە تۆزی ڕێگەی
شـازادەیە شـانشـینە جـێگەی
هێـلانە بڵندە توخـمی پاکـە
ڕووناکـیـیـە نەک لە ئاو و خـاکـە
بێ هـەمـبـەر و وێـنە نازەنینە
شـانازی زەمـینە ناوی زینە

ئەو گـۆتنی نالەبار و ناخـۆش
کینە و ڕقی میری خستە سەرجۆش
گـوڕاندی لە پۆلی دەست و پێـوەند
بۆ نایخـەنە بەند و بیکەنە پەند
خـوێخـۆرێ کـە ئەشکێنێ نمەکـدان
زیندانی دەوێ لە تەک شـەتەکـدان
دووسـەد کـوڕی پاڵەوانی حـەسـتـەم
یەک جارە هورووژمی کردە سەر مەم
تاژدین و چەکـۆ و برای لەدوو بەر
هەستان وەکو شێر و دەس بەخەنجەر
وتیـان گـەلی نۆکـەران بووەستن
چۆن ئێـوە دەسی مـەمێ دەبەستن
بڕواننە مـە خـۆ نەگـێـژ و کـاسن
خـۆ و هێـز و گـوڕی مە باش دەناسن
هەریەک لە مە بێ و لە ئێوە پێنجسەت
دەوکـەین بەدەمی دەبان لەتویەت
تا مـاوە تنۆکی خـوێن لەنێـو ڕەگ
یاریدەری دەبین و کـۆمـەگ
هـەرکـەس لەوە چەپ لە مـەم بنۆڕێ
گـۆڕ گـۆڕیەتی ڕێ لە لەخـۆ نەگـۆڕێ

میر سەروەری گشتە خێوی فەرمان
گفتی وی لە بانی چاو و سەرمان
خۆی هەرچی لە مەم بکا رەوایە
گیان و سەری مەش لە دەس ئەوایە
دەس بەستە و بێ دەستێن لەبەر میر
وا گەردن و پیل و پێو و زنجیر
میر بەستی بەدەستی خۆی دەسی مەم
تاژدین بەری چاوی گرت تەمی خەم
چاری چییە میرە خاوەنی کار
نانخۆریەتی چۆنی بێت بەرەنگار
خونکار مەمی دایە دەستی دژدار
زیندان بووە جێگە بۆ مەمی ژار
ئەو شارە هەمووی جوان هەتا پیر
بۆ گرتنی مەم پەشێو و دڵگیر
لەو رۆوە لە هەرکەس و لە هەرکوێ
هەر تووک و نزا دەهاتە بەرگوێ

## مەم لە گرتووخانەدا بووەتە چلەکێش

بڕوانە لە ڕووی گـــەڕانی گـــەردوون
جـــارێک بزەیە و دە جـــار گـــرژبوون
هـەرچی کــــە بڕێک برەو پەیاکـــات
گـــورجـێ دەیەوێ لە خـــاکی راکــات
نزمـــە و هـەرچی بەرزی ســـەر زەوی بێ
پێـی خـۆشــە کـە چەشنی وی نـەوی بێ
نـابینی کــــە ڕۆژی ســــەر زەمــــینێ
هـەر ڕۆژە دەخـــــاتـە خــــۆرنشــــینێ
چـەوتـە دزە لارە خــــــــــوارە دووڕوو
وا هـــاتـــووە وا دەبــێ وەهـــا چـــوو
نـەخـــــــوازە نـەیاری دڵتــــــەڕانـە
هـەر ئێــمــــە دەهـێــرێ لەم گـــەڕانە
دڵ مـــــان دەگـــــرێ بـەداوی نـازان
پێــخــوســـتی دەکــا لـەبەر بـەرازان
پێـشـان بە هومـێـد و شـاد و خـۆشین
پاشـــان لە دەسی زووخـــاو دەنۆشین
مـــەم دەگـــرێ بەداوی بسکی زینێ
رۆی دێلـێ لە چاڵ و ژێر زەمـــــینێ
ئەو چارەڕەشی کـــزی بـەخت کــــەم
بـێ دۆســت و هـەواڵ و یـار و هـــاودەم
ئەو بولبـولی وێڵی دەشت و چیـمـــەن
زینـدانی رەشی کـــرا نشـــیــمـــەن

هاوڕازی خەم و كوڵ و كەسەر بوو
زیندان نەبوو گۆڕی تەنگەبەر بوو
تووشی بووبوو دەردی گۆڕەشارێ
هەر تاوە هەزار چەلان نە جارێ
چاڵ لێی بووە چاڵی مانگی نەخشەو
ئەو مانگە دووحەوتە بوو بە یەک شەو
بێ خواردن و خەو لە رەنج و ئێشا
بووە گۆشەنشین چلەی دەكێشا
دەروێش كە كورشمە كا لە قوژبن
دۆستی نەبێ هەر شتێک دەكا ون
جارێک وەكو خواپەرستی بەنیاز
گاگا وەكی دڵتەڕان بە دڵخواز
هەر تاوە لەگەڵ كوڵی گرینێ
بەو وێنەیە رووی دەكردە زینێ
ئەی بەندی دڵ و چرای دەروونم
ئەی بەستە بە تۆ نەبوون و بوونم
مەزنیت و لەڕاست گەدا بە فیزی
ناپرسی لە ئێمە چیتە زیزی
لە دڵم دەدڕی كراسی ئارام
گیرۆدەی تۆم و نایەی بۆ لام
لەیلێ وەرە شێتی خۆت ببینە
چاوی تەڕ و سووره ژینی شینە
شیرینتری شیرنێ كەمێک داد
یادێک بەدڵت بگا لە فەرهاد
دنیا كە لە من بووە بە زیندان
ئەمڕۆ بەتەنێ منم موسڵمان

فـەرمـايشی خـۆشـەويـستی خـوايە
فـــــەرمـــــوودەی ئـەو ديارە وايـە
دنـيــا كـــە بەهـەشــتی گــاورانـە
زيــنــدانــی دڵـــی بـــە بــاوڕانــە
هـەرچەندە دڵم گـــەلێک پەرۆشــــە
چونكە لە ڕێگەی تەدايە خـــۆشـــە
ســـوێندم بە دووليـــوی تەنک و ئاڵت
بەو بسـكی رەشت بە وردە خــــاڵت
ســـوێندم بە بەری بەيانی لاجــانگ
بەو هەنيە كە شۆق دەدا بە رووی مانگ

سـوێندم بە دوو چاوە مـەسـتـەكـانت
سـەد جـاری بەشـيـوی ناو مـەمـانت
ســـوێندم بە نـەمــامی بـەژن و بـاڵا
ســـەد ســـاڵی تريش بژيم لە چاڵا
تـا مـــــاوە هـەنـاســــەيەک دەزانم
تۆ ناچيـــە دەرێ لەناو گـــيـــانم
لەو بـەنـدە كـــەوا شـــەتەک دراوم
پێت وا نـەبێ لێت هومـــێـــد بڕاوم
ڕۆشم كـــە ببـــەن بەناخی گـــڵـــدا
دەرناچێ هـومـــێـــدی تۆم لە دڵدا
هەرچەندە كـە مـيـر بەسـەر منا هات
ئـەم جـــــارە بـەلانـی دوژمـنـا هـات
بێ جێ نەبوو زۆر سـوپاس كـە وابوو
ئـەو جـل نـە بـە بـەژنـی مـن بـڕابـوو
شـــــازادەی و مـن گـــەدا و هـەژارم
چۆن ڕێم دەكـــەوێ ببـــيـــتـــە يارم

تۆ رۆژی بە تیشک و من گڵی رەش
من چقڵ و دڕوو ئەتۆ گوڵی گەش
تۆی تازە نەمامی باخی ژینێ
تۆی گەوهەری شەوچرای زەمینێ
مەم سیسە پەپوولەیەک لە پڕدا
ویستی کە بسووتێ خۆی لە گڕ دا
تۆ مانگی گەشی و لە بێ بەشی من
دادەڕزێ بە تیشکی تۆ لەشی من
من لولوپەڕ و ئەتۆی هەتاوم
لێت دوورم و نوقمی ئاوی چاوم
با یادی گوڵم دڵم دەرێنێ
دڵداری هەزار ئەوەندە دێنێ
با برزێ لەشم لە گرتووخانە
ئەسرین لە گلێنە ببنە تانە
دەروێشم و ئەشکەوتنشینم
دڵخۆشی ئەوینی رووی زینم
مەم بەر لەوە بمرێ مردنی دی
ئەم مردنە ژینە مردنی چی
پابووبووەوە کەوتە ریزی چاکان
دەرچووبوو لە چینی ئاو و خاکان
تیشکێکی گەیشتە ناو دەروونی
روونی دڵی بووبووە رێنموونی
هێشتا چلەیەک نەبووبوو تێپەڕ
سەرپاکی گومانی بوونە باوەڕ
سووربوونەوە بۆی شتی نهێنی
راستی وەڕێ هات و کەوتە شوێنی

هاویشتی لە دڵ ئەوینی تێکوڵ
گوڵ هاتە بەری لە باتی تێکوڵ
گیان باویەتی چی لەلاشی پووچەڵ
گەپجاڕی منالّە داری کۆتەڵ

گوڵگەشت و بەهەشت و دەشت و چیمەن
لەو چاڵەوە بووی بووبوونە دیمەن
دار و دەوەن و چڵ و چیا و کەژ
بێ گیان و ژیاو لە ئاو لەسەر بەژ
هەرچی کە بەدڵ لەوی دەنۆڕی
هەرچێکی بە بیریا دەبۆری
زینێکی دەهاتە پێشی چاوان
دڵداری بەڕاستی راستە ئاوان
ئەستێرەگەریی دەکرد لە چاڵا
چارەی ڕەشی خۆی دەدی لە خاڵا

## زین گلەیی لە گەردوون و

## چارەڕەشیی خۆی دەکا

ئەو زینی بەداوی دڵ گرفتار
ئارامی لەلا نەما بە یەکجار
تا مەم نەخرایە گرتووخانێ
هیوای نەبڕی لە پێکبرانێ
لەو کاتەوە یاری کۆت لە پێ دی
دەورەی دڵی دابوو ناهومێدی
سەیرانگە و شانشینی دڵگیر
بۆ ئەو بووە بەند و کۆت و زنجیر
دوژمن بوو لە خواردن و لە خەوتن
ئارای نە بەڕۆژ نە شەو سرەوتن
بێ هێز و توان و دەستەوئەژنۆ
هەر مەم مەمی بوو بەداد و ڕۆڕۆ
دەتوایەوە بۆی دڵی رەقی بەرد
لاواز بووبوو بووبووە موویەکی زەرد
زەردێک وەکو رەنگورووی خانی
باریک بووبوو چەشنی بیرەکانی
گەر لێی نەدەبووەوە هیچ دەرووی روون
هاواری دەکردە چەرخی گەردوون
چم کردەوە بۆچی بوویە دوژمن
تۆڵەی چ دەسێنی دێیتە گژ من

مـــەم بـووبووە بـەشـم ئەوەنـد بـەقـــینـی
هـێـــشـــتـــا بـەمـنـت ڕەوا نـەبـیـنـی
تۆ تـاقـــە مـــەمـــێک بـە زۆر بـزانـی
لـــێـــم بـــدزی بـــرادەری دزانـــی
تۆی ئـاگـری هـەڵدەکـەی لـە کـوڵـمـەم
تـا گــــڕ بـگـرێ بـە مـن دڵـی مـــەم
خـوێـنـشـیـرن دەکـەی مـەمێ لـە زینێ
تـا بـیـــخـــەیـە بەر گـــڕەی ئـەوینێ
ســـوودت چ وەچـنـگ کـــەوت لـە بـنـدا
ئـەم قـــۆزە کـورەت نـیـشـــانـی مـن دا
بـۆ تـووشـی کـچـێکی وەک مـنـت کـــرد
ســـووچـم چ بـوو پـاشـی بـۆ ونـت کـــرد
دوو دڵ کـــە بـە ئـاگـــرت پـرووکـــان
چـیت پـێ گـــەیی تۆ جـگـە لـە تـووکـــان
لای هـەرکـــەســێ بـەزم و پێکـەنـیـنـە
هەر لای مـن و مـەم شـەپـۆڕ و شـیـنـە
دەردی دڵـی خـــۆت بـە مـن بـبـــێـــژە
هـەر ژەهـرێ کــە پێــتــە ڕۆی بـڕێژە
تۆ یـوســپـی مـن دەخـــەیتـــە چـاڵـێ
گـــــوێ نـادەیـە ئـاخ و نـاڵـەنـاڵـێ
بـۆی تـانـە لـە چـاو و دڵ کـــەســـاسـم
هـەر چـاوەڕوانـی بـۆی کـــــراسـم
مـن بـوومـــە گـــەدایـە چـاو لـە ڕێگـە
بـێ یـوسـپ و بـێ پـەنـاو و جـــــێگـە
یـان بـیـــری لـە دەوری مـــەم دەهـالا
دەم دەم دەگـــەڵـی دەکـــرد سـکـالا

پێت وا نەبێ من بەبێ تۆ خۆشم
سەد هێندەی تۆ منیش پەرۆشم
ئارام نییە رۆژ و شەو لە دووری
سووچی منە باشە لێم ببووری

بەو خوایە کەوا لە ژووری سەرمان
دەس ناکەوێ لێم بزێک بەدەرمان
هەر ناوە کە ماوە خۆم نەماوم
بێدارییە بووەتە کاری چاوم
رۆژان و شەوان لە چاوی گریان
خوێناو دەڕژێ هەناوی بریان
سوێراوی سوروشکە بووەتە شەونم
خەو نایەتە چاو کە بێیە خەونم
ئەو زینی کە دیوتە وا نەماوە
ژاکاوە پەڕ و پەلکی هەڵوەراوە
ئەو جۆرەیە دەردی من شەو و رۆ
بێ تۆ ئەوە ژیانمە ئەدی تۆ
لەو جێگەیە کێیە هاونشینت
چۆن دەبیەیە سەر بەدوور لە زینت
هیچ کەس هەیە ئاخۆ بتدوێنێ
تووشت بووە یار و خەمڕەوێنێ
گیرۆدەی ئێمە چۆنە بەندت
تۆش کەوتووە بار لە لێوی قەندت
ئەی دڵ وەرە دەر لە لەش بەبێ هەست
ئەی گیان وەرە بیخە سەر لەپی دەست

پارێزی بکەن گەلێک لەو و لەم
چوستی بکەن و بڕۆنە کن مەم
لە زمان منەوە بەرن پەیامێ
بۆم بێننەوە زوو لە مەم وەلامێ
داخۆ لە چدایە یاری دڵدار
ناوی منی جارێ دێتە سەر زار
داخۆ لەگەڵم تەبایە یان زیز
لەو کولمە گەشەی نەبووەتە پایز
ئێستەش وەکو سوورگوڵی بەهارە
یان وێنەی بولبولی هەژارە
کۆشک لەمە بووەتە بەندیخانێک
پێم خۆشە کە هەڵکەوێ بەهانێک
هەرچۆنێ ببێ هەلێک سەری دەم
خۆشتر لە بەهەشتە چاڵ لەگەڵ مەم
خۆزیا لە منیش قەڵس ببا میر
وێڕای مەمی پێم دەخستە زنجیر
هەر جارەکی تر مەمم بدیبا
گوێم لێ نەبوو با ببا هەرچی با
چەند خۆشە لە کاتی گیانەڵاوم
پەنجەی مەمی لێک نێ پەلکی چاوم

## تاژدین و برایانی لە بیری چارەدان

پیرێ کە لە دەردی دڵ بووبوو پیر
خۆش گفت و شیار و زیت و دڵگیر
ئاگا لە جیهان گەڕاوی شاران
گێڕایەوە سەربێهاتی یاران
گیرانی مەم و گرینی زینێ
وەک ئاگرێ کەوتە رووی زەمینێ
هەر تیرەو هۆز و ڕێز و چینێ
هەر خێوی ئەوین و دڵبرینێ
کێ بووبووە زەدەی دەسی ئەوینێ
بۆ ئەم دووە کەوتە کۆڕی شینێ
ئەم ئاگرە تەنییەوە لە لاوان
سووتا دڵی دڵتەڕان لە تاوان
پێ چوون ئەوی دۆستی دوور و کۆن بوون
تاژدین و ستی مەپرسە چۆن بوون
بۆ زینێ بەدەردێ چووبوو ئەستی
گریان و شەپۆڕ بڕی بڕەستی
تاژدین کوڵی مەم بەجۆرێ گەستی
شێت بوو دڵ و هۆشی چوو لە دەستی
هاواری دەبردە بەر برایان
ئێوە و دووسێ پیر و کەیخوایان
ملکەچ هەموو روو لە کۆشکی شا کەین
با بۆ مەمی چارەڕەش تکا کەین

مـــیـــر بەشکە نەرم ببێ بە جـــۆرێ
لە گـــوناهـی مـــەمـی هەژار ببـــوورێ
عـــــــارف وتـی ئـەو لـە ژێـری دووره
دەوپێکێ پلارێ شـــەرم و شـــووره
کـارێکی نەیێتـــە چنگ بە گـەرمـی
بێـــهـــوودەیە نووکـــە نووک و نەرمـی
خـــۆتان دڵی مـــەزنو باش دەناسن
کێ بیـســتی بە فـوو نەرم بێ ئاسن
پێک نایە شـــتـــێک لە کـــۆڕ و دیوان
مـــەیدان هەیە لێی ببـــینە مـــیـــوان
کـــە بمانەوێ بۆ مـــەمێ بکۆشین
پێـــویســتـــە بەرگی جـەنگ بپـــۆشین
چوار ئاوێنـە و زرێ لەبـەر کـــــەین
خـود بچنە سـەر و پەڕی لەسـەر دەین
هەڵســـــوورِنەوە گـــورزی پاڵەوانان
بســــــــوێنـەوە دوودەمـی دەبانان
یان مـــەم دەبێ بێـــتـــە دەر لە ناو چاڵ
یان هەرسێ دەخـەینە چاڵ سـەر و ماڵ
مـیـر ئەو دەمـــە باش نەهاتە پێـشێ
هەریەک لەمـــە شـیـــری دەربکێـشێ
تاقـــیـــان کـەنەوە لەلاشی بەکـــرا
نەک ئەو سـەگـە با لە مـەم چ دەکـــرا
ئەو بکرێ بە خـــەنجـــەران لەتوپەت
بۆ تۆڵەی مـــەم دەبێـــتـــە دەرفـــەت
مـیـر بێت و لەسـەر سـەگێ وەدەنگ بێ
پاداشـتی کـڵـۆیە گـاشـە سـەنگ بێ

هەرسێکی مە ئاشی شەڕ دەگێڕین
وەک دەنکە گەنم سەران دەهێڕین
هەرچی وتی لەل بجنڕێ پەل پەل
هەر سەر کە بزووت بچێتە شاکەل
سازکەین لەهیبەک گەرەک لە خوێنێ
کێ سەر بپەڕێنێ بیرفێنێ
بدڕێن بپەڕێن بە شیر و نێزان
سواران و سەران زگان و ڕیزان
ئەو چڵک و گەماری زۆری زۆرێ
لاناچێ بەخوێنی گەش نەشۆرێ
پاکەینەوە جێ لە نالەباران
بیکەینە جەژن لەناو هەژاران
دیل بێنە دەرێ لە کۆت و پێوەند
دیلان بگەڕێ و ببێتە گۆوەند
نازدار و جوان لەسەر تەلاران
دەستتان نەڕزێ بڵێن هەزاران
بۆو بێو ببیەن لە نازەنینان
چەپڵە و گوڵ و دەنگی ئافەرینان
تاژدین و چەکۆ لە ئەم وتارە
زانییان جگە لەو نییە چ چارە

## راسپاردەیەک رادەسپێرنە لای میر

کاتێ شەوەکی شەوی بەڕێ کرد
رۆژ زینی لە پشتی ئەسپی شێ کرد
ئەسپی رەشی شەو برایە سەر خاو
شێ زەردەی تاوی خستە پرتاو
گرتیە دەسی گورزە ئاگرینێ
زەرد بووەوە لە ترسی رووی زەمینێ
کێشای لە کەمەرگە تیخی زێڕن
نیسێ دەرەوین کە خۆ وەشێرن
تاژدین و برای لەگەڵ گزنگێ
ئامادەی کار و سازی جەنگێ
شمشێر لە کەمەر جگەر وەکو شێر
کێشرانە دەرێ ئەسپ لە پشتێر
ئەسپانی رەسەن عەرەب نەژادان
پێت وابوو فڕین لەخۆ حەوادان
رەخشان بەچەپووک و کۆڵ و سمکۆڵ
پێیان دەهەژا دڵی چیا و چۆڵ
خاریان دەدڕی و دڵی نزاران
بۆ ناشتنی جەندەکی نەیاران
زرم و کوت و هەوهەو و گوڕاندن
هەرکەس لە خەوا بوو رای پەڕاندن
گوتیان بە کوڕان بەرەی کەسوکار
یان بمرن و یانە مەم بێ رزگار

وا گەردنی ئێوە دەکرێ ئازا

خۆشی لە کوڕێکی بمرێ ئازا

تاژدین یەکی خزم و کەیخوا و ژیر

لە کوڕانەوە رای سپاردە کن میر

تا کەنگێ بەسی بێ زۆر و بێداد

دۆستان کز و دوژمنان دەکا شاد

پێی وا نەبێ مەم گوناهبارە

دیلی دەسی دڵیە ئەم هەژارە

نازانێ کە پاتشای ئەوینێ

دای گرتووە رووی هەموو زەمینێ

دڵداری لەسەر کەسێک ببێ زاڵ

چاوبەستەیە گوێ کەڕە زمان لاڵ

ئێمە کە لەگەڵ مەما چوارین

بۆ بەختەوەری وی چوار دیوارین

هەرچوار سەری مە هەمیشە وەک گۆ

ئامادە و چاوەڕێی شەقی تۆ

یان دەربکەوێ لە بەند برامان

یان بەکری بنێرێ بێتە لامان

چیمان لە دڵایە پێی ببێژین

تۆزێ کوڵ و کۆ بەوی دەرێژین

نایکا گلەیی لە خۆی دواجار

ناخۆشی ئەگەر ببێتە سەربار

## میر لە بەریان دادەنوێنێ

راسپاردە گەیاندی راسپێری

جێیەک نەبوو بەکری لێ وەشێری

بۆ کەوڵە دەبینێ راوە رێوی

چاڵێکی دەکۆڵی کەوتە نێوی

داخوازی ژیانی شێری رووتە

چاری نەبوو کەوتە کلکەسووتە

میرم وتی شل بچۆرە پێشێ

نابێ دڵی ئەم کورانە بێشێ

زۆر حەستەمە ببنە بەرهەڵستت

نەرمی کە نەکەی دەچم لە دەستت

فەرموو کە لە رێی دووچاوی تاژدین

بەخشیم مەم و ببتە هاوسەری زین

ئەم ئاگرە دامرێنە جارێ

تا چاری دەکەین هەلێک بەبارێ

کینەت نە هەمیشە ئاشکراکە

ئالۆزی بە هێمنی رەهاکە

دوژمن کە لە تۆ پتر بەهێزە

جێ مەرگی لە باوەش و هەمێزە

پێی ناوێ کە بەرگی جەنگ بپۆشی

ژەهریان لە گەروو بکە بەخۆشی

دوو پیاڵە دەبێ هەبن لەکن میر

یەک شیر و یەکێ ژەهر لەگەڵ شیر

یەک خۆشی لە دۆستان پەیا کات
یەک ژینێ لە دوژمنان جیا کات
یەک فێنکی بدا بەتۆی لەش و دڵ
یەک زیندوو بەرێ بکاتە بن گڵ
پێک نایە چ شت بەتوند و گەرمی
وەستایی دەوێ و دەهۆ بەنەرمی
سووڕی شەو و رۆژ لەناو جیهاندا
بڕوانە خوا بەمەی نیشان دا
تاریکییە لایە روونە
دایناوە لەبەرمە بۆ نموونە
کارێکی بەرۆژ نەهاتە بەرچەنگ
پێک دێ لە شەوی رەشا بەبێدەنگ
ئەو زۆڵی چرووکی دووزمانە
بۆ میری ئەوەندە رست لەمانە
رێی بیری لە پێش بڕی بە جارێک
خونکاری لە بارێ بردە بارێک
هێنایەوە هێند شێر و رێوی
رازاندیەوە پیسدڵی و درێوی
میر بووبووە هەسانی ژێر زمانی
پێی داسووەوە ئەوەندە توانی
زوو باوەڕی کرد بە گفتی بەدفەڕ
گەڕناسیی لە بیرچوو کەوتە سەرگەڕ
فەرمووی بە سپاردە بێژە تاژدین
من بۆچمە بێ ئەوان سەر و ژین
ئەو مایەیە بۆ شکۆه و بەختم
لەوڕایە کە خێوی تاج و تەختم

ئەو هۆیە کە من بڵندە ناوم
لێم ببڕێ منیش لە ژین بڕاوم
گەنجینەم و هەژدیهامە تاژدین
تاریکە شەوم چرامە تاژدین
خۆی دانێ وەکو برابەشی من
زین و مەمی ویستووە پێشکەشی بن
چی خواستووە من بەجێی نەهێنم
لێم زیز بووە من سەیر دەمێنم
هەرچی بەدڵ و دەمی ئەوا بێ
بڕیاربێ دەسەولەجێ رەوا بێ
راسپاردە گەڕاوە کن برایان
گێڕایەوە گفتی میر لەلایان
شێرانی بەکینە وا نەرم بوون
بۆ میر بە نزایە سەرگەرم بوون

## بەکری شۆفار داوی مەرگ بۆ مەم دەنێتەوە

ئێوارە کە ڕۆژ چرای کوژاوە
پەردەی ڕەشی شەو کە دادراوە
عاسمان وەکو سێڵی پڕ لە پشکۆ
ئەستێرە تیا درەوشی کۆ کۆ
ئەو میری هەمیشە شاد و دڵخۆش
ئەو ڕۆژە پەرۆش و مات و خامۆش
دڵپیسی گڵاوی زۆڵی بەدناو
مەزنی بەکزی کە هاتە بەرچاو
گەورەم وتی دامەنیشە خەمبار
کار وا نییە بۆت نەیێتە بەربار
دەخوازی کە شادی بێتە داوێ
تۆ زین و مەمێ لە دڵ دەراوێ
هۆی ئاگری کێشە ئەم دووانەن
ماکەی کوڵ دەرد و خەم ئەوانەن
گەر ڕێگە بدەی گەڕێکی واکەم
بێ کێشە مەمێ لە ئاخی راکەم
ژەهراوێ لە تۆ کە لێی نەکەن سڵ
تاژدین و برای دەخاتە بن گڵ
کارێکی کە پێک دێ سووک و هاسان
پێی ناوێ هەرا و گوڕین و راسان
تۆ هەستە بڕۆ و بڵێ بە زینێ
مەم بووەتە خەڵووز لەبەر ئەوینێ

مـــەم تینووە تۆی کـــە ئاوی ژینی

هـەتـوان دەسـی تـۆیـە بـۆ بـریـنـی

تۆ خــۆت هەرە مــەم لە چاڵ دەرێنە

ئەو بەندی لە دەســیــە بیــچــڕێنە

زانیــومــە کــە مــەم گــەلێ نزارە

پــەروانـــەی ژارە چـــاو لـــە یـــارە

هەر چاوی کـەوێ بەزینی چاومـەست

ناژی دەمێ گــیــان دەدا دەمــودەست

ســـووتاوە زووخــاڵە جــەرگ و ناوی

خـۆ ناگرێ لەحـاندی مـەسـتیی چاوی

بەو بۆنە گــیــانی مــەم بکێــشـــە

ژێر گڵ بکە مــاکی دەرد و کــێــشــە

ســـەردار هـەنە باش و کـــار دروستن

کـەمـیـان ئەوەیە کـە گـوێ لە مـستن

خـــۆشـبـــاوەڕ و ســـادەیی لە باوان

ڕێشـــــاندەرە بـۆ گــــوناه و تاوان

گـوێ نادەنە دڵ کـــە زۆر بەجــێــیـــە

گـوێچکەی دڵی وان بەدەسـتی گـوێیـە

بەگلێنە ســـپین گـــەلێکی چاوڕەش

پـیــســـان بە جـــوان دەگــرنە باوەش

باوەڕکـــــەری پـیـــاوی دووزمـــــانن

ڕاست لار و خـــوار بەڕاست دەزانن

چیــیـــان پێ بڵـێی دەڵێن بە چاوان

نایـکـۆڵنـەوە بیــــخـــــەنە بـنـاوان

خـــۆ ڕانەگـــرن دژن بەکـــیــن

هێـــمنایی و پشـــوو بەکـــەم دەبین

گــــوێ نادەنە راســــــتی و درۆیان
زوو بایی دەبن بە بیــــری خــــۆیان
کـاریان دەسـپـێـرنە دەس چرووکـان
بێ بنیـچـە و هـیـچـوپووچ و سـووکـان
دەزگـــای مــەزنان کــە رژد و بەدفــەڕ
لێـی کــــــۆوەبوو بوو بەداری بێ بەر
ســەرداریێ کــە خـێـوی بیــر و هۆشــە
بـۆ چینـی هــەژار دڵـی پـەرۆشـــــــــە
بـاش تـاقــی دەکـــــــــاتـەوە دەراوان
دانـانـێ لـە دەوری خــــۆی گـــــلاوان
چل جـــــار دەگــــرن چەلێکی دەبڕن
گـۆشـتـێکی گـەنیـوە چۆنی دەکـڕن
هەرکـەس کـە دەبێـتـە کـاربەدەسـتێ
با هـۆشی هـەبێ و بەخــۆی بووەسـتێ
لەو گـفـتی ژیانی گـەل دەکـەن تاڵ
با گــوێ کپ و کــەڕ بکا و زمــان لاڵ

## میر بەو بیرەوە دەچێتە لای زین

زانایی شــیــــار و ژیر و بیـــر ورد
وای پەردە لە رازی مـــیـــر وەلا برد
شـــۆفـــار وەکــو بووبووە رێنمـــوونی
بەم بیـــــرەوە چووەوە ئـەندەروونـی
دڵـــداریـــــی زیـــنـــــی داوە تـــاوێ
فـــەرمــووی کــۆڵ و کـــۆ لە دڵ دەراوێ
تـا ئێـــســـتـــە ئەوی کـــرا بڕاوە
ئازاری مـــــەمم بە هـیـــــچێ داوە
بە خـــواری بزووتمەوە لەگـــەڵتـــان
بمبـــوورن و مـــــەیگرن لە دڵتـــان
ئەم کـارە کـە کـاری سـەربەخـۆ بوو
تۆزێکی گـــــونـاهـی چاوی تۆ بـوو
بێـــچـــارە ئەوەندە چاوی لێت بـوو
هـۆش و دڵی لا نـەمـــابوو شـــێت بـوو
بیـســـتم لە بژیشکی ژیر و پڕ بیـــر
شـێت چار دەکـرێن بەکـۆت و زنجـیـر
ئەو مـیـوەی کـاڵ بوو خـسـتـمـە چاڵێ
مـــاوەی گـــەیینم گـــەیاندە ســاڵێ
خـۆشـتـر بووە ئێـسـتـە تێکگەیشتن
جـــوێ نابنەوە کـــاتێ پێک گـــەیشـتن
وا ئێستـە کـە بوونە یەک دڵ و گـیـان
بۆ یـەکـــتـــری هـەردوو بوونە بریـان

نرخی دڵ و دڵتەڕی دەزانن
دڵ چەسپی یەکن لەبەر دڵانن
ڕێتان دەکەوێ ببن بە ئاواڵ
یەکتر بمژن لە جێی دەمی تاڵ
دڵداری لەسەر وە پاتشاهە
مەم سووچی نەکرد و بێ گوناهە
سەر کۆنەی مەم بکەم ئەگەر من
پێم وایە خوام دەبێ بە دوژمن
مەم بۆ ئەوینی تۆ گرفتار
جەرگی بە بژانگ تۆ بریندار
تیری دەسی تۆی لە دڵ چەقیوە
کولمت دڵ و هۆشی لێ دزیوە
تا تۆی نەبوو چی نەبوو لەپێشا
ئەم سورمەیە کێ لە چاوی کێشا
بسکت وەکو ماری ڕەش مەمی گەست
پرچت دەس و پێ و دڵی ئەمی بەست
زنجیری کەزیت لە گەردنی خست
گیان و دڵی بۆت بووەتە پێخوست
تۆ کرتە نچیری بازی چاوت
خاوپێچە بەتاڵی بسکی خاوت
هەر خۆت بچۆ لای و بیدوێنە
زنجیری لە دەست و پێ دەرێنە
ئەو خونچەی سوورگوڵی نەپشکووت
ڕزگار بکە بولبولت ببن جووت
ئەو تینووە چاوەکەی فوراتێ
تۆی وا بکە ئاوی تۆی بگاتێ

ئەی ئاوی ژیان بچۆ بۆ کن مەم
هەر نامریٚ کە پێتی تەڕ بکا دەم
زینێکی دووسەد برین لە جەرگی
بەو واتەیە کەوتە گێژی مەرگی
ئەو ئابڕوومەند و خێوی شەرمە
ئەم دڵ بە ئەوین کوڵاو و گەرمە
لەو گفتە کولایەوە برینی
یەکجارەکی هاتە جۆش ئەوینی
خوێناوی دڵی لە چاو سەری کرد
زووخاوی هەرچی هەبوو دەری کرد
دڵداری بە پێلی چەشنی دەریا
شەرمێونی پەردەبوو لەبەریا
لەمپەر کە وەلا برا لە نێوان
سەرڕێژ بوو زووخاوی دڵ لە لێوان
دەریای کەسەری کە هاتە سەرجۆش
بەکوڵێکی بە گوڕ پەڕاندی سەرپۆش
وای زۆربە ستاند شەپۆلی خوێنێ
کەم مابوو کە خۆشی ڕاڕفێنێ
ئاومالکی رقی دڵی رەقی میر
پا بۆ وە چلک چلی نەبوو گیر
دووی ئاگری جەرگی زینی برژاو
باراندی لە چاوی میر تکەی ئاو
پێت وابوو هەژا هەزار پیشە
مەی سووره رژا لە زاره شیشە
پا بووه دڵی لە کێمی کینێ
گرتی بەزەیی بەدەردی زینێ

زین بێ دڵ و دەم شەلاڵی خوێنێ
بێهودە بوو ویستی بیدوێنێ
گریا لەسەری درێژی شەوگار
کۆبوونەوە لێی بەرەی کەسوکار
وتیان ئەمە چی بوو بۆچی کوشتت
ئەم خوێنە بەجێ نەبوو کە رشتت
زین گوڵبنی باخی شەرم و پاکی
زینێ لە جیهان کە نەبووە تاکی
بێ سووچ و گوناهە پاک و خاوێن
هەرگیز نەکەوت پەڵەی لە داوێن
ئەو گەوهەری شەوچرای جیهانە
چۆن وردی دەکەی بەبێ بەهانە
کەی وا بووە مەزن و پاتشاهێ
هەڵکاتە هەژار و بێ گوناهێ
بەم جۆرە لە خاک و خوێنی راکا
بەم زۆرە گیان لە لەش جیاکا
چی ئێوە دەڵێن وتی نە وایە
کەی کوشتنی زین بەمن رەوایە
کوشتەی مەمی بێکەس و هەژارە
بۆ یارە نەخۆشە گەشکەدارە
زین تاقە گوڵێکی باخی شایی
من چۆن لەدەسی دەدەم هەوایی
دەستەی کەسوکار بەجارێ شێوان
ئەسرین لە دووچاو و بار لە لێوان
بووە شین و شەپۆڕ لەناو جوانان
هاوار دەگەیشتە عاسمانان

له پڕێ وتی یەک دەهات له ڕێوه
مەم مرد و ژیانی دا به ئێوه
زین پێشێ کە مردبوو ژیاوه
هەستا و له سەنیرێ پاڵی داوه
دەیڕوانی له هاودەم و له یاران
دی میر دەگری بەتاوی باران

هەرچی کەس و کاره دەردەداره
خەمباره هەژاره لێو بەباره
رووی کرده برای وتی سەری من
گۆڕی تە کە بوویته ڕێبەری من
گیرا بوو گیانی من له لەشدا
مابوو وەکو مەم له چاڵی ڕەشدا
هەر چاوی له لێوی تۆ بوو جارێ
چارێکی بکەی کە پێی بچارێ
بۆ هێشتنی ئابڕوو دڵی تۆ
دەرچوونی نەدی هەتاکو ئەمڕۆ
وا ئێسته کە خۆت ڕچەت نیشان دا
گیانم دەفڕێ بەدووی گیاندا
ڕۆژی رەش و لەش له ئاو و خاکی
رابرد و گیان گەیشته پاکی
چەندەی لەشەکەم له خۆی وەڕز بوو
گیانم ده ئەوەند زەبوون و کز بوو
ڕێی دەرنەدەکرد له دەرد و ئێشی
گیانی مەمی گەییە کەوته پێشی

دەرچوون لە جیهانی پووچ و بەرباد

وا گەینە ژیانی خۆش و ئازاد

بەربوون لە کەمەندی دووزمانان

دەستەملی یەکن لە عاسمانان

گیانێکی کە پاک فڕی لەسەر جێ

بێ جێ نییە جێی هەیە لە هەر جێ

هاوجووتی یەکین مەڵێن جودا بوون

بو کنی مە فریشتەیی خوا بوون

گیانی مە کە پاک و پاکڕەوشتن

ئەمڕۆ لە بەهەشتێ پێک گەیشتن

وا ئێستە بەجارێ دڵنیا بوون

مانیان نەمرە و نەما جیابوون

تینوو لە زەوی کە ماوە لەشمان

دەریای بە زەوی خوایە بەشمان

قاپێلکی گڵێن کە خاکە سەرمان

گیانمان گەینە هەواری هەرمان

ئیتر نییە ترس و خۆوەشاردن

نە ژیانی خوشک بەکاک سپاردن

نەتوانەوەیە لەوێ و نەگۆڕان

مایەی ئەوێ بێ بەشە لە دۆڕان

تۆزی مە گەیشتە رۆژی رۆشن

ئەم خۆشن و ئێوە بۆ پەرۆشن

مەیکەن بە کڕ و هونەروەری من

مەم پێشڕەوە بووەتە رێبەری من

ئەو پیری کە من دەسم بەوی دا

چیم دیتووە ئەو نیشان منی دا

گـــــەرچی لە روالـەتا گـــــەدا بوو
زۆر پایە بڵندتریش لە شــــا بوو
جێ بەرزە لە بارەگــــای خـــوایی
پێـخـوسـتـیـیـە تانجی پاتشـایی
گـیـان و دڵی بووەتە شـیـوی پیـرۆز
بێ ترســـە لە گـێــژ و تۆز و باهـۆز
کـێـشــای دەسی من بەڕێی ئەوینا
دوای کـەوتم و گـەیمە کـێـوی سـینا
مـــەم بوو لە بەزەی خـــوای گــەیاندم
ئەم بوو لە گــــێــــژی رای پەڕاندم
هێنامــیـــە دەرێ لە پەردەکــەی خـاک
پاکـانەمی کـرد لە کن خـوای تاک

پێــو وانەبێ من ئەوێســتــە زیندووم
لەو کــاتەوە مـــەم نەمـــاوە مـردووم
خـــوازراوەیە ئەو گــیـانی ئێـسـتـە
مـــەم پێم دەڵێ تۆزێ تر بوێســـتــە
مـــالاوا بکەم لە ئێـــوە گـــشـــتـــو
پێی خـۆشـە خـەمـو نەبێ کـە کـوشـتـو
تـەنیـــا هـەر ئەوەندە راســـپـــێـــرن
تـەرمی مـــە بەناو و داو وەشـــێـــرن
دیســـان دەگــەڕێمـــەوە بەهەشــتێ
هەمـــدەم بە مـــەم لە بەزم و گــەشـتێ

## زین دوا راسپێری خۆی بە کاکی دەڵێ

راسپێری زینێ وابوو بۆ میر

ئەی مەزنی بڵندپایە و ژیر

گوڕیت بێ گیان و دڵ سەر و ژین

هەر دەم لەبەرت مرن دووسەد زین

ئەو یەکدو هەناسە دوا پشوومن

هیوام هەیە خەم نەخۆی لەدوو من

هەر ڕۆژی بەرێ کە من مەمم گرت

شەشدانگی کەساسی و خەمم گرت

مەم بۆ من و کامڕەوایی بۆ تۆ

خەم بۆ من و پاتشایی بۆ تۆ

چاوت لە بەشم نەبێ کەسی من

بۆ تۆ هەموو شت کزی بەسی من

دانیشە لە تەختی سەروەریی خۆت

لار دابنێ تانج لەسەر سەری خۆت

سازی بدە کۆڕی بەزم و ئاهەنگ

گۆوەند بگەڕێت و چەنگ بدا دەنگ

سەرخۆش بکە سادە و روالآن

دڵ خۆش بکە پیر و کۆنەسالآن

گش مایەی بەزم و شادومانی

چی خۆشیدەرن بە زیندەگانی

لە خواردن و خواردنەوە ببن ساز

دەنگ داتەوە دەنگی ساز و ئاواز

ئازاد بکرێن کەنیز و بەندان
رزگاری درێ بە دیل و بەندان
بەخشان بکە زێڕ و پوول و پاران
کۆیان بکەوە گەلی هەژاران
لێم خڕکەوە پۆلی نازەنینان
خوێنشیرین و دەم بە پێکەنینان
جوان بێن و بچن لە دەوروبەرمان
با بێنە سەما لە دەوری تەرمان
با گەورە و کەیخواش لەناوا
پیرۆزی بکەن لە بووک و زاوا
بۆنخۆش و گوڵاو بڵا گەلێک بن
پێویستە پتر لە هەر شتێک بن
بۆ ئێمە نەباوی ئاو و خاکە
پێک گەیشتنی دوو گیانی پاکە
لەشمان کە دەچێتە گۆڕ و چاڵێ
گیانمان لە بەهەشتێ لێک دەهاڵێ
لەو بەزمە فرشتە تێ دەکۆشن
داخوازی بەرام و بۆنی خۆشن
رۆژێ کە ستیت دەدا بە تاژدین
ئاواش بکە ئێستە بۆ مەم و زین
بازاڕ و شەقامی شار و دەم چەم
با جوان بکرێن بە چەشنی ئەو دەم
بۆتانی لێیان ببێتە جێژن
دڵ خۆش بن و لاوکان ببێژن

وەک ئەو دەمە خۆت ستیت بەڕێ کرد
چۆنت بەدڵی مــە جــێــبــەجێ کــرد
هــیـــوامـــە لەگـــەڵ منیش وەهابی
بۆ منیش وەکـــو ئەو چرا و برابی
بـۆ تـەرمـی مـنیش دوو سـێ ئـەوەنـدە
دڵخـۆش بی و شـــاد و دەم بەخـــەنـدە
پێشمان خە گۆرانیبێژی خۆشدەنگ
ڕێکیان خە بە چەپک و بەزم و ئاهەنگ
دەربـەســـتی وەکـــو کـــەژاوەیەک بێ
جـێی دووکـــەس و تاقـە چاوەیەک بێ
زێرکـــفـــتی بکەن هـەمـــووی دەر و ناو
بتـــــرووسکێ لە دوورەوە لـەبەر تاو
پەلکی گــــوڵی رابخــــەن لە ناوا
دڵیـــــان لە گــــوڵانـە بووک و زاوا
بمگوێزنەوە چەشنی بووکی شـــایان
کـــارێ مــــەکــە ســـووک ببم لەلایان
کـــــیــــژۆڵە بەدڵپــــڕی نەبێـــژن
زینــێ نــە بـەنـاو و دڵ دەنـێــــــــژن
بەزمی ســتی خـۆش و ڕۆژی گـەش بوو
زین مــــــردن و ژینی چارەڕەش بوو
با ئەســـتی جل و خـــشڵ لەبەرکـــا
خـۆی بێت لەگـەڵم گـڵم وەســـەرکـا
تاژدین دەری خـــا ئەسپ لە خـــاوا
ســوار بێ و بچێ شـــان بەشـــانی زاوا

مەم چۆن بوو کە ئەو ستیی درایە
مەم بێ کەسە هەر ئەوی برایە
لەم ڕۆوە ئەتۆش هەیا بەساڵێ
هەر ماڵێ کە دەردەخەی لە ماڵێ
هەر خواردنێ دەیدەیە هەژاران
هەرچێکی بەخت دەکەی لە یاران
چەند داڵدە دەدەی بەبێ پەنایان
دەسپڕ کە بەڕێ دەکەی گەدایان
هەر بەرگێ دەکەیتە بەر شڕۆڵان
پێت دێنە گەشەو بزە کڵۆڵان
هەر چەندە دەبی بەکەس لە بێکەس
هەر ڕۆژێ کە دەگری دەستی بێدەس
هەرچەندی دەگەی بەدادی داماو
ئەسرین دەسڕی لە چاوی گریاو
هەتوان کە دەخەیتە سەر برینێک
شادی کە دەدەی بەدڵخەمینێک
دیلان کە وەدەردەخەی لە زیندان
دڵخۆشی دەدەی بەوی لە شیندان
تا پێت هەیە پیتی کوردەواری
چەند هەڵدەکەنی ڕەگی هەژاری
دەرمانگە و فێرگە ڕێگە و پرد
مزگەوت و میوانگە چیت دروس کرد
چەند ریز دەنرێ لە تەخت و تاجت
چەند کۆوە دەبێ پیتاک و باجت
مانگانەیی کاربەدەست و نووسەر
پێشمەرگە و ئەفسەران و نۆکەر

چەند خـــــوێنــێ لە دوژمـنـان دەڕێژی
هەرچەندی کـە خـوێنمــژان دەنێــژی
تـالان و بـڕۆ لـە دوژمـنـی کـــــــورد
چی دێتــە دەست هـەمـــووی گـر و ورد
با گـشـتی لەســـەر نیـــازی من بێ
وای دانێ بەناو جـــیـــــازی من بێ

پێم ناکـری هیچ بەرم لەگـەڵ خـــۆم
پاشـــبـــارێ بلان بەرێ کـــرێ بۆم
شـــــــانـازی بکـەم لـەکن ئەو و ئـەم
کـەس نەوشێ شـتی کـەمــە ژنی مـەم
پەردووی مـــە ئەگـەرچی گـۆڕی تەنگە
بۆ بووکێ کـــەبا بەچەنگە نەنگە
ئەو جـــێگەیە دوور لە بەژن و بالات
بۆ ئێــمـــەیە جــێی نیــاز و ئاوات
راســـپــــێــری کـــە زۆرە لێم ببـووره
یەکـــجــاریــیــە کـــۆچ و رێگە دووره
چەندی لە دەست دێ زۆر ئەگـەر کـەم
دەر مـاوێ لە بیــری خـۆت من و مـەم
خـــزمــایەتیی مـــەم بەکــەم مـــەزانە
مـــەم تاج بەســـەرێکی ئەو جــیــهــانە
تەرمێ کــە دەچێــتــە گـــۆڕخـــانـان
هەڵدەگـــرێ هەڵی گــرن بە شـــانـان
هـەرچەندە منیش لەلای ئەوە جـــێم
بۆ گــــۆڕ و بەرەو مــــەرگ بەپێ دێم

خواکەی نەچی چیدی بێ بەشم کەی
لەم مردنەشا بەختڕەشم کەی
بمنێژە لە ژێر گڵا دەگەڵ مەم
روومان لەیەک و دەسی لە مل کەم
میوانی مەمم چ خۆشە مردن
بۆ ئێمە نەجێی پەرۆشە مردن
میر کەوتە گرین و داد و رۆڕۆ
فەرمووی دڵەکەم سووتاوە بۆ تۆ
سوێندم بە خوای خویا و نەدیوان
بۆ ئێوە لە دڵمەوەم پەژیوان
خۆت هەستە سەری دە بیدوێنە
بیهێنە لە مردنی بسێنە
زیندوو بن و بچنە ناخی خاکا
کەس نابێ لە یەکتریو جوداکا

## زین سەری کوشتەی خۆی دەدا

زیـــن ئـــەو بـــەزەی لـــە رووی بـــرا دی
ســــــەردانی مـــــەمی گـــــەلێ رەوا دی
رازایـەوە هـەر لـە پـێ هـەتـا ســــــەر
دەریای لە جـــوانـی کـــەوتە گـــەوهـەر
ئەســـتی و بە ســـەتان لە دیدە کـــالآن
ئـەســـتـــێـــرە لە دەوری رۆژێ هـالآن
چاومـەست و بەلـەک خڕ و کـەزی شـۆڕ
دەرچـوون وەکـــو دوڕ دەرێن لە قـــاپـۆڕ
دەروێشـــە دەچێـــتـــە دیدەنی پیـــر
کـوا مـاوە کـوڕی گـەدا و کچی مـیـر
هـیـــوا نە لە کـــۆشـکە وا لە بەندە
دڵ بەســـتـــەیە زین و مـــەم کـــەمـــەندە
دەرگـــــا کـــــە کـــــرایەوە لە یاران
زیـــنـــدان بـــووە بـــاخـــی نـــازداران
چووە ســـەر مـەمێ بەر لە زینێ ئەسـتی
دی مـــردووە نایە دەنگ و خـــوســـتی
گـــیـــان چووەتە دەرێ لە بەژن و بـالآ
مـــاڵ بێکەســـە کـەس نیـیـە لە مـــالآ
والآیە قـــوتـووی دوڕی گـــیــــانی
کـــــــوژاوەتـەوە گـــــــڕی ژیـانـی
گـــــــوڵـزاری وشـک بـووە بەبـێ ئـاو
بێ رۆنە چرا و پلـــیـــتـــە ســـووتـاو

پرسی لە کەسانی هاودەمی بوون
هاوبەندی گران و هاوخەمی بوون
وتیان لە دەرێوە هات ترووسکێ
دەرچوو لەسەری مەمیش برووسکێ
یەک وێنەی مانگ و رۆژ و ئەوی تر
هالا ئەوی ژوور لەوی نەویتر
یەک بۆ یەکێ کەوتە تیشکە رشتن
تا بوونە یەکێک و پێک گەیشتن
بەم جۆرە درەوشی سەردەمێ چاک
شەورەش لەمە بوو بە رۆژی رووناک
لەو کاتەوە مەم نەما لەسەر هۆش
پێی خۆش نییە رابێ لەو خەوی خۆش
تا چاوی دڵت لەسەریە تانە
پێت وایە کە نەبووە ئەو شتانە
گیان تیشکی خوایە سەربەخۆیە
راگوێزتن و توانەوەی درۆیە
خوێن لانەیە بۆی نەخۆی گیانە
چی دی لە گیان بڵێی زیانە
هاورێ کە لەگەڵ مەما گرابوون
لەم رازە گرنگە شارەزا بوون
رێ نیشاندەرێ باش بوو بۆ هەوالان
بردنیە دەرێ لەناو خەیالان
ئەستی چووە بن سەری مەمی زار
تا کەنگێ دەنووی لە خەو بەبێدار
تینووی چووە لەمپەرو لە نێوان
وا ئاوی ژیان و تەرکە لێوان

لەم مردووە بەو وتار و باسە
هەڵچوو تەپ و دووکەڵی هەناسە
زین دەستی گەیاندە دەستی یاری
فرمێسکی لە چاوی مەستی باری
ئەسرینی رفاندی پووشی شەرمی
سەرپۆشی دڕاند لە سنگی نەرمی
گریەی بەکوڵ و کزەی هەناوان
جەرگی کەڤری رەقی دەتاوان
بای گەرمی هەناسەو و هەنسکی
رای ماڵی لە دەوری کوڵمە بسکی
رووپۆش کە وەلا درا لە رووی زین
رۆژ تیشکی گەیاندە مانگی بێ تین
تاریکیی مەرگ هەڵات لە جێدا
پێت وابوو کە رۆژ هەڵات لەوێدا
ئەی مەم وتی بۆت گەلێ بەتاسەم
گیان بێنەوە بەر بەبای هەناسەم
بۆی ژیایەوە مەم بە گفتی زینێ
بووژایەوە بەشبڕاو لە ژینێ
دای تیشکی ئەوین لەناو دەروونی
هێز کەوتەوە گوڕ رەوی زەبوونی
هەر چاوی کەوت بەمەستی چاوی
تین هاتەوە بەر دڵ و هەناوی
فرمێسکێ کە هات بەچاوی رەشدا
لەو مردووە بوونە خوێن لە لەشدا

ئەی مەم وەرە رابە لاوی چابە
خاڵی رەشە بۆ تە بووەتە کابە
رووم تێ بکە رووگە خۆشە من بم
لێو بمژە لەباتی ئاوی زەمزم
لەم بەژنە کە نەخشی دەستی خوایە
هەر سووڕێ بدەی حەجت رەوایە
باوەش وەکو ریم و چاوەڕێی تۆم
مەم چەشنی پەپوولە چوو بەرەو مۆم
هێشتا نەبووبوو نزیکی زینێ
سووتاندی پەڕی گڕی ئەوینێ
سەرخۆشی یەکن بەڕەنگ و بۆیە
جێی راز و نیاز و گفت و گۆیە
زین ئێژێ پەپوولە رێنومامی
پەروانە وتی تۆ شەوچرامی
مەم خۆشی و فێنکیی دڵمە ناوت
زین گیانی مەمێ بەگۆڕیی چاوت
مەم داومە بە تۆ دڵم بەشەشدانگ
زین دڵبەری تۆ بە تیری برژانگ
مەم داوی خەمی مە گشتە بێ تۆ
زین جەرگ و دڵم برشتە بێ تۆ
مەم سینەی من بەهەشتی تۆیە
زین بێ تۆ هەموو شتێک درۆیە
مەم ئەو مەمە سێوی دەستە بۆ تۆ
زین گەردنی دڵ لە رستە بۆ تۆ
مەم بۆمە ئەوێستە رووگەیە رووت
زین بەسیە گیان لە تاوی تۆ سووت

ئەستێ و کەسوکار کە بوون لە گۆڕا
خـــوێنیـــان لە هەناو و چاو دەچۆڕا
وتیـــان بدە مــــوژدە بەخــــتــە یارت
پێک هـاتووە رێکە کـــــــاروبـارت
بۆ زین کـــە زەبوون بوویوو گــیـانت
گــەر مـیـر دەگــەڕا لە دووی نەمــانت

وا مـــیـــر بەزەیی دەکـــاتە پـیــشــە
زین بۆت بووە هـاوسـەری هەمـیـشـە
وا ئاوی ژیان ئەگـــــەر دەنۆشـــیت
لوقـمـــان ئەوەتا ئەگـەر نەخــۆشـیت
مـــەجـــروون ئەوە لەیلە ســـەرتی داوە
بۆ دەســــتــــەمـــلان فـــرەی نەمـــاوە
بولبـــول ئەوەتـا ئەوی گـــولت بوو
لـولـوپەڕی ڕۆژهـەلات بـپـــــــشـکوو
پەروانە بی مـــۆمـــتـــە هەلگیـــرســـا
مــردووش بی ئەوا لەســەرتە عـیـســا
دێـــوانـــەی دەردە رابـــە چـــا بـــە
بـێـگـانـــەی بـەردە ئـاشــنـا بـــە
ئەو پەرییـــە کــە تۆی بە ئارەزوو بووی
ئەو شـۆخی هەمیشـە چاو لەدوو بووی
هــەرچۆنــێ دەهـاتە بەر خــــــەیالت
دەرچوو لە خــــەیاڵ و بووەتە مـــاڵت
دەســـتـت مـــەخــــە بەر بەشـی خــوادا
بێــــهــــوودە مـــــەدە ژیان بە بادا

دەم نیّ دەمی زین و دەس لە گەردن

رابوێرە پەلەت چییە لە مردن

خۆ ژێرکە رەهاکە کۆت و زنجیر

وا باشە لەگەڵ مە بێیە کن میر

پیرۆزە سێبەری ئەو لەسەر مە

بۆتان دڵی ئێستە گەرم و نەرمە

ئازایە گەلێ لە چاکە کردن

بەخشندەیە مەردە خێوی بووردن

هەرچی کەس و دۆستە بانگ کراوە

چی مایەی بەزمە سازدراوە

خۆشبەختی و خۆشی رووی لە تۆیە

میر دوورەدرۆیە راستگۆیە

هەر بیگەیە هیچ دڵت نەمێنێ

ئاواتی دڵت بەجێ دەهێنێ

زینت دەوێ چی تریش دەخوازی

دەتداتێ هەمووی بەسەرفرازی

مەم بیستی ئەمانە تۆزێ راما

درکاندی دەمی لە جێی وەراما

لاتان ئەوی مەزن و پاتشایە

لام بێکەس و دیل و بێ پەنایە

تەختی وی بنی لەسەر خەیاڵە

خانووچکەیە جێ گەمەی مناڵە

دەزگایەکی دوور لە مان و پووچە

زیانبارییە جێی گوناه و سووچە

خونکارێ بە مردنێ نەوێرێ

پیاو چۆن دەبێ خۆی بەوی سپێرێ

خــــۆم داوەتە دەســـــتی پاتشـــاهێک
بەخــشندەیە بۆ هەمـــوو گـــوناهێک
خــــــونکار و هـەژار لەلای یەکـــێکن
ئاکـــــاری بـەجــــێن و رێکوپێکن
هـاوێنـەی رووی زیـنـی چێ کــــــــرد
نەخش و کری خـاڵ و بسکی لێ کـرد
لـەو ئـاوێـنـەدا ئـەوم دی جــــــارێک
ئیـــتـــر بەکـــەسم نـەمـــاوە کـــارێک
وەسـتـای من و زینێ دڵمی ئەسـتـاند
گـیـانی لە خـەوی نەزانـی هەسـتـاند
ئەو خـــێــوی شکۆیە پاکـــە تاکـــە
بێ مــــردن و چوون و ترس و باکـــە

هـەر لـەو دەکـــرێ ســــوپاسگوزاری
خـــســـتـــینیــە بەهـەشـتی نازداری
دەســـــــتی بـەزمیـی درێژە بۆمـــــە
خۆشی و گـەشیـی گشت بۆمە کۆمـە
زۆر باش بوو نەگەینە یەک لە رووی خاک
مـــــۆرین و دەچـین دڵ و دەروون پاک
دوو نۆبـەری باخـی نـاز و خـــــۆشـین
مــــەی پێک گـــەیینێ لەوێ دەنۆشـین
دڵدار کـــە لـەســــەر زەوی دەمـــێـنن
زۆریـان هـەیـە تـۆوی پـیـس دەچێـنن
داوێن تـەڕ و شـەرمـەزار و سـەرشـۆڕ
بـێ ئابـڕوو پـەل دەبـن بـەرەو گــــــۆڕ

گۆوەندی مە خۆشە لەو بەهەشتە
رازاوەتەوە پەری و فریشتە
مزگێنی دەدەن لە چوونی ئێمە
شانازی دەکەن بەبوونی ئێمە
کوا ئێمە دەچینە کن فرشتان
جێی ئێمە بڵندترە لە گشتان
جێی دڵبەر و دڵتەڕان جودایە
بۆ ئێمە ژوانگە لای خوایە
هیوام هەر ئەوەند هەیە لە لای ئەو
هەرچی زووە بچمە بارەگای ئەو
کاتێ کە نزای لە دەم بڕاوە
دەرگای بەزەیی خوا کراوە
هەروا نەژییا لە ژینی تاڵا
باڵداری گیانی فڕییە باڵا
گیان دەستی لە ئاو و گڵ کە بەربوو
بەنیازی گەیشت و بەختەوەر بوو
پەروانە لە ڕۆشنایی هاڵا
جێ ما لە زەوی لەشێکی واڵا

## شین بۆ مەمی هەژار و
## کوژرانی بەکری بەدکار

دەیگوت ئەوی شینی بۆ مەمێ کرد
ئەو رۆژە کە ئەو هەژارە پێ مرد
بوو شین و شەپۆڕ لە ناو جزیرێ
گش پیاو و ژنێک و لاو و پیرێ
بۆتانی لە گەورە تا بچووکان
زاوا و خەسوو خەزوور و بووکان
دارا و نەدار بڵند و نزمان
زانا و نەزان نەناس و خزمان
دەروێش و بەرێش و مەستی بادە
پاک و بەچڵک بەکوڵک و سادە
کوێخا و بەرەڵا و هەڵە و شەل و گێڕ
گشتی وەکو یەک بووبوونە شینگێڕ
چاویان تەڕ و قوڕ بەشان و رەشپۆش
پەیدا نەدەبوو یەکێکی دڵخۆش
بێگانە و دوورەدەست و خۆیی
هەرکەس بەرەو تەرمی مەم دەڕۆیی
بۆ شوێنێ دەڕۆیی بەکری پڕ کین
تاگوم ببێ کەوتە داوی تاژدین
بۆ کوێ وتی سیسەماری بەدفەڕ
ئەی ماکی هەموو بەڵا و گزی گەڕ

ئەی لەمــپــەڕی بەر دڵ و نیـــازان
پیـسـتـر لە هـەمـوو سـەگ و بەرازان
ئـاوڕووبـەری دڵتـــــــەڕانـی دڵدار
خـــویّ پێـــوەکـــەری دڵی بریندار
کۆستت کـەویّ وەک مـەمت لە مـن کرد
چی دیت دەویّ کەتنی خۆت بە من کرد
ئەو دەردە کـە دات بە مـەم لەسـەر چی
هێـشـتـا دەتەویّ لە دەس مــە دەرچی
بـگــرە لــە دەسـم دەبــانــی دوو دەم
بتکەم بـەیەکـــەم لە تۆڵەی مــــەم
یەک بڕ ســەری بەکــری پیّ نـەوی بوو
لاشـەی سـەگی چەسپی سـەر زەوی بوو
کـــــاتێکی کــــە هـات بەلای برادا
روونـاکــــــیی نـەدی لـەنـاو چـرادا
دای گــرت لەســەری کـــڵاو و تۆمـــار
هاوپشـتـیـیـە سـەر لەشی مـەمی ژار
دێــوانـــە و هـــار لـــە تـــاو بـــرایـــێ
شـــــالاوی دەبرد وەکــــــو زەهـایێ
نیــازی هەبوو چی بێـتـــە پێــشـی
بۆ تۆڵە گـــیـــانی ویش بکێـــشـی
کیّ لەو دەمــــەدا ببـــا تخـــوونـی
پاپای بـوو لـە مــــــردن و نـەبوونـی
هـاوار لە دەسـی برایە کن مــــیــــر
زوو پیّ و دەسـی خـسـتە بەند و زنجـیـر
تەرمـی مــەمـیّ کــەوتە ریّ بەرەو گـــۆڕ
کــۆمــەڵ لە دواوە مـــات و ســەرشـــۆڕ

کۆتەڵ کە لە پشتی ئەسپی مەم بوو
بۆ هەرکەسێ ماکی دەرد و خەم بوو
تاژدینێ لە بەند شەتەک درابوو
ئاگای کە لە بردنی بڕا بوو

زنجیری لە دەست و پێ چڕاندن
دەروازە و بەندی تێک شکاندن
ئەنگوچکی سپی نیایە ناوهەش
تەرمی مەمی گرتە مێز و باوەش
خزم و کەسوکار و دۆست و یاران
گریان لەگەڵی بەتاوی باران
شڵپەی دەس و سینەی جوانان
دەنگی دەگەیشتە عاسمانان
هەرچی ژن و کیژە پۆڕ کراوە
روویان دەڕنی بەدەم سەماوە
گشتی لەپ و پەنجە سوور و ئاڵ بوون
بێ رەنگ و خەنە لە خوێن شەلاڵ بوون
ریزێک لە کچان یەکێ لە لاوان
پێیان هەڵدەگوت بە بەند و باوان
پۆلێک لە دوایەوە لەخۆدەر
هێندێکی لە پێش تەرم سەماکەر
پیر کەوتنە ناو بەتاو دەکەن شین
میر دەسڕە بەچاو و چاو بە ئەسرین
زین هاتە سەما لە پێشی تەرما
چنگی دەکوتا بەسنگی نەرما

پەخشان بووبوو مووی بەسەر لەشیدا
وەک ئاوی ژیان لەناو رەشـیدا
ئەو کاتێ سەمای دەکرد لە تاو مەم
زوهرە بەسەماوە کەوتە ناو تەم
رۆژی کە دەهاتە دەر لە لێوان
لە سوێی دەتواوە جەرگی کێوان
دار و دەوەنی دەگەڵ دەناڵی
گریانی ژیانی کردە تاڵی
لەو شینە مرۆ ئەوەند وەکو بوو
جەرگ و دڵی رێ بەکەند و کۆ بوو
رەوتیان دڵی عەرزی پێ دەلەرزی
بوولەرزە دەکەوتە نزم و بەرزی
هێند دادەوەرینە رووی وەکو گوڵ
فرمێسکی کچان بەهۆی کوڵی دڵ
پێت وابوو لە هەورەکەی بەهارێ
بارانە لەسەر گوڵان دەبارێ
چارشێوی رەشی ژنان ئەوێ دەم
پەیدا بوو نیشانی شینە بۆ مەم
رووپۆش لە رووان کرایە پەرژین
رەشیان لەبەردایە بۆ مەم و زین

## زین دڵی بە بەکر دەسووتێ و

## بۆی دەپارێتەوە

دیبان کاتێ کە گەینە قسنی بەر شار
لاشــێکی تخــێڵ لە بەینی دوو دار
زانییــان ئەوە بەکری مەرگەوەڕ بوو
ئەو لاکــە کــەلاکی مــاکی گــەڕ بوو
تاژدینە ســەری لە لەش جــیـا کــرد
کـێشــەی لە زەوی تـەرە و توونا کـرد
چیرۆکی بەکر کە گەیییـە کن زین
پاڕایەوە بۆی لە مــیــر و تاژدین
پیــاوچاک لە رق و لە کــینە دوورن
هەرچەندە بەســووچە لێی ببــوورن
بێ فــەڕ کــە بەچاکــە نەدرێ پاداش
جــیــاوازی بەچی بێ باش و ناباش
خـوای ســازدەری هەردوو عاسمــانان
داینا لە بەرێوە بۆ مــــەمــــانان
رۆژێ کــــــــە ئەوینی دا بــەدڵدار
ئەو رۆژە بەدیشی دا بە بــەدکــــار
چۆن دەکرێ کە پاک لە پیس وەشێرن
زۆر حــەســتــەمــە لێکی هەڵوەژێرن
لای ســـــوورەگـــــوڵان دڕوو رواوە
گـــــەنجی هەبێ مــــاری وا بەلاوە

گوڵ سیسە بەدوور لە دڕک و داڵان
مار هۆیە کە گەنج نەچێ بەتاڵان
گەر پیسی وەکو بەکر نەبووبا
هیچ دوور نەبوو ئابڕووی مە چووبا
هەرچەند بە رواڵە ناتەبا بوو
راستیو دەوێ بۆ مە دۆستی چابوو
گەر ئەو نەدەبوو بەلەمپەری مە
گومڕایی دەبوو بەڕێبەری مە
وا دەرنەدەچووین لە شەرمەزاری
پیرۆز نەدەبووین لە کوردەواری
ئەو رێگەی پاکی خستە بەرمان
زۆر زۆر ئەمەگی هەیە لە سەرمان
هەرچەندە بەخۆی گەیشت زیانی
دۆڕاندی لە رێی مەدا ژیانی
پێم خۆش نییە هیچ گرێی وەبەر بێ
هیوام هەیە شاد و بەختەوەر بێ
ئیدی بەسە ئابڕووی مەڕێژن
لەو جێی کە من و مەمێ دەنێژن
ئەو بووبووە سەگێکی پاسدەری مە
با هەر بکەوێ لەبەر دەری مە
لای ئێمە بنێژرێ با گیانی
پاسی مە بدێرێ لەو جیهانی
بڕوانە بەزەی دڵ و دەروونی
ئاوێنە بەزێنە ئەو بەروونی
ئاوێنە و ئاو گەماری دەگرێ
کێ بەخشی کەسێ لە دەستی بمرێ

هەرکەس کە بەزەی خوا نەبینێ
نەپڕووکێ بە ئاگری ئەوینێ
نەکوڵابێ لەناو ئەوینی پاکا
پێی وایە کەس ئەو شتانە ناکا
پاکان کە بەزەی خوا دەبینن
وەک هۆزی فرشتە دوورە کین

## زینیش لە سوێی مەم دڵی دەتۆقێ

دڵ گــەســتــەی هەژدیـهــای ئەوینێ
کــوژراوی دوو چاوی مــەســتی زینێ
گــــیـــراوی گــــوناهی بێگوناهی
ســـــووتاوی گــــڕ و دومــــانی ئاهی
ئەو تـازە نـەمـــــــامـی وا لـەبەر دڵ
بەژنی بەنەکــــامی کـــەوتە بن گڵ
وەک گـەوهەری گـەنج بەخـاک سپـێـرا
مـــاریشی لە پێـــینی وەشـــێـــرا
ئەو کـێلی چەقـا لە بن سـەری مـەم
دەیگوت کـە سـەرم بڵند و گـەورەم
کـوا کـێلێ کـە شـان لە شـانی من دا
کێ نوســـتــووە وەک مـــەمی لە بندا
شـای کـۆمـەڵ و هۆزی سـەرفـیـرازان
مـــیــــوانمە دەبم بەجـــێی نیــازان
زین هـات و لە دەوری کــــێلی هـالا
لێی کـــــــردە نـسێ بـە بەژن و بـالا
خـــــوێن هـەڵدەوەری لە چاوی ئاڵی
دەتــوایــەوە دڵ لـــە نــاڵــەنــاڵــی
چاوی وەکـــو هـەوری خـــاکـــەلێـــوە
ڕێژنەی بەگـــوڕی دەڕشت لەجـێـــوە
فـرمـێـسکی لە گـۆڕی مـەم کـە باری
ڕەنگا بەمـــــــراری گـــــۆڕی یاری

چەندەی دەکشاند لە دڵ هەناسە
تێکرا ئەوی خزمە یا نەناسە
فریادی بڵند دەبوو بەگریان
کێ بوو دڵی بۆی نەبێ بەبریان
پێشمەرگە و ئەفسەر و وەزیران
دەروێش و لەپێش و لاو و پیران
دڵدار و جوان و نازەنینان
دارا و هەژار و دڵبرینان
وێکڕا وەکو زینێ دڵ بەخەم بوون
ڕۆرۆ دەگەیشتە چەرخی گەردوون
هاوار و گرین و داد و شینی
بردی گوڕ و هێز و تاو و تینی
ڕۆنیشت لە پەنای سەری مەمی ژار
دەیگوت بەسەد ئاخ و زاری ئەی یار
ئەی خێوی دڵ و لەش و گیانم
باخ بووم و بووبوویە باخەوانم
لەو ڕۆژەوە باخی خۆت نەدیوە
وشکە کزە زەردە پەلوەریوە
شلێرەی لێو و پستەی دەمم
بادامی دوو چاو و سێوی کوڵمەم
دوو مەمکی برەوشکێنی لیمۆ
بێ ناز و لە هەڵوەرینە بێ تۆ
لێت روون بێ کە نادرێتە دەس کەس
تۆی خاوەن و تۆ دەناسن و بەس
ئەم بەژنە لەسەر تۆ راوەشێنم
میوە و گوڵ و پەلکی داوەشێنم

شەوبۆن و وەنەوشە و هەلاڵان
بسک و خەت و خاڵ بدەم بە تاڵان
وەک گوڵ شەمەکی دڕوو لەبەرکەم
بۆ تۆ قوڕ و خۆڵ و گڵ وەسەرکەم
بسکان هەموو تابەتا بکێشم
وەک گیانی پەژار و پڕ لە ئێشم
ئەم باغی گوڵەم بەڕێکوپێکی
هەر پەلک و شکۆفە و چڵێکی
بۆ تۆ بوو کە بێی لێی بنۆڕی
تۆش جێگە دەگۆڕی جێ لە گۆڕی
من جوانی چ لێ دەکەم بەبێ تۆ
بۆ تۆ نەبێ با بچێ بە فیڕۆ
ترسم کە نەبا دڵت دەمێنێ
هەر پارچەیەکم دەخستە شوێنێ
جوانیم و منیش کە بووینە ماڵت
کاتێ کە دەمرم و دێمە پاڵت
لێمت دەوێ ڕەنگ و بۆی جوانیم
چاوی بەڵەک و بڕۆی کەوانیم
سەر کوڵمە بەسووری لێو بەئاڵی
سەر سینە بە نەرمی مەم بە کاڵی
بسکی ڕەش و بەژنی وەک نەمامم
ئەم مابێ دەبێ چ بێ وەرامم
چی لامە دەبێ بگا بە خێوی
نەیگاتێ کەمایەسی و پەشێوی
بۆ وەی کە لە دیدەتا نەبم سووک
رازاومەوە بۆت لە چەشنی نۆبووک

وەک پێشووە بەژنی شۆخ و شەنگم
سەرخۆشت دەکەم بە بۆن و رەنگم
ئامادەی ماچی تۆن دوو لێوم
تورت و شەقە مەمکی شەکرە سێوم
هەرچۆنی منت دەوێ تەیارم
بمگوێزەوە سازە کاروبارم
گۆڕیچەی تۆ دەکەینە پەردوو
ترسی نەکەیین بەیەک بەسەرچوو
هامێزی لە کێلی مەم وەرێنا
ئاخێکی دوای بەژینی هێنا
گیان هەڵفڕی چوو بەلای خواوە
لەش کەوتە زەوی و چرای کوژاوە
لەو کۆمەڵی پڕ پەرۆش و ئازار
نوێ بوو دووبارە داد و هاوار
توێژاڵکی برینی کۆنە لاچوون
دیسان لە قوڕی پەژارە راچوون
ژان چووەوە دڵان بەمەرگی زینێ
گیرایەوە کۆز و کۆڕی شینێ
وەک جۆ و پلووسک و چەم هەموو چەم
فرمێسکی وەراندە سەر گڵی مەم
شۆرایەوە گڵ بەتاوی باران
بارانەی چاوی خزم و یاران
قاپۆرە دوڕی کە داخرا بوو
ئەو گوڕیچە وا مەمی تیا بوو
سەرپۆشی سەری کە هەڵدراوە
بوخچەی گوڵ بۆنی خۆش کراوە

زینی شل و مل خرا تەنیشتی
پێک گەینەوە دوو مەلی بوهیشتی
پیرۆز بێ لە تۆ و لە دەزگیرانت
رابواردنی خۆشی ئەو جیهانت

لەو گۆڕەوە مەم وەرامی داوە
خۆش هات و جێگای لە بانی چاوە
ئەو رازە گرینگە هەرچی بیستی
زانی چییە نرخی خۆشەویستی
بۆ وانەیە ئافەرین کەوا چوون
دڵتەنگ دەژیان و دڵنیا چوون
خاکاوی نەبوون و چوونە ژێر خاک
دۆڕاندنی بۆ نییە دڵی پاک
ئەو یاری کە پاک و پاک رەوشتن
ژیانیان نەمرە و لە ناو بەهەشتن
لێو توونی و کام لە یەک نەدیوان
ئامادەیە لای خوا بەشی وان
ژیان خۆشە لەگەڵ ئەوین برابێ
گیان خۆشە بەهۆی ئەوین جیا بێ
هەرکەس بەجوانی چەشنی زینێ
دڵداری بوێ لەباتی ژینێ
یان وێنەیی مەم لە رێی ئەوینێ
خۆش و گەشەیەک لە ژین نەبینێ
سەر دانێ لە رێی نیازی پاکا
خوا یاری دەبێ و زیانێ ناکا
ئەی خوایە بەنازی نازەنینان
بەنیاز و نزای جگەر برینان

ئەی خـــوایە بە شـــیـــرنیی جـــوانی
بەو دڵتـــەڕی دوور لە کــــامـــــەرانی
خــــــوایــە بـەدڵێ ئـەوین دەچـێـــــژێ
بەو چـاوە فــــــریشکی ئـاڵ دەڕێژێ
ئەی خـــــوایە بەناڵە ناڵی بولبــــول
خـــوایە بەخـــوناوی ناوی ســـوورگـــوڵ
ئەی خـــوایە بەئاهی لەیلی بێ رەنگ
بەو شـــێـــتی هەژاری لەیلی دڵتـــەنگ
ئەی خـــــوایە بەئاهـی لێــــو بەباران
ئەی خـــــوایە بە پێکگەیینی یاران
ئەی خـــوایە لە ڕێی کـــوڵی دڵی مـــەم
بەو زینە کـە کـەوتە سـەر کـڵـی خـەم
بێ بەش لە ئەوین مـــەهێـــڵـــە خــانی
ئەو کـــاتە کـــە دەردەچێ گـــیـــانی
پێـــغـــەمـــبـــەری خـــۆش بوێ هـەتا سـەر
بۆ دوایی نەبێـــتـــە داری بێـــبـــەر
بێ کین و لە دۆســــــتی پـڕی کـــــە
گـــیـــان و دڵی فـــێـــرە باوەڕی کـــە
ســــــــــــەرزارەکی زۆر بـەچـاووراوە
خــــاوێن دەمـــــە کـــردەوەی گـــڵاوە
ئاکــــــاری لە کـــــاری چاک نـەبانە
ســـەرگـــەرمـــە بەکـــاری پێـــچـــەوانە
مـــەیهـێـڵـــەوە هێندە بۆ کـوڵ و خـەم
با بەر بەزەیـیـیت کـــەوێ وەکـــو مـــەم
هـەرچەندە نەچووەتە ریزی پاکــــــان
بیـــبـــەخـــشـــە وەکـو بەکـر بە چاکـان

# چقڵی مەم و زینان

زۆر سەیرە ئەوانە چۆن ژیابوون
دوای کەوتنە ژێر گڵیش وەهابوون
کێ فێری چ بوو لە کاتی ژینا
پیشەی ئەمە بوو لە ژێر زەمینا
لەو گۆڕە کە زین و مەم تیابوو
تۆمەز بە ئەوینێ ئاو درابوو
رسکابوو دوو نۆ نەمامی سەرکەش
راست و شل و شین و ناسک و گەش
تورت و شەق و پڕ گەڵا و بە سێبەر
یەک شەنگەبی و یەکیش سنۆبەر
ئالان بەیەکا ئەمانە چین چین
وەک دەستەملان دەبوون مەم و زین
گڵکۆی بەکری چنۆکی بەدکار
دارێکی رواند دڕوو و چقڵدار
تێکوڵ گڕ و پەل پەل و رەش و خوار
وەک کوتی بنی لە بەهرە بێپار
هاوپشتی پەلی بەرەو نەمامان
پێچای سەر و بن لە رەگ لە دامان
هەر تەنییەوە پێچی دا هەتا سەر
نێوانی تەنین و بوو بە لەمپەر
هێدی نەبوو تا لە یەکدیی کردن
چقڵی مەم و زین بە ژین و مردن

هەر خویە کە دەیگرێ بە شیری
ناچێتە دەرێ دەڵێن بە پیری

وا دیارە لە مردنیش دەمێنێ
بەد خۆی چووە خووی دەنک دەچێنێ

پێوازە سەگانەیەک بکەی شین
سەد ئاوی بدەی بە شیر و هەنگوین

پەروەردە ببێ لەناو گوڵاوێ
رای گوێزە لە سێبەر و هەتاوێ

هەر رۆژە لەلایەکی لەتی کە
قەڵشاوی پڕی گەزۆی سپی کە

شەکری لە پەلانی دابێژە
دۆشاوی لەسەر گەڵا بڕێژە

پێت وانەبێ بۆت ببێتە شووتی
بەهرەت ئەوە بۆ گەنیو لە لووتی

## پیاوچاکێ خەون بە بەکردەوە دەبینێ

ئاگـا لە جـیـهـانی پیـر یەکێ پیـر
گـێـڕایەوە بۆم شـتـێکی دڵگیـر
گـۆیا هـەبوو پیـرێ دوورە دنیـا
دەژیا لە چیـایەکـدا بەتەنیـا
سـەرگـەرمی هەوای خـواپەرسـتی
دای گـرتبـوو بیـری خـۆشـەویسـتی
خـواناسی بەدڵ نە سـەرزمـانی
دڵرۆونی ئەوینی راسـتـەقـانی
چەوسـابوو لە رێگەدا گـەلێ ساڵ
تا گـیـانی لەسـەر لەشی بووبوو زاڵ
تێکەڵ بەخـوا بووبوو بەجـارێ
بێ ئەو بەکـەسی نەمـابوو کـارێ
خـواخـوا بوو هەمـوو دڵۆپی خـوێنی
دەیزانی گـەلێک شـتی نهـێنی
هـەر لێـکی بنـایە پەلـکی چـاوان
دەیدی لـی سـەر بەژ و بن ئـاوان
جـارێک لە نێـوانی رۆژ و شـەودا
یان نیـوە شـیـار بوو یان لە خـەودا
باڵداری گـیـانی کـەوتە گـەشتێ
چوو گـەردشی کـرد لەناو بەهەشـتێ
کـۆشکێکی لە زێڕ و گـەوهـەری دی
زۆرتر لە هـەزار کـوڕ و پەریی دی

پارچەی هەمەڕەنگەیان لەبەر بوون
لەو کۆشکە کەنیز و کارکەر بوون
وا تاج بەسەرێکی شۆخ لە دەرگا
زۆر قۆز و تەیار لە ڕەنگ و بەرگا
وێستاوە بەهێمنی لە جێوە
ڕوو خۆشە گەشە و بزەی لە لێوە
ئەی پایە بڵند وتی ئەتۆ کێی
ئەو کۆشکە بەکێ دەگا کە تۆی لێی
بەکرم وتی مامی پیری زانا
بەخشیمی بەزەی خوای توانا
ئەو دەرچوو کە بووم دڵ و بەختڕەش
لای زین و مەمێ کراومە هاوبەش
ئەو کۆشکە دەبینی هەشت نهۆمە
هی وانە حەوت یەکێکی خۆمە
لێرەش ئەوە چاوەدێری وانم
پیشەم وەک پێشە دەرکەوانم
زۆر بەختەوەرم گەلێ بەنازم
دۆستیانم و پاسەوانی ڕازم
لام وایە کە لێرە ڕادەمێنی
لەو بارەوە دوودڵی دەچێنی
ژین تاڵکەری زین و دوژمنی مەم
چۆن ڕۆ نەبڕێت لەناو جەحەندەم
ئاگات لە جیهان هەیە نە لێرە
جێم ئێرەیە گوێ لە من بدێرە
هەرچەندە بەدڵ بەوان نەیار بووم
ماکەی گەڕ و بەدفەڕ و گەمار بووم

ئەمهێشت کە بەیەک بگەن بە خۆشی
هەر یەک لە دەسم زووخاوی نۆشی
خۆم کرده چوقڵ لە بەینی وانا
خۆشم لەسەر ئەم شتانە دانا
بڕوانی بەڵام بە چاوی دووربین
ئەم تاڵییە دای بەرێکی شیرین
کێ زۆر لە جیهان ژیانی خۆشە
زۆر وایە کە لێرە دڵپەرۆشە
کێ ڕەنجدەر و دڵبەدەرد و ئێشە
دوای کۆچی دوایی زۆر لە پێشە
بۆ ئێرە ئەوێ وەکی هەوێیە
وەک دوژمنی سەختی خوێنەخوێیە
تا تۆ لە یەکێکی چاوەپۆشی
بۆ وی دی بکۆشێ با بەکۆشی
لای وا نییە هیچ بەبیر و ژیرێ
دوو شووتی بەدەستێ هەڵدەگیرێ
من زین و مەمم لەسەر زەمینێ
تووش کرد بە پەژارە و گرینێ
کێشامنە بەرێ بە داخ و دەردان
دەستم لە جیهانی ئێوە بەردان
ئەو چەرمەسەرەم کە داوە پێیان
وا ئێستە دەبینی چۆنە جێیان
هۆی من بوو بەوان درا بەهەشتێک
دایانمێ ئەویش لە هەشتێ مشتێک
تاژدین وتی چۆن دەبێ کە تۆی کوشت
چی دێتەوە ڕێ کە خوێنی تۆی ڕشت

پێی گوت کە خوا لەویش دەبوورێ
بەخشینی کڕی بەقەڵتی شوورێ
بۆتان کە وەڕەز بووبوو لە دەستم
خستم هەچی دەبووە بەرهەڵستم
وەک مار ئەوی هاتە پێشێ گەستم
رزگار نەدەبوون لە بەند و بەستم
وەک دەردی گران لەگەڵ پەیا بووم
وەک کوندەبەبوو ژیاوم هەیاچووم
ئەو دەستی کە ئەو لە من وەشاندی
هەر دەردێ لە دڵ هەبوو پەڕاندی
ئاسوودە کران هەژار لە چەنگم
دەرچوون دڵی تەنگ لە چاوی تەنگم
گیرا بووە بۆ نزای هەژاران
نووسراوە ئەویش لە چاکەکاران
کار هەن بەڕواڵە نالەبارن
دەیکۆڵیەوە زۆری بەهرەدارن
خوا رازی گرینگی خۆی بەهاسان
ناداتە نیشانی خۆنەناسان
بڕوانە دەبەخشێ بەکر و تاژدین
دووی دوژمن و دۆست لەبەر مەم و زین
ئەم رازە گەلێ نهێن و کوورە
بیری من و تۆ لەوانە دوورە
هەرچۆنی ببێ نزیکی باشان
هەر باشییە دێتە رێت لە پاشان
گەر یاری بەدڵ لە رێت دەکۆشن
پێت شادن و کزبی بۆت پەرۆشن

گـــەر دوژمنـی ئەو لە كـــینە دوورن
لە گـــوناه و هـەڵەی نەزان دەبوورن
ناكـــەس نەچی هەر ببی تخـــوونی
گـــەر یار و نەیاری ســـەرنخـــوونی
مـــرداره لەشت كــە ســەگ پەرستی
گــەر دوژمنی راكــە قـاچی گــەستی

دڵداری گـــــــەلێ بلـند و بـەرزە
گــەر دوور بێ لە كـاری پیس و هەرزە
هـەركـــەس كــە دەبێ نزیك ئەوینێ
هـەر چۆن بێ بەزەی خـــــوا دەبینێ
بەخـــشــینی خـــوا بەدوور مـــەزانە
هـەر بەندە لەســـــەر برێك بەهـانە
نەخـــــوازە لەگــــەڵ هـەژاری دڵدار
هەر خۆی كەسی بێ كەسە و بزی كار
لەم شـــیـــوە بەســـەربری مـــەبووره
باش ورد بەوە تێ بگە چ جـــــووره
دوژمــن بـە ئـەوینێ بـەهــرەوەر بـن
دۆســتـان دەبێ چەندە بەختـــەوەر بن
تـاژدینێ دەبەخـــــشێ یاری یـاره
بەدكـــارییـــە بۆ بەكـــر بەكـــاره
دڵدارییـــەكی پاك بكە بە پیـــشـــە
هانات ببـــە بەر خـــوا هەمـــیـشـــە

## چی نووسیوە و بۆچی نووسی

ئەی گـوێگری ژیر و زیت و پیـتـۆڵ
پسـپـۆڕی وتەی بەنرخ و کـرمـۆڵ
خـانی لە مـەی ئەوینێ مـەسـتـە
بێـهـۆشـە وتارپەڕێنە پەسـتـە
سـوێراوێ بەشـیـرنی دەچێـژێ
سـەرخـۆش بووە هاتەران دەبێـژێ
نـازانێ کـە تـیـرە یان تـراوە
دێـوانـەی بـادە بـیـر بـڵاوە
هـەرچێکی کـە پێت دەڵێ هـەوایە
وەک دەنگی نەیەکـە دەنگی نـایە
بێ جێ نیـیـە خـۆشـە دەنگی بلوێر
گـەر شـۆڕێ بخـاتە سـینگی گـوێدێر
لەم نـامـەیەدا بـەچەشـنی منداڵ
چۆن تازە دەکـەونە سـەر گـڕ و گـاڵ
هەرچیکی دەسم کـەوت مـتـومـوور
بۆر و کـەوە زەرد و رەش سـپی و سـوور
هێندێکی چرووکـە، هێندێ چیـرۆک
هێندێ شـڕ و رووتە دەسـتـەیەک کـۆک
زاراوەی بۆتـێـیـان و گـۆران
وێژەی مـوکـری و لوڕان و سـۆران
کـۆم کـردەوە گش درشت و وردی
هۆنیـومـە بەبەند و باوی کـوردی

پووچیــــشی هەیە و پڕ و بەکـــاکڵ
بێ جـێـشی هەیە و شـتی لەبەر دڵ
بڕوامـــــە گــــەلێکی دڵ پەسندن
بــڕوانــە دەزانـــی زۆری پــەنــدن
ئـاواتـی دڵـم چ بـوو لـەمـــــــانـە
دەرخـــســـــتنی رازی دڵتــــەرانە
جـوانتـر لە هەمـوو شـتـێک ئەوینە
دڵداری بەهـەشـــــتـــــە بینە ژینە
گــیـانێ کــە ئەوینی بووەتە مـــایە
وەک ئاوێنەیـە و خــــوانومـــــایە
وەک رۆژە ئەوین بە تیـــــشکە روونە
خـــــــــاوێنـکـەرەوەی دڵ و دەروونـە
هـەر رێـڕەوێ رووی لەلای خـــــوا بێ
بـا بێ و بـە ئەویـنـێ شـــــــارەزا بێ
گـیـان و دڵی سـەخت و رەش لە ئاسن
ئـاوێـنــە دەبــن ئـەویــن بــنــاســن
تۆزێک لە ئەوین بەســـەر مــســا کــە
پاش تـۆزێ بـنـۆڕە زێـڕی پاکـــــــە
هـەر دڵ کــە ئەوین بکا بە پیـــشـــەی
دڵداری بـگا بـە پـنـج و ریشــــــــەی
گـــــەنجـــــینەی رازی بێ نیـــازە
کـــارســـــازی لەلایە کـــاری ســـازە
هیـچ کــەس نیـیــە بێ بەشی ئەوینێ
کــەمــتــر هـەیە زۆر بەکــەم نەبینێ
دوو تیـــرەیە چی لەســــەر زەمـــینە
یـەک چـاوی لـە ژیـنـە یـەک لـە دینـە

یەک چاو دەبڕێتە سەر کچۆڵان
بازاڕی نەدیوە چووەتە چۆڵان
ئەو گەوهەری دڵ دەدا بە ماچێ
پێی وایە بە هیچی دیکە ناچێ
خۆڕایی لە دەستی دەردەهێنن
کۆشکێکی بەپووشکە لێ دەستێنن
ئی دیش بەهەوا بەهەشتێ دەکڕێ
فیزێکی دەگاتێ دەستی دەبڕێ
خوا لای وی لە کوڵکە بووەتە چەرچی
دەیداتێ بەهەشت بە ریش و پرچی
جا هەرکە لەوانە یان لەمانە
بێ ڕێبەرە کوێرە ڕێنەزانە
لە ژیانی دەتەکنەوە و کە چووشن
بێ چارە بەجاری دەم لە پووشن

## وردەکارییەکی دەروێشانە

مەیگێڕ بدە پێم مەیەکی کۆنە
پێشم بڵێ ئەم جیهانە چۆنە
ئەم رایەڵ و پۆ و چنین و تەونە
پێت وا نەبێ هیچوپووچ و خەونە
ژینمان لەبەرا سەرێکی بەرگە
لەدوایە نەمانە گۆڕە مەرگە
هەر مانێ کە دێتە بەر نەمانە
ریشەی دڵی خۆش لەسەر خەمانە
ئەستێرە و مانگ و رۆژ لە بەرزی
دەسمایەی ژین و بوون لە عەرزی
هێندێکی گران و هێندێکی سووکە
هێندێکی درشتە هێندێ چووکە
دەزگایەکی جوانە رێکوپێکە
داخم کە نەمر نییە و سەرێکە
عاسمان بە رۆشنی و زەوی شین
وەک رێکی دەخەن کەرستە بۆ ژین
وەک مایەی ژینی خۆش ئەمانن
دیسانە ئەون کە هۆی نەمانن
ئاگر وەکوژێ هەوا هەوایە
گەر ئاو نەبێ تۆزی خۆڵ بەبایە
عاسمان کە گەڕۆکە ئاش دەگێڕێ
هەر لاش و سەری مرۆ دەهێڕێ

نێژراوی لە بن گڵا کە مردوون
تۆزاشی ئەوە کە وردی کردوون
هەر لاش و سەرن لەوێوە دەڕژێن
هەر کەوتنە بەربڵاو و پرژێن
ئەم جارە دەشێلدرێن هەویرن
لای ئاگرە گشتی یەکدیگیرن
تووش بوونە بەدەردی داتوڵیوی
هەر مانەوەیە بە بۆگەنیوی
فەرموویە خوا کە دەچنە ئاور
نەمر و نەژیە ژیانی گاور
ئەو گیانی کە پاک و پاک سروشتن
خاوێن بەهەوێن و چاک ڕەوشتن
جووت بەندە بەتایبەتی هەڵێنێ
ئەو دەنکە بەناو و داو دەچێنێ
دەڕژێت و بڵاو دەبێ لە بن گڵ
لێی دەردەکەون پەل و گوڵ و چڵ
بەر دەگرێ هەزار ئەوەندی پێشوو
گێرەی دەکەن و دەبێ بە تێشوو
بێژنگە ژیان جیهان وەکو کەو
تل پێ دەدرێ لە گێژی گێژەو
بەرداشی خلێنە و ددانان
لیکی دەم و چەقچەقی زمانان
بانیژمیە لێو و زارە ئاشە
هەر چەرخ و خولێک و ورد و خاشە
ڕزگار بوو کە لەم گەڕ و گەزەشدا
دابەش دەکرێ بەهێزی لەشدا

گا کێشەری ژووریٛ رای دەکێشێ
گا گێرمیٛ دەیکوشێت و دێشێ
جارێکی لە قووتدەرێکی بەندە
جاریٛ بەهەڵێنەری بڵندە
تەندووری ورگ ئەوی دەپێژیٛ
هەرچی خت و خاڵە لێی دەرێژیٛ
خاوێنی هەموو دەچیٛ بەرەو ژوور
پیسایی دەرێژنە جێیەکی دوور
کێهەی گەلیٛ باشە با جیا بن
هەر نابیٛ ئەویش لەگەڵ یەکا بن
دابەشکەری گەرم و ساردی ناو لەش
چی بۆ چی دەبیٛ لەوی دەدا بەش
رەنگرێژی لەشان بەمانە چەند جوور
هەندامیٛ وەرەنگ دەخا دەر و ژوور
دڵ شووشەیە جەرگە بووەتە پاڵوێن
روون بێتەوە خەستە بادەی خوێن
هیچ پووش و پەلاشی تیٛ نەچوویٛ
نابیٛ بەگەریٛ و گلوگلو بیٛ
هێشتا دەیەویٛ هەتا دەگاتیٛ
بتکێتەوە تاویٛ بو کەلیٛ کاتیٛ
جارێکی بلق بدا لە ئاوا
جاریٛ بەهەژێندریٛ لە ناوا
هێزی لەگیان دەبیٛ بسێنیٛ
تا گیان هەیە وا ئەویش دەمێنیٛ
بێدەنگە هەتا لە ماڵی لەشدا
ئاواتی نەهاتە جیٛ لەمەشدا

گەر بەو لەشەوە خرایە بن گڵ
دووبارە بەشینی دێتە سەر چڵ
بارانی بەزەی خوا ببارێ
ئەو سەوزە دەبێ بە شەنگە دارێ
پەلک و گوڵی لێ دەبن بەسەرپۆش
بەر دەگرێ بەمیوەی تەڕ و خۆش
ئەو میوە کە باش بگا لە پاشا
بۆ دیاری دەچێتەماڵی پاشا
گەر بیچنێ دەستی پاکی پاکێ
دووری خەنەوە لە تۆز و خاکێ
جێ بدرێ لە بارەگا دروستە
میوێکی بەناز و خۆشەویستە
ئەم جۆرە بەنرخن و نەیابن
کەم هەڵدەکەوێ شتێکی وابن
چی کاڵە لەبەر هەوا دەمێنێ
پێویستە کە گەرمی بیگەیێنێ
باشتر دەگەهن هەیا پترمان
چاودێری کرێن لە مێش و کرمان
پەروەردە کرێن بە تیشکی دینی
وێیان کەوێ تاوێ خۆ نەبینی
ئەوسا ئەوی زۆر پوخت گەیشتن
وا دادەورن ئەگەر درشتن
تا دانەکەون لە پۆپی بەرزی
تا دانەنەوێنە رێکی عەرزی
تا دانەتەکێن لە فیز و مینگە
رێیان نییە بچنە سەر گوشینگە

زۆر پان و فلچ دەبن لە ڕێدا
دەفلیقنەوە لە ژێری پێ دا
ڕێک لێکی دەدەن سەر و بەر و ناو
خوێناوی دڵان دەبێتە خۆشاو
ئەو میوە ئەگەر ڕەگێکی کاڵە
خۆشاوەکە تفتە ترشە تاڵە

نیشان دەدرێ بە پیری مەیخۆر
پێویستە کە خۆی بدا هەل و نۆر
ئەم جار دەکرێتە ناو بەرۆشێ
گەرمایی دەوێ هەتا دەجۆشێ
تیشکی بەزەیی خوای بگاتێ
تینی لە شکۆهی خۆی بداتێ
پوختایی بەسەر یەکا بتاوێ
ماک و ڕەگەزی لەناو دەراوێ
ئەو تینە گەلێک بەهێز و توند بێ
بوکلێندرێ هەڵمی لێ بڵند بێ
ئەو هەڵمە ببێ لە چڵکنی دوور
بێ تۆز و هەوا بچێ بەرەوژوور
لەو ژوورە پلێکە ناوی رووت بوون
دەتکێنێ لەوێ دڵۆپی دڵ روون
گەر ماک و ڕەگەز هەمووی تواوە
بەو بۆنە بەشی لە بوون بڕاوە
جێی دەشێ نەبوونی دڵگوشایە
نامێنێ لەوێش هەتا هەتایە
دیسانەوە جێی لە دەفری تەنگە

ئەمجارە لەوێ نەبۆ نەرمنگە
ئەو مەی کە بەڕەنگی سوور و ئاڵە
ڕەنگێکی دەداتە ناو پیاڵە
ئەو هێشتە نەگەیوەتە گەیشتن
ڕزگار نەبووە لە ترسی ڕشتن
تا بۆنی لە بوون و مانی مابێ
بۆ کۆڕی خوا نموودی نابێ
تا ڕەنگی هەیە نەبووەتە بادە
چەوسانی بەهیچە ڕەنج بەبادە
مانت گەرەکە بەری نەمانە
ماو ئەو کەسەیە لە خۆی نەبانە
تا ماوە لە بەندەدا وشەی من
بێ دۆستە لە خۆی دەبێ بە دوژمن
دڵدارێ دەگاتە بارەگای یار
دەرچووبێ لەوەندە قۆرتی دژوار
ئەم ڕێگەیە سەختە بۆ مە نابێ
ڕێبەر لە بەرێ مەگین خوا بێ
ئەی خوایە دەزانی ئێمە کوێرین
تۆ بەرزی و ئێمە چاو لە ژێرین
دەریای بەزەییت دەدا شەپۆلان
سەرگەرمی مەلەم لە کوێرە گۆلان
چاوساغی بەزەییەکەت بنێرە
تاریکەشەوم چرا بدێرە
تەم با برەوێ لەسەر دڵی ژار
بینام کەرەوە بە شەوقی دیدار

ناسینێ کە بۆ مە بووەتە یاسا
هەر دوودڵییە و گومان و لاسا
دڵمان بخەدەر لە بەدگومانی
شانمان دە ئەوینی راستەقانی
باوەڕ هەیە لام و تۆش دەناسم
لەو پێوە کەساس و گێژ و کاسم
زۆر دڵ بەنیازی بارەگاتم
چ بکەم نەبەخۆمە دەسەڵاتم
گرتووتم و خۆت کلیل بەدەستی
رێگەم بدە بێمە تۆ پەرستی
ئەم ژین و نەمانە لەم جیهانە
هەرچەندی کە ئاشکرا و نیهانە

تاپۆیە لە تۆ بەتان و پۆیە
تاریکی و رۆشنی لە تۆیە
چاوت نە لە کاری چاکە یان چەوت
بەخشین بە بەهانەیە و بەرێکەوت
زۆر نوێژکەری پاکی رێی خوا گر
روبینییەکی کرد و کەوتە ئاگر
زۆری بەگوناه لە کاتی مەرگا
دەیبەخشی و رێی دەدەی لە دەرگا
گەر بەختەوەرە و گەر رەنجەڕۆیە
سەرڕشتە هەمووی بەدەستی تۆیە
هەر رۆژی بەرێ هەڵت بژاردن
چی بۆچی دەبوو بەوت سپاردن

پاڵپێوەنەریشی لەمپەریشی

گومڕاکەرە و رێنیشاندەریشی

سەرپشکییەکەت کە داوە پێمان

ئەو نەوسی چنۆک رفاندی لێمان

ماوین و بەزەی خوا ببێ یار

هەر هێندەیە چارە بۆ گوناهکار

بڕوای بەخوا ببێ و بەسی بێ

هەرچەندە فرەش کەمایەسی بێ

با بیشیپەرستێ لێی بترسێ

رێوشوێنی لە پیاوی ژیر بپرسێ

ئەو رێی کە دەوێژنە ئێمە بگرین

خۆمان نەگرین هەیا کە دەمرین

چاومان لە بەزەی خوا بدوورین

ئەومان بێ لە ئاگری بەدوورین

## سکاڵایەک لەگەڵ بنووسەکەیدا

ئەی سواری لە راستی پیادە
دڵداری پەڕی دەلووس و سادە
خوبێژی هەژار و سەر دبەر خۆ
جادووگەر و گەپدەر و بەداهۆ
هۆزانی بەگفتی سەر زمانی
شێواوی لە شێوی رێنەزانی
تاشیوسەری رووڕەشی زمان شڕ
والا دڵ و دەمپڕی جڕ و وڕ
وەک تۆ چەنەوەر بێ هەر بنووسێ
زاری شل و کول دەبێ و دەخووسێ
بەس نامە بەناوی بسک و خاڵان
رووڕەش بکە بەردە وان خەیاڵان
نووسینی فرەی مناڵ چ دێنێ
خۆی دەیدڕێ وازی لێ دەهێنێ
جوانن خەتی ورد و ناسک و کەم
نەک بگرێ بەری هەیف مژ و تەم
خەت کاتێ کە زبر و زۆر و بۆرە
شۆراوە خەتی جوانی شۆرە
خەت جوانە تەنک لە لێوی لاوان
نەک بەرگنی پەستەک و کولاوان
دڵخۆش کەرە گەندەموو لە رووی یار
نەک ریشی وەک گوریس و هەوسار

ئی وا هەیە دڵ دەخاتە گەشکە
هەن دەیکەنە کوێنە کۆن و ڕەشکە
دەم تیژ و پەل و زمان درێژی
یەکجار چەنەباز و چەڵتەبێژی
چێشتێ کە هەمیشە بێتە ڕیزێ
خۆشیش بێ مرۆڤی لێ دەبێزێ
گەوهەر چییە بێ نرخ کە نابن
زۆر نابن و زۆر کەم و نەیابن
تۆ کێ کری نووکی تۆ ببینێ
توو کێ هەیە بۆت نەئافەرینێ
بەد ڕەوت و بەکەوت و چەوت و لاری
بەدکاری نەیاری نالەباری
شێت و سەرەڕۆ و هەڵە و گلۆکی
شەرمت نییە بێ فەدی و چنۆکی
هێندەی سەری تۆم پەڕاند و تاشی
هەر تووشی گوناهـ دەبم لە پاشی
با بەس بێ گزە و جنێو فرۆشی
ڕەنگێ بدە با هەلان بپۆشی
دەس بەردە لە کاری هیچ و پووچت
بەس بارکە لە من گوناهـ و سووچت
لەم چەپگەرییەت ببە پەشیمان
بەشکو برەوێ بەخت ڕەشیمان
لە پرێکی بنووسی وا زبردەست
بۆ کێشە لەگەڵ مە کەمبەری بەست
کێشای لە زمانی شیری دوودەم
ڕۆستەم بووە سواری ڕەخشی پەنجەم

گـــەی قـــامکی تۆسنم ملـی دا
شـل بوو لـەســـڵـی و تلـی تلـی دا
وەک هـەژدەریّ هـاتـە ســـەر وەرامم
خـــانـی بـەســـە دڵ لە تـۆ بـەزامم
خـۆت گـێل و نـەزان و گـوێنـەبیـسی
تۆ هـەرچی گـــوتـت ئـەوم نـویسـی
بیـــری تۆ کـــە ڕنـد و بـەهـرەدارە
گـــفـــتـی تۆ کـــە چەوت و نالـەبارە
نەمخستە سـەری شتێک لەمـەڕ خۆم
من بـەسـتـەزمـان لەبـەردەسـتی تۆم
قـامـیـشـی کـلـۆڵ لە قـامـیـشـاوا
دەژیام شـل و مـل لە شــینـک و ئـاوا
گوێداری مـەلی چەلـەنگ و خـۆشـدەنگ
دڵداری گـــەلیّ چڵـی شـل و شـــەنگ
لەو جـــێـگەی بـەزۆر دەرت پـەڕاندم
بـەرگ و شـــمـــەکت لـەبـەر دڕاندم
لەوســـاوە بڕام لـە ژین و مـــانم
ئاوارە کـــرام لە نیــشــتــمـــانم
تیــــخی تۆ ســـەر و بنی بـڕیوم
تـالاو و رەشـــاو کــــرا بـژێوم
پێـــچـــاتە ســـەرم هـەوای ئـەوینیّ
ســـووتام وەکـــو مـــەم بـەدەردی زینیّ
چارەم رەشـــە دڵ بـەژان و تـاســـەم
برش و رەشـی دووکـــەڵی هـەناســـەم
گـــەوبـەند و قـــەفم بـەتینی ئاخـــان
کون کـون بوو هـەمـوو لە دەرد و داخـان

حەوت کون لە لەشم کرا سەر و ژێر
دەرچووم لە بنووس و بوومە بلوێر
تۆ هاتی دەمێ بەدەم دەماندت
چی بەندی دڵم هەبوو پساندت
گیرا بەمە کۆڕی بەزم و ئاهەنگ
ڕێکخستن و فوو لە تۆ لە من دەنگ
گا دەمکەیە سازی پاتشاهان
گا ڕەشکەری ڕووپەڕی گوناهان
چیتم یەکی دیلی بەردەستی تۆم
لاڵ و کپ و دەنگ بڵاوکەری تۆم
نووسەر نەبی کەی دەمم گەڕاوە
نەیژەن نەبێ دەمبەگم دڕاوە
بلوێر و بنووس نە سەربەخۆنە
هەر کارێ لە چارەنووسی کۆنە
سووچی چییە تیر برینی بێشێ
دەستێک هەیە ژێ و کەوان دەکێشێ
ئەی خوایە ئەتۆ دەزانی خانی
تیرێکە لە تۆ کشا کەوانی
گەر دڵڕەشە یان زمانی لووسە
چیرۆکی وەکو نەی و بنووسە
دەست و دڵی نەک بەدەستی خۆیە
هی تۆیە کە ڕاستە یان درۆیە
کاتێکی کە دات دەدا زمانی
لێت فێر نەبوایە چیی دەزانی
تۆی بەم هەڵەکارییەت سپاردم
سووچم چییە خۆزگە نەتدەناردم

سەرپشکییەکم هەیە بەلای خۆ
گیرە سەرەتای ئەویش لەلای تۆ
هێندەی چ بنووس بووە و چ بلوێر
گیراوە لە پەنجە تا سەرە و ژێر
بێ سەر دەگەڕا سەر و زمانی
ڕێی سوود و زیانی خۆی نەزانی

بلوێر بوو چلۆنی لێت بدایە
ئاوازی دەداوە لەم هەوایە
هەرچەندە پەڕی سپیم سیایە
هەویای بەتەنێم ئەتۆی خوایە
ڕووبەڕ گەلێ ڕووڕەشن لە چەنگم
ژێرباری گرانی شەرم و نەنگم
بەدخووم و لە ڕاستەخۆم چکووسم
سی ساڵە گوناهی خۆم دەنووسم
گەر هاتنە سەر زەوی مە ڕێک بوو
مێژوو لە هەزار و شێست و یێک بوو
ئێستا بە تەمەن چل و چوارم
پێشەنگی بەرەی گوناهکارم
مەست بووم و نەزانی پیلی بەستم
بۆ چاکە هەژاری با بەدەستم
وەک دات لە ئەوین بەرێ توانام
لەبرانەوەشا بگەی بە هانام

**مەم و زینی خانی لێرەدا دوایی هات**

## هەزار ئامۆژگاری بۆ

## شێرکۆی کوڕی خۆی دەکات

شێرکۆ کوڕی خۆشەویست و ژیرم
زاخاوی مێژیم و هۆش و بیرم
پنج و رەگەزی دڵ و گیانم
خونچەی شەقی باخەکەی ژیانم
هێشتا بە تەمەن مناڵ و کاڵی
وەک دەربەدەریم دوازدە ساڵی
هەرچەندە کوڕی منی هەژاری
دوا رۆژی هەژارە نادیاری
لێم روون نییە پاشی چت بەسەر دێ
هیوام گەلێ پێتە ببیە مەردێ
مەردێکی بەکار و چاپک و زیت
بیرێ بکەی و بزانی تۆ چیت
دەردی گەلەکەت بزانی چۆنە
بۆت دەرکەوێ چەند برینی کۆنە
خانی لە هەزار و سەد ژیاوە
ئەو کاتە لە ئێمە چۆن دواوە
حەفتا و حەوت لە سێسەتیش چوون
پیستر لەوە کوردی ئێمە مردوون
ئەودەم کە هەیانبوو میرێ بۆ خۆ
ئەمڕۆکە پساوە رایەڵ و پۆ

بووین ئەو دەمە پشکی تورک و تاران
زۆر ئێستە خراترین لە جاران
نەوتت کە ژیانی ئەورووپایە
بۆ تۆ نییە تێری شەوچرایە
بێگانە لە نیشتمانی ئێمە
تێر و قەڵەون بە نانی ئێمە
خۆمان هەموو کوێر و کوتر و برسی
ژین کورت و ئەویش لەگەڵ مەترسی
نابێ بەزمانی خۆ بخوێنین
ناشێ کە هەناسەیەک هەڵێنین
کوژران بەهەزار هەزار لە لاوان
ئازادیخوازی بووبووە تاوان
ئێستەش لەسەر ئەم ژیانە تاڵەش
پاش رژتنی هێندە خوێنە ئاڵەش
کورد هەر لە خەوی نەزانیدایە
هەر پێکەوەیان گەڕ و هەرایە
بێگانە پەرستە خۆ نەویستە
بۆ هاوڕەگەزی کەڕ و نەبیستە
بۆ یەکتری دوژمن و نەیارن
بۆ نۆکەری تا بڵێی لەبارن
ئەو چاخە کە خانی پێی ژیاوە
فەرموویە هەرا لەسەر دراوە
ویستێکە هەزار ئەوەند چرووکن
بۆ پوولێ لەتای تەرازوو سووکن
خۆ هەرچی دەخوێنێ پیت و نیوێک
ئەو دەچێتە کەلێک و گەل لە شیوێک

لای شــەرمــە کــە هەر بەکــوردی بدوێ
بۆ چارەڕەشــی مـــە بۆگـــەنە خـــوێ
خــۆی ناودەنێ مـل بەزەنگـی پێـشــڕەو
دەتداتـە دەسـی دزت وەکـــــو کــــەو

زۆرزانـە لـە کـــاروبـاری هـەرکــــەس
ئاگــای لە ژیانی خــۆی نیـیــە و بەس
رەنگن هەمـوو کەسک و سـوور و شـین
کـــــوردایـەتـی زۆر بـەکـــــەم دەبـین
کێ هـۆنـەری کـــــوردە یـان هـونـەروەر
کــەم بایـیــتــرە لـە توور و گــێـــزەر
وا بیـــر مـــەکــەوە ئەمـــەم درۆیـە
بـۆ راســـــــتـی نمـوونـە بـابـی تـۆیـە
کــاتم ئەوە گــەییـیــە سـی و نۆ ســاڵ
هـەر ســـاڵە لە پار پتـــر ژیان تاڵ
دڵـخــــــــۆشـی لـە رووپـەڕی ژیـانم
هـەر هـێـنـدە نـاوەکــــــەی دەزانم
ئاوارە لە نیــشــتــمــانی خـــۆمم
ئـاواتـەخـــــــواز بـە ژیـنـی دۆمم
والادەس و دڵـپـــــــــڕ و پـەژارم
ســـــــەربـاری هـەژاری دەردەدارم
هەر مــانگە لە دێیـەک و لە جـێـیـەک
هەر رۆژە مــیــوانی خـانەخـوێیـەک
دەرکێ نیــیـــە دادی بۆ بنێـــرم
هەردێ نیــیــە خــۆمی لێ وەشـێـرم

کـوردایەتیـیــە گــوناھ و ســووچم
وەک مـــۆمێ دەســاچم و دەســووچم
ھەرچەندە کـە نیـمـە ھیچ دەرووی روون
ھـەر دژ دەگـەڕێ گـەڕانـی گـەردوون
دەســــتم لە ھومـــێــدێ بەرنەداوە
چـاوم لـە پـســــــانـی بـەنـد و داوە
پـــێــم وایـــە دوا بــە رۆژی رەش دێ
زۆر نـاچێ کــە باو و رۆژی مـــەش دێ
جـــا با پتــــریش بەدەرد و کــــوڵ بم
با رووت و کـــــڵـــــۆڵ و داخ لە دڵ بم
ســـەد ھێندە پەژارە لێم وەکـــۆبێ
کـورد ھەر دەبێ رۆژێ ســەربەخــۆ بێ
با من بە ھـەژاری بچـــمــــە بن گڵ
کـورد رۆژێ دەبن بە گـوڵ لەســەر چڵ
ھــەر ھـێـنـدە تـکـام لـە تـۆیـە رۆڵـەم
مـــەڕوانە کــە ئەم شــڕ و شـــڕۆڵەم
زۆرتر لـە منیش کـــــز و ھـەژار بی
بـێ یار و نـزار و لـێــــو بـەبـار بی
دەربەس مـــەبە بۆ گـــەلت بکۆشـــە
ژەھراوی لەســـەر بنۆشـــە خــۆشـــە
باوکی تۆ چلۆن بوو شـــوێنی بگرە
حـــیــزانە مــــەژی بە مــــەردی بمرە

## پێرست


مەم و زینی خانی چییە؟ ........ 5
پەسنێ خودێ ........ 25
گازی و لاڤایی ........ 28
پەسنێ پێغەمبەر ........ 33
خواستنامەهدەر ژ پێغەمبەر ........ 39
کول و دەردێ مە کوردا ........ 42
چما ب کوردی نڤیسییە؟ ........ 46
مەی ژ مەیگەر خوەستن ........ 50
مـیـرێ بۆهتـان و خـویشکێت وی ........ 56
رندی و ئەڤین ........ 62
تاجدین و مەم ........ 64
سەرساڵ ........ 67
سەیر و گەشت لە دەشتێ ........ 69
جلکێد کەچکان ل لاوان ........ 71
دوو کورێ ئەنیاس ........ 72
ژانا برینێ ئەڤینێ ........ 78
نیچیر بوونا نیچیرڤانا ........ 82
حەیرینا داین ........ 86
رەمل و مەندەل ........ 89
بژیشکا دەرموین ........ 91
ئەڤیندار کفشن ........ 95
چاڤ نەهێری! ........ 98
خوازگینی ........ 101
شاهی و گۆڤەند ........ 108
ڤالا شەمال ........ 115
بویک و زاڤا ........ 118
بەکر عەوان ........ 122
زین و مەم و خەم ........ 129
زین ژ خەمێرا دبێژە ........ 134
ب خوەها خوەرا ........ 135
ل فندێ ب گازنە ........ 136
گلی ل منمنۆکێ ........ 137

مەم و ژانا ئەڤینێ ........ 139
پەیڤینا مەم دگەل چەم ........ 141
لاڤایی مەم ل بەر بایی ........ 143
گلی و گازن ژ دلێ کول ........ 146
دەما بوهارێ و گاڤا شکارێ ........ 151
باغ و بەخچا میر ........ 154
گول ب گولارا داختیوە ........ 156
ژوان ........ 160
میر و مەزن سەردا دچن ........ 165
برای تەنگانە ........ 169
ئەڤین نایەتە ڤەشارن ........ 172
میر و مەم دلەیزن ........ 175
مەم د کەلهێدا ........ 181
داغا ئەڤینێ ل زینێ ........ 186
تاجدین دغەیدە ........ 190
مەیدانێ مەردان ........ 193
شوفار بخوە دحەسە ........ 195
شیرەتا بێ بەختی یێ ........ 198
زین ل هەمبەرێ میر ........ 201
وەصیەتا زینێ ........ 208
بویکا زیندانێ ........ 214
شین بۆ مەمێ ........ 222
دلۆڤانییا زینێ ........ 226
زین ل سەر گۆرێ مەم ........ 228
چقلێ مەم و زینان ........ 234
بەکر و رەحما خودێ ........ 236
ئەڤین گەنجینەیە ........ 241
رێکی خودێ ناس کرنێ ........ 244
بناشتێ خانی ب قەلەمێ خوەرا ........ 253
مەم و زین بە موکریانی - سۆرانی ........ 259
سەرەتا ........ 261
بەرکولێک لەلایەن وەرگێڕەوە ........ 273
دیباچە ........ 283
پەسەندی خوا و پاڕانەوە ........ 286

چۆنیەتی و گەورەیی پێغەمبەر ........ 291
پێغەمبەر دەکاتە تکاکار ........ 297
بەدبەختی کوردان دەڵێ و بە مەردایەتییان هەڵدەڵێ ........ 300
هۆی ئەم نووسینە و داد لە دەست گەردوونی چەپگەڕ ........ 304
پێشدەستەیەک بۆ چیرۆک ........ 308
پەسندی میری بۆتان و جووتە خوشکە جوانەکەی ........ 314
دیسان رانانی جوانی ئەو دوو چاوبازانەیە ........ 319
ئازایەتی تاژدین و برایانی و دۆستایەتی مەم و تاژدین ........ 321
جێژنی نەورۆز ........ 324
سەیرانی جێژن و دەزگیران گرتن ........ 327
خۆ گۆڕینی تاژدین و مەم لە بەرگی کیژاندا ........ 329
گرفتار بوونی مەم و زین و ستی و تاژدین بە داوی ئەوین ........ 330
تاژدین و مەم بە دەردی خۆیان دەزانن ........ 336
زین و ئەستی بە چ دەردێ چووبوون؟ ........ 340
تایەن لەم وتانە سەرگەردانە ........ 344
تایەن دەچێتە کن نوشتەنووس ........ 347
درکاندنی رازی دڵ لەلای تایەن ........ 353
گەڕانەوەی پیرێژن بۆ لای چاومەستان ........ 356
خوازبێنی ئەستی بۆ تاژدین ........ 359
رازاندنەوەی کچان و گواستنەوەی ستی ........ 366
زاوا دەچێتە پەردە بۆ لای بووک ........ 373
پێک گەیشتنی زاوا و بووک ........ 376
تێ چاندنی بەکر مەرگەوەڕی شۆفار و دوو زمان ........ 380
گریان و شیوەنی زینێ لەتاو و توێی ئەوینێ ........ 387
زین لەگەڵ پەژارەدا داخێوێ ........ 391
سکاڵای دوور بەدوور لەگەڵ خوشکیا ........ 392
زین بوخچەی دڵی لای مۆمی داگیرساو دەکاتەوە ........ 393
زین رووی گفتوگۆی دەکاتە پەروانە ........ 395
سووتانی مەم لە دەردی دووری زینێ ........ 397
پەیوینی مەم لەگەڵ چەمی دەجلەدا ........ 399
رووی وتاری دەکاتە شنەبا ........ 401
سەرکۆنەی دڵی خۆی دەکات ........ 404
دەرچوونی میری بۆتان بۆ راو و نچیرێ ........ 408
پەسنی باغی میری بۆتان دەدا ........ 411

ژوانی زین و مەم لە باغی میردا ..... 412
مەمیش بەرەو باغ دەڕوا ..... 415
میر و راوکەر بەسەریاندا دێن ..... 420
براکی چاک بۆ ڕۆژی تەنگانە بەکارە ..... 424
رازی دڵداری زین و مەم بەگوێی میر دەگا ..... 427
میر و مەم شەترەنج دەلەیزن ..... 430
مەم لە گرتووخانەدا بۆتە چلەکێش ..... 436
زین گلەیی لە گەردوون و چارەڕەشی خۆی دەکا ..... 441
تاژدین و برایانی لە بیری چارەدان ..... 445
راسپاردەیەک رادەسپێرنە لای میر ..... 448
میر لەبەریان دادەنوێنێ ..... 450
بەکری شۆفار داوی مەرگ بۆ مەم دەنێتەوە ..... 453
میر بەو بیرەوە دەچتە لای زین ..... 456
زین داوا راسپێری خۆی بە کاکی دەڵێ ..... 463
زین سەری کوشتەی خۆی دەدا ..... 469
شین بۆ مەمی هەژار و کوژرانی بەکری بەدکار ..... 477
زین دڵی بە بەکر دەسووتێ و بۆی دەپاڕێتەوە ..... 481
زینیش لە سوێی مەم دڵی دەتۆقێ ..... 484
چقڵی مەم و زینان ..... 490
پیاوچاکێ خەون بە بەکرەوە دەبینێ ..... 492
چی نووسیوە و بۆچی نووسی ..... 497
وردەکارییەکی دەروێشانە ..... 500
سکاڵایەک لەگەڵ بنووسەکەیدا ..... 508
هەژار ئامۆژگاری بۆ شێرکۆی کوڕی خۆی دەکات ..... 513